# کاروان

گۆڤاریکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر
**محمد أمين محمد احمد**

جیگری سەرنووسەر
حسین ڕەشوانی

**ژمارە (٦٥)**
**حوزەیرانی ١٩٨٨**

ئەدرەس
**هەولێر : ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان گۆڤاری «کاروان» ت : ٠٨٨٢.**

**نرخی (٢٥٠) فلسە**

## لەم ژمارەیەدا



**لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە ٤٨٣،ی ساڵی ١٩٨٢،ی دراوەتێ**
**لە چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) چاپکراوە**

# مـەلا حەوێــزەفـەندی قۆچاغـا

حاجی محی الدین أسعد

شاری کۆیە لە سەردەمێکی کۆنەوە شاری ئەدەبو زانستو هونەری کوردی بووەو .بەدەیان زاناو شاعیرو هونەرمەندی ناوداری پێگەیاندووەو ناوبانگیان لە هەموو لایێکی کوردستان دا بلاّوبۆتەوە . یەکێك لەو ناودارانە مامۆستا مەلا حەویزەفەندی صالّحی قۆچاغای مەلای شاعیر بووە . کە لە سالّی ١٨٧٥ دا لە کۆیە لەدایكبووەو سەرەتای خوێندنی ئایینی لە سوختەخانەو حووجرەی مزگەوتەکانی ئەو شارە دەست پێ کردووەو بە فەقێیەتی لەلای حاجی مەلا عەبدوللاّی جەلی زادە (١٨٣٤ – ١٩٠٨)خوێندوویەتیو لە داویدا چووە بۆ شاری هەولیر ، و لەلای مەلافەندی (١٨٥٩ – ١٩٤٢) خوێندوویەتیو بروانامەی مەلایەتی لێوەرگرتووەو گەراوەتەوە کۆیەو لەدوای نەمانی حوکمی عوسمانلیو هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەی کۆیە . لەبەر زیرەکیو زانایی لەگەلّ دەستەیەکی تر لە زانایانی ئەو شارە لە سالّی ١٩٢١دا کراوە بە مامۆستای یەکەمین قوتابخانەی میری لە کۆیەو لەو سالّەوە دەستەی مامۆستایانی قوتابخانەکە لەم زاتانەی خوارەوە پێك هاتووە :

١ – مامۆستا عەبدورەحمان شەرەف (١٨٩٠ – ١٩٥٣) بەرێوەبەری قوتابخانە بووە .

٢ – مەلا حەوێزەفەندی قوچاغا (١٨٧٥ – ١٩٣٩) مامۆستای جوگرافیاو مێژووو زانستی (الکلام) بووە .

٣ – شێخ نورەدینی حاجی مەلا عەبدوللاّی جەلیزادە (١٨٨٢ – ١٩٥٢) مامۆستای زمانی عارەبی .

٤ – مامۆستا صالّح قەفتان وانەی مێژووی گوتۆتەوە .

٥ – مامۆستا عەلی ئاگا وانەی ئینگلیزیو وەرزشی گوتۆتەوە .

٦ – مامۆستا عومەر ئەمین وانەی زانیاری گوتۆتەوە .

٧ – مامۆستایان گریگۆر وانەی بیرکاریو رەمزی رەحیمی ناودار بە مەمەندکەرکوکی وانەی خۆشنووسیو عەزیز ئەفەندی وانەی کیمیایان گوتۆتەوە .

٨ – مامۆستا (عەلی کەمال) یش کە بەرێوەبەری پۆلیس بووە، لەدوای جێبەجێکردنی کاروباری پۆلیسخانە چووە وانەی (ئەندازە)ی لەو قوتابخانەیەدا گوتۆتەوە .

لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە مەلا حەوێزەفەندی زانایێکی تێگەیشتووی سەردەمی خۆی بووەو لەریزی ئەو زانایانەی هاوەلّی دەست نیشان کراوە تاکو بکرێت بەمامۆستایێکی بەتواناو لە ماوەی مامۆستاییدا بە دەیان قوتابی زیرەكو بەتوانا پێبگەیێنێو بیانکات بە مامۆستای رابەرو رۆشنبیری ناودار لە دوارۆژدا .

لەو قوتابیانە کە هەردەم شانازییان بە زاناییو چاکەی ئەو ماموستایە دەکردودەیانگوت ئێمە پەروەردەی زانیاریی مامۆستا مەلا حەویزەفەندین ، مامۆستاو رۆشنبیری ناوداری وەکو (صابیر ئیسماعیل) (١٩١٠ – ١٩٧٢) و (طاهیر صادق)(١٩١١ – ١٩٨٤) و زەکی ئەحمەد هەناری (١٩١٠ – ١٩٦٧) . هەروەها مامۆستایانی وەکو عەبدولمەجید نورەدینی جەلی زادە (کۆیە : ١٩١٢) و (عومەر جەلال) حەوێزی (کۆیە : ١٩١٢) و مەلا فەتاحی مەلاعیزەت (کۆیە : ١٩١٠) کە لە ژیاندا ماونو خودا تەمەنیان درێژتر بکات و بە دەیان رۆشنبیری دیکەی ئەو شارە پەروەردەی زانیاریی ئەم مامۆستایە زانا و شاعیرە بوون .

مەلا حەوێزەفەندی پاش چەند سالّێك مامۆستایەتی لە شاری کۆیە گواستراوەتەوە بۆ قوتابخانەی رانیەو تا سالّی ١٩٣٩ لەو شارە خزمەتی مندالاّنی کوردی کردووە ، تاکو لە ئەنجامدا بەهۆی نەخۆشییەکی کوشندەوە لە رۆژی ٢٩ / ١٢ / ١٩٣٩ دا لە رانیە کۆچی دوایی دەکاتو تەرمەکەی دەهێنرێتەوە کۆیەو لە گۆرستانی غەریبان بە خاکی کوردستان دەسپێردرێ . هەزار سلاّو لە گیانی پاکی مەلا حەویزەفەندی مامۆستا و شاعیری کورد بێ .

**مەلا حەویزەفەندیقۆچاغا (مەحزون) و شیعر :**

مەلا حەوێزەفەندی هەروەکو زاناو مامۆستایێکی بەتوانابووە . لە

هەمن کاتیش‌دا شاعیرێکی باش بووەو شیعری بە زمانی کوردیو عەرەبیو تورکیو فارسی داناوە، چونکە بە چاکی ئەو چوار زمانەی زانیوە. نازناوی شیعریی (مەحزوون) بووە. لە نووسینی کوردی‌دا پەیرەوی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی شێوەی کرمانجی خوارووی کردووە. لە هۆنراوەیەکی‌دا دەڵێ : –

**دولبەرا ئیمرۆ نەسیمِ بۆیی بەهاری پێوەیە**
**دڵ شکوفەی کردووە غونچەی خەزانی پێوەیە**

**ساقی‌یو موتریب عەزیزم وا لە نێو باغی گوڵان**
**بەم گوڵستانە دەڵێن بۆی زوڵفی یاری پێوەیە**

**ماچی خاڵی خۆشترە یا شەکرە سێوی کوڵمەکەی**
**ئارەقەی بەرگەردنی ئاوی حەیاتی پێوە یە!!**

شاعیر هەرچەندە لەم هۆنراوەیەی‌دا بە تەواوی پەیرەوی هونەری سەروای شیعری نەکردووە، بەڵام لە هۆنراوەکانی دیکەی‌دا، بە تەواوی دەستو بازووی هونەری شیعری بەهێزدەبێ‌و شیعری بەهێزترمان پێشکەش‌دەکاتو دەڵێ : –

**ئەو پەرچەمە فەتتانە کە پڕ هەڵقەوو چینە**
**پابەندی دڵو دانشە، غارەتگەری دینە!**
**ساتێکی نەبوو ناڵەنەیێتن لە دەروونم**
**ئەم کوڵبەیە کاول‌بێ چ جێ‌یێکی بەشینە**
**مردن لە غەمو عیشقی تۆ زۆر خۆشە لەبۆ من**
**پابەندی جەفاو، جەوری مەکە زۆر بە برینە!**

کاتێ مەلا حەوێزەفەندی (مەحزوون)دەکەوێتە رانیە، رانیەی ئەوسای پڕ لە کێچو تەپۆی لەرزو تا، شاعیر زۆر بەجوانی وەسفی باری دەروونی خۆی بە هۆنراوەیەك دەردەبڕێ‌و دەڵێ : –

**ئەی دڵە تاکەی بناڵم من لە دونیای فانی‌یە**
**ئاخیری عومرم بە پیریی کەوتمە داوی رانیە**

**رانیەم لێ‌بوو بە مەسکەن، دەشتی بیتوێنم وەتەن**
**نەم دەزانی چەرخی گەردوون عەهدو پەیمانی نی‌یە**

**هەر لە مایس تاوەکو تشرینی ئانی بیستو نۆ**
**رۆژ لە نێو کوورەی جەهەننەم شەو لەبەر کێچو تەپۆ**

شاعیر لە رانیەوە نامەیەکی شیعریی بۆ خوا لێ‌خۆش‌بوو مەلای گەورە (۱۸۷٦ – ۱۹٤۳)ی کوری مامۆستای بەرێزی نووسیوە ژمارەی دێرە شیعرەکانی ۲۲ دێرەو بەم جۆرە دەست‌پێ‌دەکات :

**ئوستادی فاضل عەللامەی زەمان**
**عالِمی نیحریر فەخری کوردستان**

**قیبلەی عولەما تاجی فوضەلا**
**جەژنت موبارەك بە سەعدو صەفا**

مەلا حەوێزەفەندی «مەحزوون» کە لە کۆیە بووە، هەردەم لە کۆڕو ئەنجومەنی مەلای گەورەدا ئامادەدەبووە، لە وەختێك‌دا کە مەلای گەورە ئیجازەی مەلایەتی داوە بە (عەلی) کوری قازی سەردەشتو ئاهەنگیان بۆ گێراوە، (مەحزوون) هۆنراوەیەکی بەو بۆنەیەوە داناوەو لە ئاهەنگەکەدا خوێندوویەتی‌یەوەو لێرەدا چەند دێرێکی لێ دەخەینەروو، کە بە زمانی فارسی‌و عەرەبی داناوەو دەڵێ : –

**علمِ و عرفان أشرف الأشیاست از کون و مکان**
**باعث فوز و نجات است هادی راهی جنان**
**«اطلبوا العلم و لو بالصین» فرمودش رسول**
**آیت «هل یستوي» گشته است برفضلش نزول**
**«حصلوا مایحفظ الدین المبین من خلل**
**لیس للانسان الا ماسعاه من عمل!»**
**لن ینالَ عالمُ الاسلام فخراً بالخیال**
**انما الفخر لقومٍ ارتقوا عرش الکمال!!**

خوێنەری بەرێز، ئەمەبوو چەند وشەیەکی پێویست لە یادی مامۆستاو شاعیرێکی نەمری کورددا، هیوادارم لە دەرفەتێکی دیکەدا بتوانم باسێکی فراوانی لەسەر بنووسمو مافی رەوای خۆی پێ‌بدەم. لەگەڵ سلاومان‌دا بۆ گیانی پاکی مەلای شاعیرو رێزمان بۆ ئێوەی خوشەویست.

سەرچاوەو پەراوێز :
۱). کەریم شارەزا – کۆیەو شاعیرانی – ب ۱، بەغدا ۱۹٦۱، ل : ۷۲، ۷۳، ۷٤
۲). ماموستا عەبەولەجید نورەدین جەلی زادە (کۆیە : ۱۹۱۲)
۳). مامۆستا مەلافەتاحی مەلا عیزەتی جەلی‌زادە (کۆیە : ۱۹۱۰)
٤). مامۆستاعومەر جەلال حەوێزی (کۆیە : ۱۹۱۲)
٥). مامۆستا جەلال جۆباری شاعیر (کۆیە: ۱۹۲۹)
٦). مامۆستا عەبدولخالق عەبدورەززاق حەبیب (کاکەجوان) کۆیە ۱۹٤٦

به بۆنەی چلەی کاك تایەرەوە :

# کاربەدەستانی هونەرو هەندێ لە خەڵکیش لە تایەر تۆفیق نەگەیشتن



خالید دلێر .

. لە پاش کۆچکردنی ، لە رادیۆی بەغدا بەشی کوردی ، گوێم لە ووتەیەك بوو ، کە کاك تایەر لە چاو پێکەوتنێکدا ، کە لە گەڵیدا کرابوو ، گوتبووی ، کە گوایا کاك تایەر گۆرانی یەکانی خۆی خۆشناوێن و رق لێیان دەبێتەوە ! ! .

من لەگەڵ ئەم قسەیەی کاك تایەردانەبووم و هەر کە گوێم لی‌بوو ، یەکسەر چوومە بنج و بنەوانی نهێنی یەکەوەو زانیم کاك تایەر ، راستی یەکەی ناڵێ و شت لە خەڵك دەشارێتەوە .

روونکردنەوەی ئەم بۆچوونەی من پێویستی بە هەندێ لەسەر دوان هەیە ، بۆیە دەڵێم : شتێکی ئاشکرایە ، کە هەر پیشەیەکی ئەتو بیگری یان هەر کاسبی یەکی تۆ باسی بکەی ، پیشەوەرەکەی یان پیشەسازەکەی و کاسبی کەرەکەی ئەگەر بە دڵو دەروون حەزی پێنەکا ، ناتوانێ پێی هەڵبستێ و لەسەری بەردەوام بێو تێی یدا سەرکەوێ و ناوی پێ دەربکاو خەڵکی بەو پیشەیە ، یان بەو کاسبی یەوە بیناسێ .

ئەمە ئەگەر بۆ کاسبی و پیشەسازی راست و دروست و تەواوبێ ، خۆ بۆ کاری هونەری و هونەر پیشەیی هەرزۆر راست ترو دروست ترو تەواوتریشە .

بۆ کاری هونەری ، لە پێش هەموو شتێکدا ، باری مێشك و دەروونی هەندێ مرۆڤی تایبەتی ، سەرنج ووردو هەست ناسك و دەروون بە کوڵ ، کە هەر لەو دەوروبەرە تایبەتی یەکەی خۆیان وەها دەرسکێن ، وەکوو زەمینەیەکی بە پیت و بەپێز ، دەسازێن و خلیسکەیەکی بچکۆلانەی هونەری تێدا دەردەکەوێ ، وەك خلیسکەی پیاز ، یان خلیسکەی نێرگز . ئەوجا خلیسکە هونەری یە کە لەو زەوی یە بە پیت و پێزە دایە ، بە باران و بە ئاوی خۆ بەهونەرەوە خەریك کردن و دەست لە هونەروەردان نەبێ ، ئاو نادرێ . دەبێ بە ئاوی خۆ بە هونەرەوە خەریك کردن ، پاراو بکرێو سەر دەربهێنێ و چووزەرە بکاو هەر بەو ئاوە بە بەردەوامی و بە بێ پسانەوە ئاو بدرێ ، تا خلیسکەکە ، بێ بە بەرهەم و لە هونەرمەندەکەدا دەرکەوێ ، خەڵك لەو بەرهەمە بەرخورداربن . بەهونەرەوە خەریك بوون ، ئیش بۆ کردن و ئیش تێدا کردن ، لە هەموو

مەرجێکی تر ، بۆ سەرهەڵدانی هونەرو بەرهەمی هونەری تازەو پێگەیشتن و دەرکەوتنی هونەرمەندی بێ فروفێڵ . زیاتر پێویستە . یاخلیسکەی هونەری و زەمینەی هەربن . ئەگەر بە ئاوی «بە هونەرەوە خەریك بوون» ، «ممارسة» ئاو نەدرێ ، خاکەکە ، پاشماوەیەك خلیسکەکە لە ناو دەداو سەری دەخوا ئیتر هونەری چی و هونەرمەند لە کوێ ؟ .

خۆ ئەگەر جیاوازی لە نێوان کاری پشەسازی و کاسبی لەلایەك ، کاری هونەری لەلایەکی دیکەدا ، بیهێنینە بەرچاو ، کە ئەویان زیاتر ، کاری بەرژەوەندی ئابووری و نان پەیدا کردن و گوزەرانکردنەوە پێویستی یەکی ئەو تۆی نی یە بە تێکەڵاو بوون و بەناخی دەروونی کۆمەڵ و دەورو پشت و ووردەکاری یەکی وەهای گەرەك نی یەو ئەمیان پێویستی بەمانە ، تابڵێی زۆرو قووڵە ، ئەم جیاوازی یە بهێنینە بەرچاو بۆمان دەردەکەوێ کاری هونەری پێویستی بە هەناسەو بینی درێژو باڵ قووڵی و خۆ بۆ تواندنەوەو مێشك و دەروون پێوە خەریك کردنە .

ئەمانەش هەموو پێویستی یان بەوە هەیە کە ئەو مرۆڤە هونەرمەندە ، خۆی رای لەبەرهەمەکانی و رای لە جۆری هونەرەکەی بێو بە دڵی بێو بابێ ئەوەی بێ کە ئەم مرۆڤە لەو ئاستە کۆمەلاتی یەی تێیدا دەژی بەرز بکاتەوەو سەرنجی کۆمەڵی بۆ رابکێشی و خەڵك پێی بگەشێنەوەو خۆشی دڵی پێ خۆش بێو شانازی پێوە بکا .

ئەگەر هونەرەکە ، بە پێی کەسایەتی هونەرمەندەکەو ئاوات و ئامانجە کەسایەتی و کۆمەلایەتی یەکەی نەبێ ، ئەو هونەرمەندە ، زوو وازی لێدێنێ و دەستی لێ دەشواو بەشوێن فرمانێکی گرنگتردا عەودال دەبێ .

کەسایەتی یەکی لەرو پووچەڵ ، خاوەنی ئاوات و ئامانجێکی بچووك و نابووت دەبێ ، بە «بن کوزر» یش رازی دەبێ .

بەڵام کەسایەتی کاك تایەر توفیق ، کەسایەتی یەکی گەورەو پتەوو بەتین و توانابوو . تا مرد سووکایەتی یەکی بەخۆیەوە نەدیوەو کەسیش پێوەی نەدی . پەریشانی و دەست نەرۆیشتنەکەی بەڵگەنامەی بەهێزی و گەورەیی و سەربەرزی کەسایەتی یەکەیەتی ئەو کەسایەتی یە گەورەو بەرزە ، بێگومان دەبێ خاوەنی ئاوات و ئامانجی کەسایەتی و کۆمەلایەتی زۆر گەورە بووبێ . وەکوو کە هەموو لایەکیش دەیزانین هەرووەهاش بوو ، هەر لە سەرەتای گۆرانی گوتنی لە ئیستگەی بەشی کوردیدا ، گۆرانی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری و مرۆڤ ویستی دەگوت . ئەو کەسایەتی یە بە هونەرێکی گەورە، بە تواناو دەستەلات ، هونەرێکی بێ فروفێڵ نەبا ، داینە نەدەبوو ، دڵی ئاوی نەدەخواردەوە ، بڕی پێ نەدەشکا . هەڵپەی لایەکی دی بە دەستهێنانی هۆیەکی دی دەکرد .

کاك تایەر لە هونەرەکەی خۆی رازی بوو ، دڵی پێی خۆشبوو ، بۆیە هەڵپەی هیچ لایەکی دیکەی نەکرد ، گەورەبوون و پلە بەرزبوونە کۆمەلایەتی یەکەی ، کە بەهۆی هونەرەکەی خۆیەوە بەرز ببۆوەو ریزی لێدەندرا ، بە شایانی خۆی دەزانی و تینوویەتی و بڕی پێدەشکا . ئەو ریز لێنان و بەگەورە زانینەی ، بەچاوە دووربین و هەست و مێشکە ژیرو ووریاکەی بە ئاشکرا لە دەمو دوو لەسەر رووی کۆمەڵانی خەڵك . بەرامبەر بە خۆی دەی خوێندەوەو هەستی پێ دەکرد . ئەگەر کاك تایەر ، بە هونەرەکەی خۆی ، کە لە گۆرانی یەکانی دا دەردەکەوێ ، رازی نەبایە ، ئەگەر دەنگی خۆی و گۆرانی یەکانی لەلا زۆر خۆش و دڵگرو دڵخۆشکەر نەبایە ، ماوەی نیو سەدە ، پەنجا ساڵ گۆرانی نە دەگوت و خۆ ئەگەر بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووی کەسایەتی و ئاوات و ئامانجەکانی . هەڵپەی هیچ لایەکی دیکەی نەکردبایە . ئاوا لە جێی خۆی هەر لەگەڵ دەستکردنی بە گۆرانی گوتن ، یەکسەر کپ دەبۆوەو خامۆش دەبوو نووزەی لێ دەبڕا ! ! ئەو پیاوە لە ناوەراستی ساڵەکانی سی یەکانی ئەم سەدەیەمانەوە گۆرانی گوتووە ، دەنگی زوڵاڵ و بێخەوش و بەرزو بە بە چریکەو دەنگدانەوەبوو هەتا ئەوکاتە کە نەخۆشیی لە زمانی داو بەیەکەوە لە قسەکردن و لە گۆرانی گوتنی خست و ئەو دەنگە تایبەتی یە ، کە هەتا دونیا ماوە، لە ناو کوردستاندا ، دەنگێکی وەها نابێتەوە ، بۆ دوا جار کپ بوو .

لە ئاهەنگە نەتەوایەتی یەکاندا ، لەو ئاهەنگانەدا کە ریز لێنانەکەی بەرادەیەکی وەها دەبوو کە دڵی خۆش دەکرد ، تێی دەچریکاند ، هەموو گوێگرەکانی دەبووژاندنەوەو خۆشی لە هەموویان زیاتر دەبووژایەوەو دڵی دەکرایەوەو هەستی بە گەورەیی و بەرزی کەسایەتی و یەبێ هاوتایی دەنگی هونەرەکەی دەکرد . ئەم راستی یە ئەگەر بۆ هەموو خەڵك روون و ئاشکرا نەبێ بێ زۆر لەو کەسانەی لە کاك تایەر نزیك بوون و کاك تایەریان دەناسی ، روون و ئاشکرا بوو ، ئەدی کە ئەمە وەهایە ، کە ئەمە راستی یەکی نەشاردراوەیە ، کاك تایەر بۆچی لەو چاو پێکەوتنەدا گوتوویەتی کە ئەو حەز لە دەنگی خۆی ناکاو گۆرانی یەکانی خۆی لەلا ناخۆشە ؟ !

دەبوو لە پێش ئێستا ، لە پێش کۆتایی هاتنی ژیانی کاك تایەر ، لە پێش

ئەوەی کاك تایەر ماڵئاوایی‌مان لێبکا ، یان هەر راستەو خۆ یەکسەر لە دوای بلاوکردنەوەی چاوپێکەوتنەکە لە کاتی خۆیدا ، یان لە پێش بلاوکردنەوەشی کاربەدەستانی هونەر ئەو پرسیارەیان بەبیردا بێو بەو چەشنەی کە ئێمە لێرەدا قسەی لەسەر دەکەین. ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەنو ئەو هۆو یان ئەو هۆیانەی کە کاك تایەریان وا لێکردبوو لە دەنگە خۆشە بێ هاوتاکەی‌و گۆرانی‌یە پلە بەرزو بەجۆشەکانی بێزی بێتەوە ، بدۆزنەوەو هەوڵی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کاك تایەر بدەنو نەیەڵن وەها بە دڵشکاوی پاش پەنجا ساڵ خزمەت کردن ، سەربنێتەوە .

ئەو پیاوە خاوەن دڵو دەرونێکی زۆر گەورەو فرەوان بوو ، بە بچووکترین چاکەی دەزانی کە بەرامبەری بکرابایە ، ئەمە لە کاتێکدا کە شیاوی ئەوە بوو هەموو چاکەیەکی گەورەی لەگەڵدا بکرێ، لەوکاتەیشدا ئەو بە بچووکترین چاکە لەگەڵ کردن رازی بووو خۆشحال دەبوو .

ئەوجا با لە پێش وەرامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە لە خۆم کرد ، سەر گوزەشتەیەکی کاك تایەرتان بۆ بگێرمەوە ، کە وەرامدانەوەی پرسیارەکە روون دەکاتەوەو بارو حاڵێك دێنێتەبەر دەستمان کە وەرامەکەی من بۆ ئەو پرسیارە . وەکوو راستی‌یەکی بێ‌گەرد ، لە قووڵکردن دەهێنێ .

وەکوو لەلای برادەرو دۆستو نزیکەکانی کاك تایەر زوربەی هاو تەمەنەکانی‌و خەڵکی کۆیە زانراوە ، هەر وەکوو دیاردەیەکی ئاساییش کاك تایەر هەر لە جاحێلی‌یەوە دەستی بەمەی خواردنەوە کردووە ، هەڵبەت بۆ سەر گەرمکردنو دونیاو بوون لە بیر خۆ بردنەوەو خۆ خستنە ناو جیهانێکی ئەفسووناوی‌و دوور لە پەژارەو گیرو گرفت ، لە پاش ئەو سەر گەرم کردنە ، دڵو دەروونە پڕ لە هیواکەی ، پشت ئەستووری بە دەنگە خۆش‌و زوڵاڵو بەرزەکەی ، تێی چریکاندووە ، فرسەخێك بەرینی ، لە دەورو پشتی خۆی جۆشاندووەو خرۆشاندووەو جموجۆڵو ژیانی تێخستووە .

لەم دوایی‌یەدا لە ماڵەوە .لە خانووەکەی میریدا لە سەیداوا ، کە بەکرێ دابوویانێو لە پاش تەقاویت بوونی چەند جارێك بۆ چۆڵکردنی کردبوویانە سەری . لە ماڵەکەی‌دا ، کە هەتا پێش مردنی «براژنە حەوا»ی هاوسەری . تەنیا سێ داری ووشکی کەڵەگەتی تێدابوو . لە پاش مردنی «یاحەوا» مابوونەوە دوودار . کاك (تایەر)و دارە ووشکە بە پێوەکەی حەوشەیان لەو ماڵەدا . مەی بۆ زووتر مردن دەخواردەوە . وەهای لێهاتبوو کە بەبێ هەموو شتێك‌و بەبێ هەموو کەسێك . تەنانەت بەبێ «یاحەوا»ش دەیتوانی . بەبێ مەی نەیدەتوانی .

چەند شەوێك لە پێش زمان شکانەکەیدا . شەوێکیان لە ماڵی

دۆستێکی خۆی دەبێو داوای «مەی» لە دۆستەکەی دەکاو .ئەویش پێی دەڵێ کە ئارام بگرێ هەتا مامۆستاکان تەشریفیان ئۆغر دەکەن (چەند مەلایەك لە دانیشتنەکەدا دەبن) ئەوجا مەیەکەی بە مەزەوە بۆ دێنێ . کاك تایەر ئەوەندە بێ ئارام دەبێ کە تا رۆیشتنی ئەوان خۆی بۆ راناگیرێو دەڵێ : «ئەوجا مەی خواردنەوەی من رێی لە دانیشتنی ئەوان نەگرتووە . ئەگەر حەزیشیان چووبێ ، با ئەوانیش لەگەڵمدا بخۆنەوە ! ! .

کاك تایەر دڵی شکابوو ، هیوا براو بوو بوو ، دەستی لە هەموو شتێك شووشتبوو ، بە ئارامو ئازارەوە چاوەروانی مەرگی رەزاگرانی دەکرد .

لەو رۆژە تووشی ئەو دڵشکانە بوو بوو ، بەرهەمی تازەی نەبوو. یەکێك لە خۆی‌و لەم ژیانو جیهانو بوونە بێزار بوو بێ ، بەرهەمی نوێی چی‌و هی رابردووی چی ؟ .

کاك تایەرێك کە بە هۆی ئەو دڵشکانو خۆ بە «مەغدوور» زانینەوە ، لەو دەنگە خۆشە ، لە هەموو توانایی‌و دەستەلاتە هونەری‌یە ، لەو مێژووە دوورو درێژە پڕ لە سەربەرزی‌و شانازی‌یە هونەری‌یەی کە هەیبوو ، بێزار بووبێ ، دەبێ ساڵانی دوایی تەمەنی لە چ ئازارێکی دەروونی‌و ئەشکەنجەیەکی کوشندەو جەرگبڕدا ژیابێو دەبێ ساتی چەند جاری مەرگ بە چاوی خۆی دیبێ .

وا پێدەچێ کاربەدەستانی هونەری کوردیش ، وەکوو جەماوەرە سادەکە ، بڕوایی تەواویان بەو قسەیەی کاك تایەر کردبێ کە لە چاو پێکەوتنەکەدا ، کرد بووی‌و ئێمە لە بارەیەوە دەدوێین ، بۆیە بەبێ پەروا ، ئەو قسەیەیان لە ئیستگەی بەغدا بەشی کوردی ، جار لە دوای جار بلاو دەکردەوە .

ئەو پیاوە گەورانە ، کە لە سنووری تایبەتی‌و کەسایەتی خۆیاندا جێیان نابێتەوەو لە توانایان‌دا هەیەو دەیانەوێ ئەو سنوورانە بشکێننو بەرەو بەرزترو بەرزترین بفڕنو قاوغ‌و هێلانە جاڵجاڵۆکەی تەنراوی دەوریان وەتەنگی هێناونو سەربەستی جوولانەوەو گەشەکردنی لێ زەوت کردوونەو ماوەی فڕینیان نادا ، ئەو پیاوە گەورانە کە خۆیان بۆ مەسەلەکانی ناو کۆمەڵو نەتەوەو مرۆڤ تەرخان کردووە ، باسی گیروگرفت‌و تەنگ‌و چەڵەمەی کەسایەتی‌و تایبەتی خۆیان ناکەنو سکالایان لە دەمەوە نابیسترێ . خەڵك دەبێ بەلێکدانەوەو لەگەڵدا ژیانو قووڵایی دەروون ناسینو لێ ووردبوونەوە ئەو سکالاو نارەزاییانە بخوێننەوەو بدۆزنەوە ، دەنا ئەو کەسانە لەو پلەیەدا نەماون خەڵك لەم رووەوە وورتەی لێیانەوە گوێ لێ بێ .

بۆکاك تایەریش ئەوەندەبوو ، بە داخەوە .

ئەو شۆڕشگێڕەی کورد



# لەمنیشەوە چەند تێبینی یەك لە سەر « سمکۆ »

کەمال نوری مەعروف

زۆر لە مێژە حەزم کردووە ، لە سەر بزوتنەوەکەی سمایل خانی سمکۆ زانیاری تەواوم هەبێت ، بۆئەمەش هەوڵم داوە ، هەر سەرچاوە یەکی مێژوویی باسی کردبێت ، پەیدام کردوەو چەند جارێکیش خوێندومەتەوەو چێژم لێ وەرگرتووە . چونکە لەراستیدا ئەو کەڵە پیاوەی کورد ، توانی بۆ ماوەی زیاتر لە دە ساڵ سەرۆکایەتیی بزوتنەوەیەکی گەورە لە کورد ستانی ئێراندا بکاتو ڕۆڵێکی ڕامیاری وابگێڕێت ، دۆستو دوژمن لە ئاستی ئەو ڕاستی یە بسەلمێنن . بزوتنەوەکەی سمایل خانی شوکاك لە کاتێکدا سەری هەڵدا ، گەلانی ژێر دەستە بە تەمای ئەوەبوون چاوی سۆزی هاوپەیمانەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی بیان گرێتەوە ، لەوانە گەلی کورد دێت . سەردەمەکەشی پێی دەڵێن چاخی بزوتنەوەی نەتەوایەتیو بۆ ئەو ڕۆژە

مۆژدەیەکی گەورەبوو کە بگەنە ئامانج . ئالەم کاتەدا بوو ، بزوتنەوەکەی سمکۆ . دەستی پێکردو . ئامانجیشی رزگارکردنی گەلی کوردی ئێران‌بوو ، لە ژێر چنگی سەڵتەنەتی ئەحمەد شای قاجاری‌و دواتریش حوکمی ڕەزاشای تاوانبار . لە منداڵیمدا وار یێ ئەکەوت زۆر جار گوێم لە مامم ئەگرت ، باسی پێشەوا (سمکۆ)ی بۆ ئەکردین ، بەلامەوە خوش‌بو ، حەزم ئەکرد قسەکانی نەبڕێتەوەو چی ئەزانی لەم ڕووەوە پێمان بڵێت . ئەو کاتەش وەکو ئێستانەبووم ئاشق مێژووی گەلەکەم بم ، تەنیا حەزم بە گوێ گرتنەکە ئەکرد . زانیاری وەرگرتنی زۆریش لەم ڕووەوە خزمەتێکی نەتەوایەتی‌یەو دەبێ رۆشنبیر نرخی تایبەتی خۆی بداتێ . لێرەدا بەداخەوە دەڵێم : دەبوایە دوکتورەکانمان . ئەوانەی خوێندنی باڵایان لە دەرەوەی وڵات ، لە سەر مێژووی ئەم سەردەمەی کورد ، تەواو کردوە ، ئێمەیان زووتر بەم پیاوەو بزوتنەکەی بناساندایە . چەندم پێخۆش‌بوو ، ساڵێ ، یان دوو ساڵ لە مەوبەر . چاوپێکەوتنێکیان لە گەڵ مامۆستای مێژوو نووسی گەورە ،

دوکتور کەمال مەزهەر لە ڕۆژنامەی هاوکاری‌دا سازکردو ، مامۆستا پەیمانی دێ کە نۆبەرەی ساڵی (٨٦) ی ، کتێبێکی مێژوویی ئەبێت لەسەر سمایل خانی سمکۆو بزوتنەوەکەی . هیوام وایە بەزوویی کتێبەکەی بخاتە کتێبخانەی کوردی‌یەوەو چاوی ئێمەی پێ ڕووناك بکاتەوە ، بۆ ئەوەی زیاتر لەو بارودۆخە . تێ بگەین کە ئەو بزووتنەوەیە چاوی تێدا هەڵهێناوەو بووە بە شوێن باوەڕی گەلی کوردستانی ئێران. هەر ئەم هەست‌و سۆزەبوو ، وای لێکردم باسە بە نرخەکەی ، مامۆستای خۆشەویست ، دوکتور بەدرخان سندی کە بە ناوو نیشانی : (سمکۆ ... ئەو شۆڕشگێڕەی کورد) لە گۆڤاری کاروان ، ژمارە ٥٨دا بڵاوی کردەوە ، چەند جارێکی بخوێنمەوە . پێشەکی سوپاسی دەست‌و خامە ڕەنگینەکەی مامۆستا دەکەم ، هیوادارم لە نووسینی وابەپێز بێبەشمان نەکات . کاتێ لە خوێندنەوەی باسەکەی بوومەوە ، لای خۆم هەندی (تێبینی)م ، تۆمارکردو بە باشم زانی ، بیانخەمە ڕوو ، بۆ ئەوەی بتوانم ئەو لایەنانەی لە باسەکەدا زۆر ڕوون نین ، تەمومژیان لە سەر لابەرمو بە چاوی خوێنەری کوردیان زیاتر ئاشنا بکەم . تێبینی‌یەکانیشم ئەمانەن :

١- بۆ کوشتنی جەعفەر ئاغا ، ماموستا سندی دەڵێ : «حاکمی تەورێز نیزامولسەڵتەنە ، پیلانی کوشتنەکەی داناو ، داوای کرد بێتە تەورێز ، بۆ ڕێکخستنی ئیشوکاری شارەکە ، لە گەڵ پیاوەکانیدا. کاتێ گەیشتە لای نیزامولسەلتەنە ، لە پشتەوە لێیان‌داو ، پیاوکوژەکان لەودیو پەردەوە خۆیان ونکرد ، ئەمەش لە ساڵی ١٩٠٧ دا ، ڕوی‌دا . بەڵام مینورسکی کوشتنەکە بە شێوەیەکی دی دەگێڕێتەوەو دەڵێ : «موتەسەریفی ئازربایجان ، دوای سویندخواردنی بە قورئان ، قەناعەتی بە جەعفەر ئاغاکرد کە بچێت بۆ تەورێز ... لە کاتی گەڕانەوەیدا ، جەنەراڵی موتەسەریف لە ماڵەکەی کە سەرباز چواردەوری گرتبوو ، پیلانی کوشتنەکەی داناو ، کوشتیان[1] ... بە ڵام لە ڕۆژنامەی (نداء الشعب) دا باسی کوشتنەکە بەشێوەیەکی دیکە دەکرێ‌و دەڵێ : «دوای ئەوەی گەلێ پیلان دانراو نە یان‌توانی جە عفەر* ئاغا بگرن ، والی تەورێز «مظفر الدین» داوای لێکرد بێت بۆ تەورێز ، پەیمانیشی‌دابێ ، لێی خۆشی‌بێت‌و بیکەن بە گەورەی عەشیرەتەکەو ناوچەکە. ئەم پەیمانە ، جێگری پاشا «مظفر الدین» شا ، مۆری کردو سوێندی بە قورئان‌و پێغەمبەر بۆ خوارد کە خراپەی لەگەڵ نەکەن . جەعفەر ئاغا بە خۆی‌و چەند چەکدارێکیەوە هاتن ، ئاغا پێشوازی لێکرا ، چۆن پێشوازی لێکرا ، چۆن پێشوازی لە میر دەکرێ .

گەورە پیاوانی شار لە ئەفسەرو ، موچەخۆر بە سواری ئەسپ ، چوونە دەرەوەی شار ، بۆ پێشوازی کردنەکەو ، دیاری‌یەکی زۆریشیان پێشکەش کردو چەند شەوێکیش لە سەریەك ئاهەنگیان بۆ گێڕا .

•• دوا جار کات هاتە سەر ئەوەی پیلانی کوشتنەکەی تێداجی‌بەجی‌بکەن . ئەوەی ئاغا ترسەکەی ڕەویەوەو بێ چەك ئەسووڕایەوە . دوای شەوێك لە شەوانی ئاهەنگەکە ، لە کاتێکدا لە ناو ئاهەنگ گێڕە دوژمنەکانیدا ، دانیشتبوو ، هیچ گرنگیەکی پێ نەئەدان‌و لێیان نەئەترسا ، کوژرا . دوای ئەوە لاشەکەیان کرد بە دوو کەرتەوە ، بەدەرگای سەرباز خانە کۆنەکەدا ، هەڵیان واسی ، هەر پارچەی بە لایەکی دەرگاکەدا ، بۆ ئەوەی خەڵکی دی ، پێ چاوترسین بکەن[2] . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ بۆ کوشتنەکە چەند ڕایەکی جیاواز هەبێت‌و هەر یەکەیان بە شێوەیەك دەیگێڕنەوە کە لەوی دی ناچێت ، بەڵام هەمویان لە خاڵێکدا یەك دەگرنەوە ، ئەویش ئەوەیە ، پیلانەکە والی تەورێز دایناوەو بە شێوەیەکی خراپ بە ئامانجی گەیاندووە . مامۆستا سندی بۆ کوشتنی جەعفەر ئاغا ، ساڵی ١٩٠٧ی داناوە . بەڵام بە ڕێز دوکتور کەمال مەزهەر ، ساڵی ١٩٠٥ی بۆ داناوەو دەڵێ : کوشتنەکە دوای ئەوە ڕوی داوە کە جەعفەر ئاغا پەیوەندی بە شۆڕشگێرانی ، ئێرانی‌یەوە کردووە[3] . ئەمە پیشانی ئەدات بۆساڵی کوشتنەکە جیاوازی لە ناو سەرچاوەکاندا هەبێت‌و ساڵەکەشی بە تەواوی لامان ڕوون نەبێت .

٢- مامۆستا سندی دەڵێ : ئەو کتێبانەی لەسەر سمکۆیان نووسیوە ، ئایا بە شێوەیەکی کورت ، یان درێژبێت‌و لە عێراق‌دا ، دەست بکەون ، ئەو سەرچاوانەن کەزۆربەی زۆری لە لایەن پیاوانی بەریتانی‌یەوە نووسراونەتەوە کە لە عێراقدا ، دەست ئەکەون(٤) . منیش لای خۆمەوە هەمان رام هەیەو . راکانمان لێرەدا یەك دەگرنەوە . بەڵام بۆم هەیە ، بڵێم : مامۆستا سندی ، بۆ تەواوکردنی باسەکەی ، تەنیا پەنای بردۆتە بەر سەرچاوەی پیاوانی بەریتانی . دەبوایە ناوو نیشانی باسەکەی بە جۆرێکی دی بگۆڕیایە کەلەگەڵ ئەسڵی باسەکەو سەرچاوەکانیدا بگونجێت . وەکو بی‌ووتایە : سمکۆوو بزوتنەوەکەی ، چۆن لە سەرچاوەی پیاوانی بەرتیانی‌دا باسی کراوە . ئێمە لێرەدا بۆ ناسینی بزوتنەوەکەی سمکۆ ، ناتوانین تەنیا پەنابە رینە بەر سەرچاوەیەك‌و ئەوانی دیکە بخەینە لاوە چونکە ئەرخستنی رووی راستی‌بزووتنەوەکە بەوە دەبێ سەرچاوە جیاجیاکانی دیکەش ببینین‌و بەراورد یان لەگەڵ یەکدا پی‌بکەین‌و قسەیان لەسەر بکەین بەمە ئەتوانین کاکڵەی باسەکە لە تۆێکڵەکەی جودا بکەینەوە .

٣- مامۆستا سندی دەڵێ : ئەوەی باسمان‌کرد ، نابێتە هۆی ئەوەی کە نەتوانین رەخنە لە سەرۆك‌و بزوتنەوە نیشتمانیەکانمان لە سەرەتای چاخی بیستەوە بگرین ، لەبەرئەوەی نەگەیشتوو نەتەئەوەی ، سەرکردایەتی‌یەکی یەکگرتویان بێت کەسەرۆکایەتی‌یەکی تێکۆشانی جەماوەری کورد بکات(٥) . منیش لای خۆمەوە ، ئەم قسەیە ئەسەلمێنم ، بەڵام بە پێویستی ئەزانم باسی دیاردەیەك بکەم ، راستەوخۆ پەیوەندی بە باسەکەوە هەیەو پێویستە لەسەری بدوێین‌و بزانین بۆ چ سەروکەکانمان نەیان توانیوە لە تێکۆشانیاندا ، سەرکردایەتی‌یەکی یەکگرتوویان هەبێت‌و جەماوەری خۆشەویست بەرەو ئامانجیان بەرن ؟ ! ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ کەمی‌و لاوازی چینی شۆرشگێری وریا ، لە ناو گەلی کوردا ، سەر ئەنجامیش بەهۆی نەبوونی پارتێکی کوردی ، شۆرشگێری پێشرەو ، تابتوانی سەرۆکایەتی تێکۆشانی گەلی کورد ، بۆ سەربەستی‌و سەربەخۆیی دژی ئیستعمارو کلکەکانی بکات(٦) . جگە لەوەش پێشەواکانی کورد ، خاوەنی دەسەڵاتی تەواوی خۆیان‌بوون لە بزوتنەوەکەیانداو ، کارتێکردنی تەواویان بەسەر رووداوەکاندا ، لە چارەنووسیدابووە . لەبەر ئەوە ئەتوانین بڵێین شێوە عەشایەریەکەی تێدا زاڵ بووەو گەورەی هۆزەکە ، ئەگەر لە شەردابووبێت ، پیاوانی هۆزەکەی لە گەڵدا بووە ، بە پێچەوانەشەوە ، دوژمنایەتی یان لە گەڵدا کردووەو لە پشتەوە لە بزوتنەوەکەیان داوەو بونەتە داردەستێك بەدەست بێگانەوەو ، لە قازانجی ئەوانا کاریان کردووەو ماو نەتەوە ، ئاسۆی بیرکردنەوە شیان تەسك‌بووەو تەنیا تاڵانی کۆکردنەوەو کزکردنی دەسەڵاتی میری‌یان بەلاوەگرنگ بووە .(٧)

٤- مامۆستا سندی دەڵێ : «باوەرم وایە ، ئەو سەرچاوانەی لێوەی‌ن دووام ، بە تەواوی زوڵمیان لە سمکۆ کردووە ، واتەبینم ئەوەی لە پشت کوشتنی مار شەمعون وەستاوە ، خودی سمکۆ خۆی بی‌و دەستی بێگانە نەبێ کە پاڵیان پێوەنابێت‌و ئەم کارەیان پێ بە ئەنجام گەیاندبێت . لێرەدا(٨) لەگەڵ رێزمدا بۆ راکەی مامۆستا سندی ، بەڵام لە گەڵیانم‌و تاوانی کوشتنەکەش بە تەنیا نادەمە پاڵ (سمکۆ) ی شوکاك . وەکو دوکتور عەبدولرەحمان قاسملوش ناڵێم :

... بەڵام ئینگلیزەکان سمکۆیان بۆ شەری ئاسوریەکان هان‌داو سەرۆکی ئاسوریەکان (مار شەمعوونی) کوشت(٩) . لەبەر ئەوەی ئاوکاتە ، ئینگلیزەکان پێویستی‌یان بەوەبوو ، مار شەمعون بمێنێ‌و بۆ مەرامی خۆیان ئاسوریەکان بەکار بهێنن ، بەڵام نەگەیشتنە ئەوەی کارەکەی پێ بە ئەنجام بگەیەنن ، مار شەمعوون کوژرا . من بەلای خۆمەوە وای بۆدەچم ، سمکۆ ئەو هەڵوێستەی بە تەنیا لە خۆیدا نەبینیوەو بەڵگەی زۆریش بەدەستەوەیە کارەکە کاتێك بەئەنجام گەیەنراوە دوژمنانی ئاسوری‌و ئەرمەنی‌و کورد کە لە هێزەکانی ئەو سەردەمەدا ئەبینران ، هەمو پێکەوە رایان وابوو ، ئەم هێزانە بە یەکتری لە ناوبەرن ، پێش ئەوەی یەك بگرن‌و بینە کۆسپێك لە رێیاندا ، بۆ ئەوەی ترس نەخەنە دڵیانەوەو لە دوا رۆژی خۆیان بە گومان نەبن . ئەگەر ئەمان بە هێزبن‌و لە هێزەوە بەرەو رویان بوەستن . لەم روەوە مامۆستای مێژوو نووس ، دوکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێ : لەراستیدا ، لەو کاتەدا ، داگیرکەرانی بێگانە ، خەریکی ئەوەبوون ، تۆوی دووبەرەکی بخەنەناو ئاسوری‌و کوردەکانەوە ، هەروەها ئەوەش راستە کە روس‌و ئینگلیز ، ئاسوریەکانیان بەکار هێناوە ، دژی عەشایەری کورد کەیارمەتی ئەڵمان‌و عوسمانیەکان ئەدەن ، بەڵام کوشتنەکە بووە هۆی ئەوەی پەیوەندی نێوان هەردوو گەلەکە بەرەو خراپی بەرێت ، وەکو مێژوو نووسە ئاسوریەکانیش لە سەر ئەو رایەن(١٠) . لێرەدا بۆ ئەوەی کە دەڵێ : عەشایەری کورد یارمەتی ئەڵمان‌و عوسمانیەکانی ئەدا ، وای بۆ ئەچم کە عوسمانیەکان بەناوی بەرگری کردن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام‌و دوارۆژی گەلانی موسڵمانی ناوچەکە بەنهێنی پەیوەندی‌یان بە سمکۆوە کردبێت ، بۆئەوەی کوشتنی مار شەمعوون بە ئەنجام بگەیەنێت ، تانەبونەتە هێزێکی گەورەو مەترسی نجەنەوەو کارەکەش لە پەرژەوەندی ئەواندا کە

عوسمانیەکانە تەواو دەبێت . لەم ڕووەوە مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف لە زوبانی ئەحمەد ئاغاوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێ : لە سمکۆم چەند جارێك بیستووە کە وتویێتی . خۆزگە (مار شەمعوون)م نەکوشتایەو پەشیمانم . ئەوە جەواد پاشای تورك بە منی کردو . گوتی : ئەگەر بیکوژی هەم کورەکەت بەرەڵا دەکەین و . هەم هەرچی تاڵانێکی تۆشیان بردبێت . پێتی ئەدەینەوە و پشتیوانی بزوتنەوەکەیشت دەکەین. بۆ پتەوکردنی ئەم ڕایە مامۆستا ئەحمەد تەقی دەڵێ :- عەرزی عەلی سەعید پاشامکرد . ئیسماعیل ئاغا مەراق بۆ کورەکەی دەخوات . باشتر وایە جارێ بینێرنەوە لای باوکی . لەوەرامدا ووتی: ئێستا ئیسماعیل ئاغا هاتۆتە سەر سنوری ئێمەو ڕازی بووەکە بە خۆی و هاوکارەکانیەوە لەوێدا دانیشێ . منیش خەریکی تەرتیبات‌کردنم لە گەڵ مەرکەزدا کە خەسرەوی بدەینەوە . هەروەها پارەکەشی لامان پارێزراوەو ئەیدەینەوە[١٢] . ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی بڵێین : بۆچی بەجێ‌کردنی کارەکە سمکۆ* هەر خۆی تەنیا بەرپرسیارنەبووە. بەڵکو لە پشتیەوە تارمایی یەکێکی دیکە دەبینرێت . بۆ تەواوکردنی پیلانەکەو نانەوەی ئاژاوەکە . مامۆستا سندی . ساڵی ١٩١٨ی دەست نیشان کردووە بۆ کوشتنی مار شەمعوون . بێ ئەوەی باسی ڕۆژو مانگەکەی تێدا بکات . ئەمەشی ئەوە دەگەیەنی لەڕوداوێکی ئاوا گرنگدا مامۆستا . گرنگی بە ڕۆژو مانگ نادات . ئەگەر وابیری کردبێتەوە . لە شوێنی خۆیدانیەو ڕوداوەکەش پێویستی بە وردەکاری هەیەو . ئەمەش لە(٣) ی ئازاری ١٩١٨ دا ڕووی داوە .[١٣]

٥- مامۆستا سندی دەڵێ :- لەڕاستیدا سمکۆ لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠ کوژراوە[١٤] . بۆڕاستی ئەم مێژووە بە کتێبەکەی دوکتور کەمال مەزهەردا .گەڕام. بۆم دەرکەوت . پیلانی کوشتنەکە لە ناوەڕاستی تەمووزی . ساڵی ١٩٣٠ ی ڕویداوەو لە لایەن کۆنەپەرستانی ئێرانی کە لە پادشایێتی ڕەزاشادا ئەخوێنرێتەوە . لە شاری شنۆ بە ئەنجام گەیەنراوە[١٥] . دەبوایە مامۆستا بە وردی سەیری مەسەلەکەی بکردایەو . ڕوداوەکەش ئەوە دەهێنێ . گرنگی پێ‌بدرێ . . چونکە بەشێکە لە مێژووەکەمان .

٦- مامۆستا سندی دەڵێ : هیچ سەرچاوەیەکمان بە دەستەوە نیە کە سمکۆ ماڵێك یان شارێکی بۆ خۆی تاڵانکردبێت .[١٦] بۆ وەڵامی ئەم ڕستەیە . پێویستە بڵێم : دوای ئەوەی سمایل خان ڕۆیشتە ناو شۆڕشەکەی سەید تەهای شەمزینی . لەوکاتەدابو . لەشکری کورد . شاری مەهابادیان . داگیرکردو . تاڵانیانکرد .[١٧] ئەمەش بۆ ئەو ڕۆژەی سمکۆ . کارێکی خراپ بو . بۆ ناشیرین کردنی سومعەی خان لە بەردەم گەلەکەیداو کزبوونی باوەڕ پێی و یارمەتی نەدانی . هەر ئەمەش بوو ، وای لە سمکۆکرد ، هەتا سەر لە گەڵ سەید تەها نەمێنێتەوەو شەر لە نێوانیاندا هەڵگیرسێ و تازەببێتەوە[١٨] .

٧- مامۆستا سندی دەڵێ : «لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٣٠ ، سمکۆی شوکاك . چەند شەرێکی کردو ، دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ناوچەکەدا بووە ئەوەی لەم تێکوشانەیدا یارمەتی ئەدا ، بزوتنەوەی شۆڕشگێری ڕزگاری خوازی ئێرانی‌بوو بە گشتی ، هەروەها بزووتنەوەکەی یارمەتی دەرێك‌بو . بۆ بزوتنەوەی ئەنجومەنی دیموکراسی شۆڕشگێری لە کوردستانی ئێراندا»[١٩] پێش ئەوەی قسە لەسەر ئەورایەی مامۆستا بکەم ، پێویستە ئەوە بڵێم کە بزووتنە وەکەی سمکۆ لە ناوەڕاستی . ساڵی ١٩٢١ ، دەست پێ‌ئەکات [٢٠] . نەوەکو ساڵی ١٩٢٠ . وەکو برای نووسەر بۆی چووەو باسی کردووە . ئەو ماوەیەی سمکۆ . بزوتنەوەکەی تێدا ئەگێڕا ، هەمو ساڵەکانی وەکو یەك سەرکەوتنی تێدا وەدەست نەئەهێنا ، بەڵکو بەردەوام لەبەرزبونەوەو نزم بونەوەدا ئەژیا . لە چوار ساڵی یەکەمدا سمکۆ ، دەسەلاتێکی تەواوی بەسەر ناوچەی ورمیدا پەیداکرد ، هۆکەش بۆ کزی و لاوازی دەسەڵاتی میری دەگەرێتەوە . بەڵام لە ماوەی شەش ساڵی دواییدا . سمکۆ . بزوتنەوەکەی بەرەو دوا هاتەوە[٢١] . بە هۆی ئەوەی لە مێژووی ئێراندا . سەردەمێکی تازە دەستی پی‌کرد کە پێی دەڵێن ، سەردەمی پەهلەوی و دامەزرێنەرەکەشی ڕەزاشابوو . سەرەتا ، شا هەڵسا بە کوژاندنەوەی هەمو ئەو بزوتنەوانەی . بەر هەڵستی فەرمان ڕەواییەکەی ئەویان دەکردو لەبەردەمیدا ببوونە کۆسپێکی گەورە . خاوەنی بزوتنەوەکانیش هەمو ئەو گەلانەبوون کەلەڕەگەزی فارس نەبون . پادشای تازەی پەهلەوی بەدڵ ڕەقی ڕەفتاری لە گەڵدا ئەکردن و . بەسەختی ئەیکوژاندنەوە . تاکە بزوتنەوەیەك کە تەمەنێکی درێژتری لەوانی دی ، بۆ نووسرابو . بزوتنەوەکەی سمکۆبو . لەبەر ئەوە ڕەزا شا . هەموکاتی خۆی تەرخانکردبو . بۆ لە ناوبردنی سمکۆو بزوتنەوەکەی.شا هەر لە یەکەم ڕۆژی فەرمان ڕەوایی‌یەکەیەوە بە ئاگرو ئاسن . کەوتە وێزەی ئەو خەڵکەو . ئێرانی کردبو بە زیندانێکی گەورە . هەموگەورە پیاوانی ڕامیاری کردبووە . ژورەوەو ئەوەی پێی بڵێن دیموکراتیەت و شۆڕشگێری نەیهێشت. لەم ڕووەوە دوکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد . دەڵێ : «ئێران لە سەردەمی ڕەزا شادا زیندانێکی ناخۆش‌بو . بۆگەلان . ماف گەلیان بە هیچ جۆری تێدا نەئەپارێزرا» ڕەزا شا بە درێژی ژیانی کوردو پێشەوا سمکۆی لە بیر نەئەچووە کە چۆن بەردەوام تێکۆشاوە بۆ بەدەست هێنانی ماف گەلەکەی[٢٢] . من لەگەڵ مامۆستا سندی یا نیم . کەدەڵێ : بزوتنەوەی

شۆڕشگێری ڕزگاری خوازانی ئێرانی بە گشتی یارمەتی داوە ، چونکە لەم ڕووەوە هیچ جۆرە زانیاری‌یەکمان بەدەستەوە نییەو ناتوانین قسەکانمان بکەینە بنەمایەك بۆ بزوتنەوەکەو ، ناسنامەکەی بەو شێوەیە هەڵسەنگێنین. هەروەکو ووتمان : ئەو کاتەی بزوتنەوەکە خۆی ناسی ، ڕەزا شا ، ئێرانی کردبو بە زیندان بۆ ئازاردانی ، ئازادی خوازانی ئێرانی ، ئەمانە چ کورد ، چ عەرەب یان هەرگەلێکی دی بن. لەبەر ئەوە قسەکە پێویستی بە بەڵگەی زیندو هەیەو ، قسەش ئەگەر سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی لە گەڵدا نەبێت ، ناچەسپێت‌و لە گوماندا ئەمینێتەوە. سنوری بزوتنەوەکەی (سمکۆ) ش لە چوارچێوەی ناوچەکەی نەچۆتە دەرەوەو لە وێدا ماوەتەوە. بۆڕاستی ئەم قسەیە ، مامۆستا ئەحمەد تەقی دەڵێ : «ئەوەی دەربارەی کوردستانی خوارو دەمزانی بە جەنابی سمکۆم ووت ! بۆم‌دەرکەوت کە هەستی ئەو لەگەڵ هەست‌و بیروڕای خەڵکی کوردستانی خوارو ، جیاوازە. فەرمووی : «ئێستا ئینگلیز زۆر بەهێزەو بەرەنگاری کردنی لەشکرەکانیان بۆ کورد زۆر گرانە. لەو بڕوایەشدانیم کە تورك بە هێزەوە بەشداری بزوتنەوەکەی ڕەواندز بکات. من وای بە باش ئەزانم کە هەوڵ بدەین لە ئێراندا بزوتنەوەکەمان بەهێزبکەین‌و لێرە بتوانین کورد یەك بخەین‌و پارێزگاری بکەین. ئەمە بۆ وەزعی ئەمڕۆمان زۆر باشترە»[٢٣] ئەم هەڵوێستەی دەری ئەخات ، بزوتنەوەکەی ناوچەیی بووەو نەشی ویستووە ، دڵی ئینگلیز لە خۆی برەنجێنی‌و ئەوانیش ئاگاداری هەموکارێك بوون.

٨- مامۆستا سندی دەڵێ : لەوکاتەدا سمکۆ ، ڕۆژنامەی کوردستانی ، زوبانی حکومەتەکەی دەکردووە. بۆزانینی ناوی ڕۆژنامەکە بە کتێبەکەی دوکتور کەمال مەزهەردا ، چوومەوە ، بۆم دەرکەوت ڕۆژنامەکە ناوی کوردستان نەبووە ، بەڵکو گەلێ ناوی لێنراوە ، وەکو : ڕۆژی کورد شەوی عەجەم ، ڕۆژی کورد ، کورد. لە دواجاردا ناوەکەی بووەبە کوردو نەگۆڕاوە. بە پێی ڕوداوەکان دەبێ ڕۆژنامەکە ، ساڵی ١٩٢١ دەرچوبێ‌و چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووبێت. سەر وتاری ژمارەکانی بەفارسیش بڵاو دەکرانەوە. بەرپرسیاری محەمەد تورجانی بوو. لە چانچانەی «غیرەت» چاپ‌دەکرا[٢٤].

٩ مامۆستا سندی دەڵێ : کوشتنی سمکۆ بە هەمان ڕێگابوو کە لەوەو پێش جەعفەر ئاغای تێدا کوژرا.. سمکۆ پەیمانی شەرەفیان دابێ کە هیچی لێ نەکەن‌و داوایان لێکردبێت‌و ببێتە میوانی (شا)و ڕێزی لێ ئەگرن ، سوپایەکی زۆریشیان بەرەو پیری نارد ، بۆ خۆش هاتنی ، میریش بڵاوی کردەوە کە هاتنەکەی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردە بە شێوەیەکی عادیلانە. لە شنۆ لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوەکانی لە پیلانێکدا کوژرا کە پێشەکی بۆیان دانابو ، کلیلەکەشی ، گفتی شەرەف بو کەپی‌یان دابو[٢٥]. پێشەکی ئەڵێم ، هەمو ئەو سەرچاوانەی لە بەردەستدان ، باسی کوشتنەکەی سمکۆی شوکاك بە شێوەیەك دەگێڕنەوە ، وەکوزانیاری‌یەکانیان لەیەك سەرچاوەوە ، وەرگرتبێت ، ئاوایە ، بێ ئەوەی جودایی لە نێوانیاندا هەبێت بەڵام لەم دواییەدا سەردانێکی مامۆستا ئەحمەد خواجەم کرد. داوای هەندی سەرچاوەی مێژوویی‌م لە سەر بزوتنەوەکەی سمکۆ لێکرد. ئەویش ووتی تەنیا ڕۆژنامەیەکی کۆنم لایە ، باسی کوشتنەکەی ئەکات. منیش لێم وەرگرت‌و چەند دانەیەکم لەبەر گرتەوە. لەوێدا باسی کوشتنەکە بە شێوەیەکی واهاتووە لە گەڵ سەرچاوەکانی دیکە دا جیاوازی هەیەو لەم ڕووەوە دەڵێ : لە ڕۆژی (٦)ی حوزەیرانی (١٩٢٩) ، ناوچەی دەسەڵاتی سمکۆ ، تووشی کارەساتی بومەلەرزەیەکی گەورە هاتووەو زۆربەی گوندەکانی ڕوخاندووە ژمارەیەکی زۆریش لە پیاوەکانی ئاغا کەوتونەتە ژێر دارو پەردوی ماڵە ڕوخاوەکانەوەو مردوون. ناوچەکە بە شێوەیەك وێران بووە ، کەس نەیئەزانی لەوەو پێش چۆن بووە. پزیشکی تایبەتی شا ، ئەمیر ئەعلام ، دوای ئەوەی بەفرۆکە بە ئاسمانی ناوچە وێران بووەکەدا سوڕاوەتەوە ، دەڵێ : بومەلەرزەکە هەمو ، (دە) خولەکێك گەڕاوەتەوەو وێنەی ناوچەکەی بە تەواوی گۆڕیوەو هەمووی کردۆتە ، گردو ، تەپۆڵکەو ، بە هەمو لایەکدا بڵاوی کردوتەوە.. هەروەها لە سەری دەرواو دەڵێ :- ناوچەکە بە شێوەیەك گۆڕاوە ، نەمئەزانی بە ئوتومو بیلەکەم لە کوێوە بڕۆین‌و چۆن بگەڕێینەوە. سمکۆ لەو کاتەدابو ، داوای کرد ، لێی ببورن‌و ڕابوردو لەبیر خۆیان بەرنەوەو ڕێگای بدەن ، پیاوەکانی کۆبکاتەوەو گوندەکانی ئاوەدان بکاتەوە.

ئەوانیش بەداخوازیەکەی ڕازی بوون ، بێ ئەوەی لەم لێبوردنەیدا مەرجێکیان هەبێت ، پەیمانیشیان دابێ بە ماڵ یارمەتی ئەدەن ، ئەگەر بۆ تازەکردنەوەی گوندە ڕوخاوەکان داوای بکات.

بەم شێوەیە سمکۆ ، خۆیو چوارسەد سوارو ، دوو سەد پیادەی پڕ چەك ڕۆیشتن بۆ شاری شنۆ ، لەوێ سەرکردەی جەندرمەکان بە پیریەوە ڕۆیشت‌و ڕێزی لێگرت‌و ، کۆشکێکی پاشایانەی گەورەی پێدا. بۆ ئەوەی تائە و ماوەیەی ئەمینێتەوە ، تێیدابێت. دوای ڕۆیشتن چەند ڕۆژێك بەسەرهاتنەکەیدا ، دەنگ وابڵاوبۆوە گەورەی سوپا دێت بۆ لای سەرکردەی سەربازخانەی شارەکە ، لە پێشەوا داوای کرد. ئەگەر ژمارەیەك لە پیاوەکانی بە پیریەوە بۆ شوینی دیاری‌کراو بڕۆن کەدەکەوێتە دەرەوەی شار. سمکۆ لەبەر ئەوەی لە کارەکە بەگومان‌بو. حەزی بەم

رۆیشتنەی نەئە کرد ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رازیبو ، پێشوازی بکات ، چونکە پیاوێکە بۆ دیدەنی ئەم دێتو سەرەرای ئەوەش لێی دەبورێتو زەویو زارەکەشی ئەداتەوە . لەبەرئەوە لە گەڵ یارمەتیدەرە گەورەکەیدا رۆیشتو پەنجا ، تا شەست سوارەی شەرکەری ئازای خۆشیانی برد . سەرکردەی سەربازەکان داوای لە سمکۆ کرد ، لە شوێنێکدا بوەستێت تۆزێنەیەکی ئەگرێت ، بەڵام بەوەستانەکە رازینەبو لە ترسی ئەوەی نەوەکو لە کارەکەدا مەبەستێك هەبێت . ماوەیەك بە پێ رۆیشتن ، لە کاتێکدا سمکۆو سەرکردەی سەربازەکان ، هاوشانی یەکتری دەرۆیشتن ، سەربازێکی سوارە هاتە پێشەوەو بە خێرایی ، پێی راگەیاندن کە گەورەی سەربازەکان لەبەر ئەوەی ئوتومۆبێلەکەی لە رێگا شکاوە ، ناتوانی ئەمرۆ بگات ، بەیانی زو دەگاتە لاتان ، پێشوازی کەرانیش بڵاوەیان لێ کردو گەرانەوە لە رێگا سەرکردەی سەربازەکان لێی جودا بۆوەو رۆیشتەوە بۆ بارەگاکەی ، پێشەوا (سمکۆ) ش ، بۆ لای کۆشکەکەی گەرایەوە کە بۆی نوسرابو ، جارێکی دی نایبینێتەوە . بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە پیلانێکی گەورە دانرابو ، دووسەد سەربازیان هێنابو ، لە ناوخەندەقێکدا بە هەردوو لای رێگاکە دا شاردبویانەوەو فەرمانیشیان پێ دابوون ، ئەو کاتەی سمکۆ ، بۆ وێنەگرتنە کە ئەوەستێت بیکوژن . سمکۆ لە پەنجا هەنگاو زیاتر تێپەری نەکردبو کە تەقەیان لێکردو کوشتیان . لەم سەردانەیدا سمکۆ ، خەسرەوی کوریشی لەگەڵدابو کە تەمەنی لە هەژدە ساڵ تێپەری نەکردبو[٢٦] ...

ئەوەی ووترا ، بەسەرهاتی ، چۆنێتی ئەو پیلانەبو کە سمکۆی شوکاکی تێدا بە هۆیەوە لە ناوچو . بەشی یەکەمی بەسەرهاتەکە پەیوەندی بە بوومەلەرزەکەوە هەیەو شتێکی تازەیە بۆ ئەمرۆمان ، چونکە لای مێژوو نووسەکان هەتاکو ئێستاکە بەو شێوەیە باسی نەکراوە . لە کۆتاییدا هیوادارم بەم چەند تێ بینیەم ، توانیبێتم خزمەتێکی گچکەم بە مێژووی کوردی خۆشەویست کردبێتو دڵی بەرێز دوکتور (بەدخان) یشم زویر نەکردبێت ، چونکە مەبەستم رونەو لە گەڵ رێزمدا بۆ هەموان .

**پەراوێزەکان :**

١- دوکتور بەدرخان سندی ، کاروان ، ژمارە ٥٨ ئابی ١٩٨٧ ، لاپەرە١٢٣

ە - جەعفەر ئاغابرا گەورەی سمکۆی شوکاکەو لەوە ئەچێت بزوتنەوەکەی سەردەمی فەرمان رەوایی ناصر الدین شاه ، دەستی پێکردبێت .

سەرۆکی هۆزی ئاودڵەو ، لکی عەشیرەتی شوکاکە ، لە ناوچەی نێوان سەلماس و ورمێ و شنۆو ، سەردەشت دائەنیشن . پیاوێکی وریاو ، ئازاو ، زیرەکو بە توانابەو نایەوێت هیچ کاتێك پەنا بەرێتە بەر دەوڵەتێکی دراوسێ ی .

بۆ ئەمە بروانە : میرزا فیروز خان ، مقتل سمکو ، جریدة نداء الشعب ، العدد ٢٩٤ ، بغداد ، ٣ تشرين الثاني ١٩٣٠ .

– ئەم نووسینە کاتی خۆی بەزوبانی فارسی لە گۆڤاری (نیرایست) بڵاوکراوەتەوەو گۆریویانە بۆ زوبانی عەرەبی

٢- میرزا فیروز خان ، مقتل سمکو ، نفس المصدر السابق .

٣- الدکتور کمال مظهر احمد ، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، بغداد ١٩٨٥ص٢٥٠

٤- دوکتور بەدرخان سندی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ١٢٤

٥- دوکتور بەدرخان سندی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ١٢٦

٦- د . س . ع . شمزيني ، خەبات ، العدد ١٩٩ ، ٣٠ نيسان ١٩٦٠ ، ص

٧- دوکتور عبد الرحمن قاسملو ، کوردستان وکورد ، وەرگێر عبد الله حسن زادە ، ١٩٧٣ ی زایینی ، لاپەرە ٨٩

٨- دوکتور بەدرخان سندی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ٨٦

٩ ـ د . عبدالرحمن قاسملو ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل٨٦

١٠- الدکتور کمال مظهر احمد ، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى ، ترجمة محمد الملا عبد الكريم ، الطبعة الثانية ، بغداد ١٩٨٤ ، ص ٢١٠

١١- عەبدولرەقیب یوسف ، بانگەوازێك بۆ روناکبیرانی کورد ، ١٩٨٥ لاپەرە ٤٧

١٢- ئەحمەد تەقی ، خەباتی کورد ، رێکخستنو ئامادەکردنی بۆ چاپ جەلال تەقی ، ١٩٧٠ ، لاپەرە ٧١ ، ٧٢

ە- تورکەکان بە (سمکۆ) یان وتووە ، سمیقۆ بروانە : رەفیق حلمی ، یادداشت ، بە غدا ١٩٥٦ ، مطبعة معارف ، ج ٦ . لاپەرە٥٧٩

– سمکۆ ، کوری محەمەد پاشا ، کوری عەلی خان ، کوری ئیسماعیل خان ، سەرۆکی بەشی عەشیرەتی شوکاکی ئێرانەو لە نێوان خویو ورمێدا ئەنیشن . بەشەکەی دیکەی ، دەکەوێتە تورکیاو لە ویلایەتی وانو حەکاریدایە .

بروانە : بانگی کردستان ، ژمارە ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢

١٣- الدکتور کمال مظهر احمد ، کردستان في سنوات الحرب العالية الاولى ، نفس المصدر السابق ، ص ٢١٠

١٤- دوکتور بەدرخان سندی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ١٢٨

١٥- الدکتور کمال مظهر احمد ، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، نفس المصدر السابق ، ص٢٥٣

١٦- دوکتور بەدرخان سندی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ١٣١

١٧- ئەحمەد خواجە ، یاداشت نامە ، دەست نووس

١٨- ئەحمەد تەقی ، خەباتی کورد ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ٧٠

١٩- دوکتور بەدرخان سندی ، کاروان ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ١٣١

٢٠- الدکتور کمال مظهر احمد ، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، نفس المصدر السابق ، ص ٢٥١

٢١- الدکتور کمال مظهر احمد ، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، نفس المصدر السابق ، ص ٢٥٣

٢٢- الدکتور کمال مظهر احمد ، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر ، نفس المصدر السابق ، ص ٢٥٣

٢٣- ئەحمەد تەقی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە ٤٧

٢٤- د . کەمال مەزهەر ئەحمەد ، تێگەیشتنی راستی ، بغداد ١٩٧٨ ، لاپەرە ٨٠

٢٥- دوکتور بەدرخان سندی ، هەمان سەرچاوەی پێشو ، لاپەرە١٣٢ ، ١٣٣

٢٦- میرزا فیروز خان ، مقتل سمکو ، نفس المصدر السابق .

# هەرکەسێ سمێڵی سوور بوو هەمزاغا نییە

عبد القادری دەباغی

**نەتەوەی کوردی مەینەت بەش لە کوردستانی ئێران، لە هەموو سەر دەمێکاو، لەمەڵبەندە جۆراو جۆرەکانی، هەمیشە ڕۆڵەی هەڵکەوتووو قارەمانی ئەوتۆی بووە کە ئەگەر لەسەردەمی خۆیاندا ژین نامەو کردەوەکانیان بنووسرایەو بڵاوبکرابانەوە، ئەمڕۆ گەنجینەی ئەدەبیو مێژوویی‌و فۆلکلۆرو هونەری کوردی لەڕیزی دەوڵەمەندترین ئەدەبیاتی جیهانی‌دا دەبوو.**

به تۆزقاڵێ سەرنجو بیرکردنەوە لە کارەساتی دڵتەزێن‌و لە هەمان کاتدا حەماسە خوڵقێنەکانی ئەم نەتەوە نەبەزو سەربەرزە تێدەگەین کە مامۆستای نیشتمان پەروەران‌و شۆڕشگێرانی کورد حاجی قادری کۆیی بۆچی شینی بۆ نەنووسینی ئەو دیارە مێژووییانە گێڕاوە تەنانەت ڕقی هەستاوە کە دەفەرموێ:—

**«یەکسەر عولەما درشت‌و وردی**
**ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی**
**ئوستادی خەتن لە ئەم سیانە**
**وەك دی لە زمانی خۆی نەزانە».. هتد.**

ئەگەر کارەساتی قەڵای دمدم، ئەسکەندەری مونشی (نووسەر)ی بەرماوخۆری شا عەبباسی خوێن ڕێژ بەو گشت درۆو بوختان‌و جنێو دانەش لە کتێبی فارسی (عالەم‌ارای‌عەبباسی) نەنووسرابایە، ئەو کارەساتە حەماسی‌و پڕ لە قارەمانەتی‌و عیبرەت هێنەرەش، ناوی وەك ناوی زۆر کارەساتی دیکە وون دەبوو.

ئەگەر بەیت بێژومەقام‌بێژە نەخوێندەوار، بەڵام بە ئەوینی نیشتمان دڵ بریندار، نەبان ئێستاش ناوی لاس‌و خەزاڵ‌و خەج‌و سیامەندو ناسرو ماڵ‌ماڵ‌و...... نەدەمایەوە.

دەبینن ئەگەر شوێنەواریکیش ماوە بێجگە لەسەرداری شاعیرانی نیستمان‌پەروەر ئەحمەدی خانی‌و چەن ڕێبوارێکی حاجی قادری کۆیی نەبێ بەرهەم هێنەرانی ئەو هونەرە بەنرخە، نەخوێندەوارانی مامۆستای نیشتمان پەروەری بوون.

لەلایەکی دیکەوە وەك مەحوی گەورە دەفەرموێ:

**بێستونی ئەشقی شیرینێ ئەوا هاتۆتە پێش**
**گەر لە حەق بێم‌و نەیەم تەقلیدی فەرهادێ دەکەم**

منی پیری کەفتەکارو هەلوەدای شاخ‌و داخ بەئەشقی فەرهادی بە کوردستانی شیرینم دەمەوێ ڕێزی خۆی لەو قارەمانانە بگرم‌و تەپ‌و تۆزی فەرامۆشیان لەسەر لادەم‌و بە فرمێسکی چاوی بیان شۆرمەوەو ڕوومای

پیرۆزیان بسرم، رچه بۆ لاوانی به ئەمەك خۆشکەم بەڵکو شوێنەواری ئەو گەنجینە گران بەهاو بێ وێنانە بگرن، بچنە ناوچەی لورستان بە شوێن راپەرینو شۆرشی مەزنی شێرەژن «قەدەمخێر» دابگەرێنو پرسیار کەنو بینووسن، یا شوێنەواری جووتە برای قارەمان «عەزیزو تەکش» مەنمی هەڵگرنو بەیتەکانی وە چنگ خەن.

جارێ واز لە سارمی دلێرو قەدەم خێرو والی خانو سەدار رەشیدو جافرسانو عەزیزو تەکشی مەنمیو بەسەرهاتی تالێ ئێلی گەڵباخیو هەڵخرانی سێدارەی بێدادی «شریف الدوله»ی قاجاری لە سەقزی خوێناویو شێرە ژنی سێ رۆڵە شەهید کراوی سەقز یا دڵسۆزو زانای نیشتمان پەروەری وەك «مستەفا پاشای یا موڵکی» یان جوامێری چەشنی شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی نەمر یا تەنانەت یاخیە سەرکێشەکانی وەك حەمە تاڵی بانەو خولە پیزە..... دێمو سەرەتای ئەم بەشە بە باسی قارەمانێکی لەبیر چوو واتا «هەمزاغای مەنگور» دەرازێنمەوە، بەڵام چۆن ئەم خولیایە کەوتە مێشکمەوە؟ رۆژێ لەبەر بۆمباو راکیت بارانی هەلیکۆپتەرەکانی حکومەتی رەشو دیکتاتۆری کۆماری دژی ئیسلامی ئێران خۆم خستە بەینی گاشە بەردە زلەکان کە وەك ئەشکەوت وا بوون، چەند کەسێکی دیکەش بەژنو منداڵەوە لەوێ بوون. کابرایەکی چەك فرۆش کە دوو تفەنگی پێ بوو خۆی هاویشتە لامانەوە، جوانە ژنێ کە مەمکی لە دەمی منداڵە ژیکەڵەکەی دابوو گوتی: مامە بچۆ لەسەر ئەو گابەردەوە تەقەیەکی بکە بەڵکو نزم نەبێتەوە تەماشای پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات کە بە قوربانیان بم چلۆن دایان گرتو کوپتەرەکانی خومەی خوێن رێژیان ترساندو ناوێرن لێیان نزیك ببنەوە، خۆ ئەوان لەو دەشتەدا شەر دەکەن.

کابرا گووتی خوشکم خۆ من پێشمەرگە نیم بە خولای تەقەم پێ ناکرێ، مێردی ژنەکەش ووتی: هەرکەس سمێڵی سوور بوو هەمزاغا نیە، ئەم برایە لە چەکو دراو دەگەرێو پێشمەرگەی دیموکرات لە پارێزگاری نیشتمان، فەرقیان بەینی عەرزەو عاسمان.

ئەو مەسەلەم زۆر جار بیستبوو بەڵام هەرگیز وا سەرنجی رانەکێشابووم خولیای کەوتە مێشکمەوەو بریارم دا کە هەوڵ بدەمو لە سووچو قوژنان بگەرێمو کوردە ووتەنی (پرسابەو زانابە) بکەومە پرسیار بەڵکو بەڵگەیەکی پر متمانە یا شارەزایەیەکی راست بێژو ئەمین گەرچی نەخوێندەواریش بێ پەیدا بکەمو لانیکەم روون بێتەوە کە ئەم هەمزاغایە کە ناوی بوەتە بەشێ لە کەلەپووری کوردیو لە گەرمێنو کوێستان بە موناسەبەی جۆراو جۆر کۆمەڵانی خەڵك ناوی بە باشی دەبەن کێیە؟ کوری کێیە؟ چی کردوە؟ چۆن مردوە؟ کوژراوە یان شەهیدێکی نەمری کوردستانە؟.

•

کەوتمە پرسیارو یەکێ لە هاورێیان گوتی رەنگە لە کتێبی (توحفەیمظفریە)دا ناوی هەبێت بەڵکو لەوێ شوێنەواری بدۆزیەوەو بە شوێن پێی دا برۆی، کاتێ تەماشام کرد لەوێدا باسی[٤] (بەیتی باپیر ئاغا)ی باوکی هەمزاغا دەکات کە بەیتێکی بەهادارە!.

بەختەوەرانە هاورێی دێرینەم قادر ئاغای مەنگور کە پێکەوە دەژین فریام کەوتو گوتی ئەو باپیر ئاغایە کە لە – مەراغە – شەهید بووە باپیری هەمزاغایە چونکە کاتێ ئەو لە مەراغە شەهید دەبێ ژنەکەی پاش چەن مانگ کورێکی دەبێ کە بەدابو نەریتی عەشایری ناوی دەنێن – باپیر – کە لەراستیدا باپیر ئاغای دوهەمەو لە شەش ژن هەژدە کوری دەبێ کە هەمزاغا چکۆلەی هەمویانە. باپیر ئاغای دووەم لەگەڵ تایفەی مامش دەبێ بە شەریانو وێرای چەند خزمی خۆی دەکوژرێ، کاتێ کە تەرمی کوژراوان دەنێژنو بۆ مەجلیسی پرسەو سەرە خۆشی دادەنیشن هەمزاغای کورە بچکۆلە، بەڵام بلیمەتو ئازا دەچێتە جێگای بابی دادەنیشێو بەقەندەدار کە ناوی پیرۆت دەبێ ئەمر دەکا قەندەی بۆ تێکا، بەدابو نەریتی عەشایری ئەو ئاکارە مانای ئەوەیە کە: من مەزنو سەرداری تایفەو عێڵم – هەر حەڤدە براکەی سەری تەعزیمی بۆ دادەنەوێننو مەزنایەتی هەمزاغا دەسەلمێنن. پاش تەواو بوونی پرسەو سەرە خۆشی لەشکری مەنگوران کۆ دەکاتەوەو بە تەیاری دەچێتە سەر مامەشانو زۆریان لێدەکوژێو تالانیان دەکا، ئازایی ولێزانیو ووریایی هەمزاغا سەرنجی هەمووان بۆ لای خۆی رادەکێشێو عەشیرەتەکانی دیکەی وەك پیرانو دێ بوکریو گەورگو مامەش بەگشتی دەکەونە ژێر رکێفیو بە ناردنی دیاریو خزمەت کردن بچووکی خۆیان دەنوێنن.

هەمزاغا بۆ هەر تایفەیەك گەورە پیاوێ دادەنێ، وەك قادر ئاغای کرد بە سەرۆکی دێبوکریان، کوێستانی گەدەو سپی سەنگ دەبێتە هاوینە هەواری هەمزاغاو ژۆربەی مەنگوران لەوێ دەبنو هەر لە بیری تۆڵەی باپیر ئاغای شەهیددا دەبێ کە رۆژێ خەبەری بۆ دێت کە حەوسەد سواری بەگزادەو قەرەپاپاخ هاتوونو لە گردی قەرەپاپاخان نزیکی سابلاخ خێوەتیان لێداوە وێ دەچێ خەیاڵێکیان هەبێ!.

هەمزاغا بە گورجی خزمانو عەشرەتی خۆی کۆدەکاتەوەو وەرێ دەکەوێو تەنانەت ئەو خەبەرەی وەك مزگێنیەکی گەورە وەردەگرێو چەپەرەکە خەڵات دەکاو دەڵێ:

تۆڵەی باپیری شەهیدم دەستێنمەوەو هەر ئەو عەسرە رێ دەکەوێ بە پەلە خۆی بە شەرگە دەگەیەنێ. عەجەمان بێ خەیاڵ لە خێوەتەکانیان نووستوون، ئاگایان لە کارەسات نیەو رەنگە خەیالێ کوشتنی کوردانو

ـلآن مەستی کردبن کە هەمزاغا لەشکری خۆی دەرازێنێتەوەو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك هەر قۆڵێك بە فەرماندەیەکی ئازاو لێوەشاوە دەسپێری‌و لەبەرەبەیاندا عەجەمان دەشڵەژێنی‌و لە شیرین خەویان هەڵدەستێنی. کورد دەکەونە گیانی عەجەم‌و لە ماوەی سەعاتێکدا وایان شر دەکەن کە تەنیا تاقە سوارێك دەتوانێ گیان بەدەربەری‌و هەڵبێت، گزنگی هەتاو لە کەلاکی حەوسەد سوارەی عەجەم دەدات‌و دنیا ڕوناك دەکاتەوە..

زۆری پێ ناچێ ڕاپەڕینی شێخ عبد القادری نەهری کوڕی شێخ عوبیدولآ دەست پێ‌دەکا، ناوو ناوبانگی پیرۆزی بنەماڵەی سەید تەهای گەورەو شێخ عوبەیدڵڵا لە مەڵبەندی ژووروی کوردستانی ئێران‌و موکوریان ڕەنگێکی پیرۆزایەتی دەدا بەو ڕاپەڕینەو هەستی کوردایەتی‌و هەق ئەستاندن سەرانسەری کوردستانی داگرت‌و لە پێش هەمواندا سەرداری ئازاو بلیمەتی کورد هەمزاغای بۆ کۆڕی خەباتی چەکدارانە ڕاکێشا.

هەمزاغا بە دڵ‌و بەگیان ئاشقی ئەو ڕاپەڕینە پیرۆزە بوو. وەك سەردارێکی لێوەشاوە گەلاڵەی گرتنیمیاندواو بناو مەراغەی دارشت کە ئەوێوە بەرەو تەورێز بچن. بەلاّم داخی داخانم خۆ فرۆشی‌ی برە سەرەك عەشایر لەگەڵ کەین‌و بەینی دەرباری شای ئێران‌و خەلیفەی عوسمانی، نەیان هێشت کورد بە ئاواتی خۆی بگات. بەلاّم لەو ماوەدا کە شێخ عبد القادر خۆی تەشریفی هێنایە موکوریان لەشکری کورد بەسەرکردایەتی هەمزاغای بلیمەت توانیان مەراغەش بگرن‌و تەنانەت میناغا کوێستانی سەهەندیشی گرت‌و دیسانەوە تۆڵەی خوێنی بەناهەق ڕژاوی باپیر ئاغای گەورەیان چەند پات سەندەوە.

دوای کوژاندنەوەی ڕاپەڕینی شێخ عبد القادرو گەڕاندنەوەی شێخ بۆ ئەستەمبوڵ، هەمزاغاش دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی‌و دەوڵەتی ئێران گەلاڵەی گرتن‌و کوشتنی دادەڕشت‌و وردە وردە خۆیان پێ‌نزیك دەکردەوە.

لەلایەکەوە بەهۆی سەرۆك عەشیرەتی وەك حەمەد ئاغای مامش دڵخۆشی براو خزمانیان دەدایەوە کە ئیدی بچوکی هەمزاغا نەکەن‌و لەلایەکی ترەوە وەعدەی حکومەتی موکوریان‌و ڕاگرتنی سنوری دەوڵەتی عوسمانیان دەدایەو بەزمانی شیرین بەناوی بانگ هێشتن‌و چاو پێکەوتن هێنایانە سابلاخ‌و لەوێ لە پێشدا بەحورمەتێکی زۆر میوانداریان کرد، دوای چەند ڕۆژێ دەرفەتی لێ‌دێنن‌و لە کاتێکدا خزمان‌و پیاوانی بۆ گەڕان‌و شمەك‌کڕین دەچنە نێو شارو تەنیا خۆی‌و پیرۆت لەیلی قەندەدار دەمێننەوە، بە پیرۆت دەڵێ قەندەیەکم بۆ تێکە، قەندەکە وەردەگری‌و نەفەسێکی پێ‌دەدا یاوەرێك‌و شەش سەرباز خۆدەکەن بەژوورا، یاوەرەکە کۆت‌و زنجیری پێ دەبێ‌و دەڵێ هەمزاغا دەستت بێنە بیخەمە زنجیرەوەو پێت لە کۆت بەستم. هەمزاغا زۆر بەلەسەرەخۆیی دەڵێ گوێم نەختێ قورسە. وەرە پێشێ با بزانم چ دەڵێیت؟! یاوەر دەچێتە پێشەوە بەلاّم هەمزاغا کە قەندەکەی بەزارەوە دەبێ وەك پڵنگ هەڵمەتی بۆ دەباو ملی بادەدو بە خەنجەرە دەبانە بە ناوبانگەکەی جەرگی هەڵدەدڕی‌و هەڵمەت دەباتە سەر سەربازەکان‌و هەرشەشیان دەکوژی‌و بێ‌ترس دەردەپەڕێتە حەوشە گەورەی پڕ لەسەربازو تەقە بەرزدەبێتەوە، بەدەنگی تەقەی تفەنگ مەنگوڕ بەگوڕ بەگورجی دێنەوە بۆ سەربازخانەو دەبینن دەرگای ئاسن داخراوەو نڕکەی شێرانەی هەمزاغا دەبیستن، حەمەدی ئارەحمان کە پیاوێکی بەشان‌و شەوکەت‌و زۆر بەهێز بووە دەکشێتەوەو بەهەموو هێزێەوە خۆ بە دەرکەوە دەنێ‌و ئاسنی ئەلقەی دەرگا دەپسێنی‌و هەمزاغاو قەندارەکەی بەرەو دەرگا دەڕۆن‌و بەمەنگوڕان دەگەن لەوێدا دەڵێ:

مەنگوڕینە: مەڵێن هەمزە خەجلاوە، بابی حەوتانم گاوە قەندەم لێ وەرنەگەڕاوە، بەلاّم لە دەسڕێژی عەجەمان حەمەدی ئارەحمان دەپێکری‌و دەکەوێ‌و مەنگوڕ ویرای هەمزاغا دەچنە باخی شێخی، لەوێوە پیاو دەنێرێتە لای پیاو ماقووڵ‌و ڕیش سپیەکانی شار، کە دەبێ تەرمی حەمەدم بدەنەوە دەنا ئیدی دەست ناپارێزم. ئەوانیش دەچنە لای حاکم و ڕازی دەکەن کەتەرمی حەمەد بەحورمەتەوە ببەنە باخی شێخی. هەمزاغا دەگەڕێتەوەو تەرمی حەمەدی ئارەحمانی دەنێژن بەلاّم هەر لەسەر قەبرانەوە بە تۆڵەی خوێنی حەمەد هێرش دەباتە سەر قەڵاتی (مووتاوێ) کە بنکەیەکی گەورەی سوپای ئێرانی لێ‌دەبێ، گەلاڵەی هێرش ئەوەندە بەووردی‌و تێ‌بین‌و لەهەمان کاتدا کتوپڕی دەبێ کە لەماوەیەکی کەمدا دەیگری‌و قڕ دەخاتە عەجەمان. دوای گرتنی قەڵای موتاوێ بێ پشودان هەربەو سوارانەوە هێرش دێنێ بۆسەر شاری سەردەشت، سوپای ئێران هێشتا بە باشی لە کارەساتی قەڵای قایمی موتاوێ ئاگادارنابن، تازە خەبەریان پێ‌گەیشتوەو ئەژنۆیان شکاوە، کە لە نەکاو خۆیان دەکەونە بەرهێرش. ناوی هەمزاغا ئەوەندە بەسام دەبێ کە دوژمن بە بیستنی ناوی وە دەحەپەسێ کە بێجگە لەهەلاّتن یاخۆ تەسلیم کردن ڕێگایەکی دیکەی بەبیرا نایەت، گەلاڵەی هێرشی سەردەشت چەشنی گەلاڵەی قەڵاتی موتاوێ بەووردی‌و تێ‌بینی‌و ئازایەتی دادەڕێژی‌و هەربەشێوەیەکی ناکاو یاغافڵ گیرانە ئەویش دەگری‌و چەك‌و جبەخانەیەکی فرەی وەچنگ دەکەوێ.

ئەگەر بەووردی‌و بێ‌لایەنی بڕوانینە ئەو هەڵمەتە مێژوویانەو لەلایەن پسپۆڕانی نیزامیەوە بدرێنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە

دەردەکەوێ کە لە ڕوانگەی نیزامیەوە هەمزا غای کوردی بێ‌کەس ئەگەر لەسەردارانی گەورەی دنیا ئازاترو لێزان تر نەبووبێ لەوان کەمتر نەبووە!

ئازانم کاتێ هەمزاغا هێرش دەباتە سەرگردی قەرەپاپاخان کە ئەوهێزە لە حەوسەد سواری سوپای ئێرانو عەشایری کوردو تورك پێك هاتبوون چەند سواری لەگەڵ بووە بەلام بەتێ‌فکرین لەهەل‌ومەرجی کاتی هێرش، کە هەر بەبیستنی خەبەرەکە دەستووری کۆبونەوە دەدات دەتوانین بێژین ئەگەر حەشیمەتی زۆریشی بەدەورەوە بووبێ لە دوو سەد یا سێ سەد سوار تێ‌نەپەڕیوە. دەبێ گەلاڵەو نەخشەی هێرشەکەی چەندە جەسوورانەو قارەمانانە بووبێ کە بەکوژراوێکی زۆرکەمەوە حەوسەد سواری تەیاری دوژمنی چەشنێ قڕ کردبێ‌ کە تاقە سوارێکی لێ دەرچووێ لە هێرشی قەلای موتاوێ کە ئەو قەلایە توورەکە ڕیژی دەوری زەردەشتەو دوژمن کردویە بە سەنگەرو ، خۆی بۆ بەرگری ئامادە کردوەو هەر چوار لای قەلاکەش دەشتەو مەلێك بجولێتەوە دیارە، دەبێ هەمزاغا چ پیلانێکی گێڕابێ کە لە ماوەیەکی کەمدا ئەو قەلا قایمەی گرتبێ.هەرروەها پێگەی‌قایم‌و گەورەی شاری‌سەردەشت

هەمزاغا بۆزستانو ڕابواردنی لای خزمان دێتە گەرمێن‌و لە گوندی – شروێن – دادەنیشێ. حکومەتی عوسمانی کە ئاگاداری قارەمانەتی‌و شۆرەت‌و ناوبانگی هەمزاغا دەبێ‌و، لەسەر داوای شای ئێران بە ناوی بانگ هێشتن داوای لێ‌ئەکەن کە بچێتە– ڕانیە – هەمزاغاش کە دژایەتی لەگەڵ عوسمانی نەبووەو ئاگای لەکەین‌و بەینی دوژمنانی کورد نەبوو، دەچێتە ڕانیەو لەوێ دەیگرنو ڕەوانەی ئەستەمبولی دەکەن دەی‌گرن‌و چەن سالی ڕەبەق لە زیندانا دەمێنێتەوەو بە ڕێکەوت لەو بەینەدا سوارچاکێکی جلیت بازی بێگانە دێتە ئەستەمبوڵ‌و بە جلیت بازی چەند سوارچاکی تورك دەکوژێ. سوڵتان بەنزیکانی دەستور دەدا بەڵکو پاڵەوانێکی وام بۆ پەیدا بکەن ئەم جلیت بازە ببەزێنی‌و ڕزگارمان بکات. یەکێ لەمانە دەڵێ کە کوردێکی ئازا لە زیندانایە مەگەر ئەو بتوانێ دەنا لەم وولاتە کەسم پێ‌شك نایەت. بەدەستوری سوڵتان هەمزاغا ئازاد دەکەنو دەیبەنە لای سوڵتان. هەمزاغا بەجەسارەتەوە سلاو دەکاو چاوەنواری ئەمر دەبێ، سوڵتان بە ووردی تەماشای بەژن‌و بالای دەکات‌و لێ‌ی دەپرسێ بۆچی گیراوی. لە وەلام دا دەڵێت: من چ خراپەم لەخاکی عوسمانی‌دا نەکردوە لە شەڕیشدا نەگیراوم بەڵکو بەفێڵ منیان گرتووەو چ تاوانێ لە خۆمدا شك نابەم. سوڵتان ئازایی‌و نەترسیەکەی زۆر پێ‌خۆش دەبێ‌و دەڵێ: دەتوانی ئەو سوارچاکە جلیت بازەم بۆ بکوژی؟ لە وەلام‌دا دەڵێ دەتوانم بەلام بەدوو شەرت. دەڵێ مەرجەکانت چی‌یە؟ دەڵێ ولاخێ کە خۆم پەسەندی بکەم‌و چەن ڕۆژێ سواری بم‌و پشوودانێ‌ کە نەختێ هێزم بێتەوە بەر.

لەسەر دەستوری سوڵتان دەی‌بەنە تەویلەی تایبەتی لە نێو سەدان ئەسپ‌و ماینی تایبەتی ماینێکی خەزاڵ هەڵدەبژێرێ، پێ‌ی دەڵێن بابە ئەو ماینە تایبەتی خەلیفەیە، دەڵێ ئەگەر دەمدەنێ باشە دەنا سواری چ ولاخێکی دیکە نابم، بەسوڵتانی ڕادەگەیەنن، دەڵێ بیدەنێ. پاش ماوەیەك کە بە ماینەکە سواری دەکات بەهەموو جۆرە مەشقێ پێدەکا دەچێتە لای سوڵتانو دەڵێ ئامادەم، بەلام بۆ ئەوەی زەبری دەستی ئەو کابرایە ببینم دەبێ کەسێ لە پێش‌مندا بچێتە مەیدانو لەگەڵیا بەشەڕ بێت، سوڵتان قبوڵی دەکات‌و لە ڕوژێکی دیاری کراودا ژوانی جلیت بازی بە سوارچاکەکە ڕادەگەیەنن، لەو ڕۆژەدا سوڵتانو وەزیرانو ئەمیرانی عوسمانی‌و کومەلانی خەڵك بۆ بینینی ئەو شاکارە کۆدەبنەوە، لە پێشدا یەکێ لە سوارچاکەکانی تورك دەچێتە مەیدان کابراش دێت بریار دەدات زەبری هەوەڵ سوارچاکی تورك بیوەشێنی، کاتێ جلیتەکەی بۆ دەهاوێژێ کابرا بەگورجی خۆدەخاتە ژێرملی ئەسپەکەی‌و لەولاوە دێتە سەر پشتی کاتێ کە نۆبە بەم دەگات سوارچاکی تورك غاردەدا ئەمیش لە کاتی خۆیدا دەنگی دەداو داری جلیتی بە توندی لە پشت دەداو دەی‌کوژێ. ئەنجا نۆبە بە هەمزاغا دەگات: دەڵێ هەوەڵ زەبر هی ئەوە، کاتێ سوارچاکی بێگانە دەیەوێ جلیتی حەواڵە بکا هەمزاغا خۆی دەهاوێتە ملی ماینە خەزاڵ‌و لەولاشەوە لەپێستی زین قیت دەبێتەوە کابرا جلیتەکەی دەهاوێ بەلام لەبەر سوارچاکی هەمزاغا لە خۆی ناکەوێت‌و گوێ‌ی ماینەکە دەبات، کاتێ نۆبەی هەمزاغا دێت‌و دەنگی دەدا کابرا وادەزانێ کە گورج جلیتەکەی هاویشتووەو لێ‌ی نەکەوتووە لەولاوە دەیەوێ بێتە سەرزین بەلام جلیتەکە هەرپە دەست هەمزاغاوە دەبێ‌و لەو وەختەدا فرسەتی لێ‌دێنی‌و داری حەواڵەی تیرۆغەی پشتی دەکا کە وورگی دەدڕێ‌و لەبەرزگیەوە دێتەدەر.

سوڵتان بانگی دەکات‌و دەڵێ کوردە بەفێڵ کوشتت بەلام ئافەرین، زارت بکەوە، زاری دەکاتەوە، زاری پڕ لە لیرەی زێڕ دەکات‌و خەلات‌و مانگانەیەکی باشی بۆ دەنووسێ کەلە ئەستەمبوڵدا بمێنێتەوە.

کاتێ مەنزڵ‌و ماڵی سازدەکا بەهۆی دۆستانی کوردەوە ژنی ئەحمە بەگی میر ئالا مارە دەکا، لەو سەردەمەدا شەڕی قارس‌و بایەزید لە بەینی رووس‌و عوسمانی‌دا دێتە مەیدانو سوڵتانی عوسمانی هەمزاغا بانگ هێشتن دەکا کەوەك فەرماندەرێکی گەورە دەیەوێ ڕەوانەی جەبهەی بکات، هەمزاغاش لە وەلام دا دەڵێ: من ئەو وولاتەم نەدیوە خزم‌و کەس‌و کارم

دەگەڵ نین ئەگەر سوڵتان ئیجازەم بفەرموێ لە وڵاتی خۆمدا باشتر دەتوانم خزمەت بکەم، لەبەر ئەوە حکومەتی تاران لایەنگری ئیمپراتۆری رووس بوو. خەلیفە جوابەکەی پەسەند دەکاو دڵخۆشی دەداتەوەو خەڵاتی دەکا.

هەمزاغا لەگەڵ خێزانو منداڵەکانی دەگەڕێتەوە بەڵام ئەو نەزمو نیزامەی ئەو دای‌مەزراندبوو تێك چووبوو، قادر ئاغای دێبوکری کە خۆشەویستی هەمزاغاو بە سەرەك عێلی دای نابوو، کەس جوابی نەدەدایەوە، کاکەڵڵاغای برای هەڵخەڵە تابوو، هەمزاغا دەکاتە سەر دیبوکریان کە دەبێ لەفلان رۆژدا لە ماڵی قادر ئاغا کۆ ببنەوە بەگشتی دەچنە ماڵی و شەو بەقسەی خۆش رادەبوێرن تا کاتی خەو، لەو کاتەدا هەمزاغا روو دەکاتە قادر ئاغاو دەڵێ: شەو درەنگەو خەومان دێ تەشریفت بچۆ بۆ ماڵێ با ئێمەش لاقان درێژ کەین.

قادر ئاغا دەچێتەوەو هەمزاغاش بە پیاوێکی خۆی دەڵێ تەشتو مەسینەم بۆ بێنە، بەبەرچاوی هەموو ئاغاواتی دیبوکریەوە لە تەشتەکە دەمیزێو خۆی دەشواو روو دەکاتە ئاغا کانو دەڵێ ئێوە شیاوی ئەوە نین کە پیاو شەرمتان لێ بکا، پیاوتان تەنیا قادرئاغایە کە دەبێ خزمەتی بکەن. بەو شێوەیە دیسانەوە نەزمو نیزامی عەشایری دامەزراندەوە، بەڵام دەوڵەتی داخ لە دڵی ئێران پووازی بۆ پیرەداری کورد کە کوڵەکەیەکی بەسامی لێ‌دەرهاتبوو داتاشی‌و کاکەڵڵاغای برای دۆڕاند بووی، لەلایەکی دیکەوە بۆ نێچیرێکی وا پیلانێکی دیکەی گێڕاو ئەمیر نیزامی کوردی گەڕوسی والی ئازەربایجانی ناردە مەهاباد ئەمیر نیزام وەڵامی نارد کە بۆ چاو پێکەوتنی هەمزاغا دێمە خزمەتی، هەمزاغاش بەڕوو خۆشی‌یەوە بەرەو پیری چوو چەن رۆژ بە خۆشی‌و راووشکار رایان بواردو ئەمیر نیزام بە قورئانی پیرۆز سوێندی بۆ خوارد کە هەتا ئەو لەسەر عەرز بێ، نەهێڵێ تاقە چڵە موویەك لەسەری هەمزاغا کەم بێتەوە!!! پاش ماوەیەك ئەمیر هەمزاغای بانگ هێشت کردو ئەویش زیاتر لەبەر (رقەبەری) دەگەڵ کاکی خایەنی وەرێ کەوت، ئەمیر نیزامی پیرە رێوی بە پێ‌خۆش بوونەوە بەرەو پیری چوو، بەدابی کوردەواری میوانداری کردو چەن رۆژێ بە خۆشی‌و هێمنی رایان بواردو ئەوەندە قسەی خۆشی بۆ کردو یەکێتی‌و کوردایەتی نواند کە دڵی هەمزاغا وەك ئاوێنەی بێ‌گەردی لێ‌هاتو تەواو دڵنیا بوو، هەڵۆی بەرزە فڕی چیا دەستەموببوو ئەمیر نیزام وا دەنوێنێ کە لە خێوەتە گەورەکەی خۆی خەریکی راپەڕاندنی کاروباری وڵاتە، هەمزاغاش لە خێوەتی تایبەتی خۆی‌دا لەگەڵ چەند کەسێ لە خزمانی خۆی قسە دەکا، لەو وەختەدا پێش خزمەتی ئەمیر نیزام کە کورد دەبێ دێتە ژوورەوە زۆر بە ئاسابی دەڵێ: ئاغا ئەمیر دەفەرموێ ئەگەر کاری نی‌یە حەزدەکەم تەشریف بێنێتە لام، لەبەر ئەوەی کە تا ئەو رۆژە چەن جار بەو شێوەیە چۆتە چاوپێ کەوتنی ئەمیر، هەڵدەسێو بەرەو خێوەتی ئەمیر نیزام وەرێ دەکەوێ، غافڵ لەوەی کە چ داوێکی سامناکی بۆ دانراوەو دەوروبەری چۆن تەنراوە.

ئەمیر نیزام دەیزانی کە ئەگەر هەمزاغا دەستی بگاتە چەك یا بەبێ چەکیش ماوەی دەست کردنەوەی پێ بدرێ تا زەربەی خۆی نەوەشێنێ ناکەوێو دەیزانێ دەستی بە ئەمیر بگات وەك هەڵۆ دەی رمێنێو حەقی خۆی دەستێنێ. لەلایەکی دیکەوە زۆر کەس زانیبوی کە سوێندی بە قورئان خواردوەو پەیمانی لەگەڵدا بەستووە لەبەر ئەوە کە لەسەر عەرزدا نەبێ دەستووری دابوو لەلایەکی خێوەتەکەوە کە تایبەتی دانیشتنی خۆی‌بوو چاڵێك هەڵدەکەنن کاتێ ئەمیر نیزام دڵنیا بوو هەمزاغا لە خێوەتەکەی هاتەدەر دەچێتە نێو چاڵەکە. وەختێ هەمزاغا دەگاتە نێو خێوەت، ئەمیر بانگی دەکاو دەڵێ: ئاغا فەرموو: رستەی ئاغا فەرموو رەمزێك دەبێ لە بەینی ئەمیر نیزامو سەربازەکانی دامەزراو لە. مەتەرێزدا، کە وەك: دەستوری دەسرێژ وایە، سەربازەکان بە بیستنی ئاغا فەرموو دەسرێژ دەکەنو تەرمی بەسامی شێرە پیاوی کورد لە خوێنی پاکی خۆی‌دا دەگەوزێ. بەم شێوە نامەردانە بەم رەوشتە فریوکارانە هەمزاغا شەهید دەکرێو پاش کوشتنی سەری دەبڕنو بۆ دیاری دەینێرنە تاران. بۆ پێ تەختی شاهەنشای ئێران. بەو فڕو فێڵە دەوڵەتی ئێران خاتر جەم بوو کەکەسێ خەوی لێ حەرام کردبوون، کەسێ کە قڕی دوژمنی دەکردو عەجەم بە بیستنی ناوی وە لەرزە دەکەوت، سەرداری قارەمانێ کە گەلاڵەی گرتنی پێگە قایمەکانی دادەڕشت ئیدی بۆ هەتا هەتا چاوی لێك ناوە ئیدی هەمزاغای جوامێرو شێرە پیاو نەماوە سەری پڕ شۆڕی وەك بەنرخترین دیاری بە بارگای خوێنمژی شای قاجار پێشکەش کراوە.

**خەیانەتکارانیش لەسەر هەموویانەوە کاکڵ‌ئاغای برای بە وەرگرتنی ئافەرینێکی رووت بەسەر شۆڕی‌و شەرمەزاری‌یەوە گەڕانەوە بەڵام ناوی پیرۆزی هەمزاغا وەك رەفزی ئازایەتی لە فەرهەنگی فۆلکلۆری کوردەواری‌دا جێگیر بووەو رستەی «هەرکەس سمێڵی سوربوو هەمزاغا نیە» لە ووتو وێژی رۆژانەی خەڵکی کۆڵانو بازارو مزگەوتو چاخانەو تەنانەت کانی ژنانیش بەمەبەستی جۆراوجۆر دەوترێو دەوترێتەوە.**

**سەیرو سەمەرەیە کە ئەمیر نیزامی گەڕوسی ئەو کوردە کورد فرۆشەش بەو هەموو زانایی‌و هونەرمەندی‌و ئەدیبی‌یەوە لەبەر چاو کەوتو ئیدی لە مێژووی ئێران‌دا نەخشی نەما. خوێنەری ئازیز: دەزانم لێکۆڵینەوەکەم ناتەواوە بەڵام سەرچاوەم دەست نەکەوت هیوام وایە لاوانی شەرعەمەندی کورد بە شێوەی زانستیانە درێژە بەرێگام بدەنو هەڵیان بۆ برەخسێ**

# وشەی شیعریی لەلای مەحوی

کەریم مستەفا شارەزا

**پێشەکی : مەحوی شاعیرێکی گەورەی کوردە ، یەکێکە لە شاعیرە لووتکەکانی قوتابخانە شیعرییەکەی بابان . ئەو قوتابخانەیەی کە لەدوای بنیاتنانی شاری سولەیمانیو ، ڕەخسانی بارێکی نوێی سیاسیو ئابووریو رۆشنبیری لە میرنشینێتی ی باباندا ، لەسەر دەستی نالی (١٨٠٠ - ١٨٧٢ ؟) دامەزراو سالم (١٨٠٥) - ١٨٦٩)و کوردی (١٨١٢ - ١٨٥٠) بوون بە هاوکاریو ، دەورێکی سەرەکیان گێڕا لە چەسپانی ئەو قوتابخانە نوێیەو ، زۆری پێ نەچوو لە کۆیەو ئەستەمبوول حاجی قادری کۆیی (١٨١٧ - ١٨٩٧) و لە سولەیمانی مەحوی (١٨٣٠ - ١٩٠٦)و لە کەرکووك شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٢ - ١٩١٠) بوون بە تەواوکەری نامەی ئەو قوتابخانە شیعرییەو ، شیعری نیشتمانیو نەتەوەیی لەسەر دەستی حاجیو ، شیعری تەصەووفو فەلسەفەی ئاینی لەلای مەحویو شیعری وەصفو هەجووکاریش لەسەر دەستی شێخ ڕەزا گەیشتە پلەی گەیینو ، بوون بە هونەری پتەوی شیعری ئەو قوتابخانەیە .**

هەرچەندە لە ساڵی (١٩٢٢) ەوە چاپێکی دیوانەکەی مەحوی بڵاوکراوەتەوەو مامۆستای خواڵێخۆشبوو ، عەلائەدین سەجادی ، لە ساڵی ١٩٥٢دا لە (مێژووی ئەدەبی کوردی) دا ، ١٣ لاپەڕەی بۆ ژیانو شیعرو شاعیرییەتی تەرخانکردووەو ، بەئەدەبدۆستو شیعرناسانی کوردی ناساندووەو . لە ساڵی (١٩٧٠) ش دا مامۆستای ئەدیب کاکەی فەللاح لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی بە سێ ئەڵقە لە گۆڤاری (برایەتی)دا بڵاوکردەوەو ، چەند سەرنجێکی وردی لە بارەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە هونەرمەندە صۆفییە ڕاستی پەرستە خستۆتەڕوو ، بەڵام تا لە ساڵی ١٩٧٧دا چاپی یەکەمی دیوانی شیعرەکانی لەلایەن مامۆستایان (مەلا عەبدولکەریمی مودەریسو محەمەدی مەلا کەریم) ەوە ، لە بەرگێکی جوانو قەشەنگو بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیەکی وردی شیعرەکانی بڵاونەکرایەوە ، وا بە چاکی شیعردۆستانی کورد ، مەحوی شاعیری لووتکەو صۆفیو زانای ئایینییان نەناسیو ، لە دوای ئەو هەوڵو کۆششە بەنرخەیان دەستەیەك لە نووسەرو ڕەخنەگران کەوتنە هەڵسەنگاندنی دیوانو پێشەکییەکەیو ، هەر کەسە بەپێی بیرو ڕاو بۆچوونی ، باری سەرنجی خۆی دەربریو ، ئەوی شیاوی باسەو مایەی سەرنج ڕاکێشانە زۆربەی ئەو لێکۆڵەرەوانە ، پتر بایەخیان بە لێکۆڵینەوەی ناوەرۆکی شیعرەکانی داوەو ، بەدەگمەن نەبێ ، ئاوریان لە ڕوخسارو کەرەسەکانی نەداوەتەوە ، بەتایبەتی لە وشەی شیعریی[1] ، کە

کەرەسەیەکی هەرە گرنگ‌و سەرەکی روخساری شیعرە .

بۆیە من لێرەدا ئەم لایەنەم وەرگرت‌و دەمەوێ بەپێی توانا دەست بۆیشتنمەوە شتێك لە بارەی وشەی شیعریی لەلای مەحوی شاعیری ناودار بنووسم ، تاکو بایەخدان بە روخساری شیعرەکانی شان بەشانی بایەخدان بە ناوەرۆکیان بڕوات‌و مافی خۆی پێ بدرێت ، چونکە روخسارو ناوەرۆك یاخود وردتر بڵێین : وشەو مانا دوو دیوی بەرهەمی ئەدەبین‌و هیچ کامێکیان بە تەنیا ناتوانی ئەو بەرهەمە ئەدەبی یە بنیات بنێ .

## دەوری وشە لە دارشتنی شیعردا : —

وشە لە دارشتنی بنیاتی شیعردا دەورێکی سەرەکی هەیە ، چونکە وەك لەمەوبەر دەرمان بڕی ، شیعر دوو دیوی هەیە ، ئەوانیش روخسارو ناوەرۆکن . روخسار : وشەو کێش‌و موسیقای ناوخۆو تەکنیکی دارشتن‌و لە شیعری کلاسیکی‌دا سەرواش دەگرێتەوەو ، ناوەرۆکیش : هەست‌و سۆزو بیرو ئەندێشەو مانای تێکرای شیعرەکە دەگرێتەوە .
ئەگەرهاتو شاعیر کەرەسەیەکی جوان‌و نایابی ناوەرۆکی شیعریی پێبوو ، مەرج نی‌یە هۆنراوەی جوان‌و سەرکەوتووی بۆ بخوڵقێ ، بەڵکو تاکو وەستایانە وشەی گونجاو بۆ ماناو بیرو بۆچوونەکانی هەڵنەبژێرێ ، ناتوانێ لە قاڵبێکی جوان‌و لێوەشاوەی شیعریی دایبڕێژێ‌و ، بەرهەمێکی ناسك‌و بەهێزو پێز پێشکەش بکات .

لێرەدا دەتوانین دەوری وشە لە دارشتنی شیعردا بە دەوری ئەو رەنگە جۆراو جۆرەی بەردەستی وێنەکێشێکی هونەرمەند بچوێنین کە بە تواناو بەهرەی هونەریی خۆیەوە ، بتوانێ بیرو هەست‌و سۆزو ئەندیشەی لەبارەی بابەتێکی دیاری‌کراوەوە لە تابلۆیەکی هونەری‌دا بکێشێ‌و رەنگ‌و روخسارێکی شیاوو گونجاو بەئەدگارو دیمەنەکەی بدات ، تاکو تابلۆیەکی جوان بخوڵقێنێ‌و سەرنجی بینەرانی پێ رابکێشێ .
هەندێ لە سەرچاوەکانی رەخنەی ئەدەبی ، ئەوەمان پێ‌رادەگەیێنن‌و دەڵێن : —
«لێکۆڵینەوە لە ناوەرۆکی شیعر بەندە بە لێکۆڵینەوە لە رووی دووەمی شێوەی دەربڕینی شاعیر ، ئەویش روخسارە ، ئەمەش لایەنی هونەریی‌و وێنەی شیعریی‌و زمان‌و وشەکانی دەگرێتەوەو ، رەخنەگر دەبێ ئەوە ساغ بکاتەوە کە ئایا ئەو وشانەی لە هۆنراوە بەکاریان دێنێ رەوان‌و جوان‌و ناسکن یان نا رەوان‌و بەگرێ‌و گاڵ‌و نارێکن ؟ ئایا ئاسان‌و تازەو نەسواون یاخود گران‌و سواوو ئاڵۆزن ؟»[2] دەبێ رەخنەگری ئەدەبی گەلێ بەوردی‌و هوشیاری ئەمانە لەبەر رۆشنایی «گونجاندنی وشەو ماناکانی بەپێی کۆمەڵە پەیوەندی‌یەکی رەوانبێژیی وەکو لێکچواندن‌و خواستن‌و دژبەك‌و درکەو گەلێ هونەری تر کە دەبنە مایەی رەسەنایەتی داهێنان لەلای شاعیرو . بەجوانی شی بکاتەوەو بیان‌خاتە بەردەستی خوێنەرانی دەقە ئەدەبی یەکەی»[3] .

## وشەی شیعریی لەلای مەحوی شاعیر :

وشەی شیعریی لەلای مەحوی ، هەرچەندە بە شێوەیەکی گشتی هەر لەفەرهەنگی وشەی شیعریی هۆنراوەی کلاسیکی کوردی‌ی سەدەی نۆزدەهەم‌و شێوەی کرمانجی خواروو هەڵێنجراوەو ، هەرچەندە لە قۆناغی ژیانی شاعیردا تایبەتمەندیی شیعرچاکیی خۆی لە جوانی‌ی وشەو پتەوی دارشتن‌و بەهێزیی ناوەرۆکدا دەنواند ، بەڵام زۆربەی شاعیرە کلاسیکی‌یەکانی کورد لەو سەردەمەدا پتر بایەخیان بە وشەئارایی‌و دارشتنی شیعر داوە ، لەوەی بایەخ بە ناوەرۆکی بدەن . کەچی بە پێچەوانەی ئەو شاعیرانەوە ، دەبینین مەحوی شاعیر لە زۆربەی شعیرەکانی‌دا بەتایبەتی لە شیعری کۆمەڵایەتی‌و تەصەووف‌و فەلسەفی‌دا لە وشەی سادەو ساکارو دەربڕینی دوور لە جوانی‌و رازاندنەوە ، بەرهەمی بەنرخی ناوەرۆك بەهێزو پتەوی خوڵقاندوە . بەکورتی مەحوی پتر شاعیری مانای بەرزو جوانە لەوەی شاعیری وشە بێ .

هۆی گرتنی ئەو شێوازە خاکی‌یەیشی دەگەرێتەوە بۆ رێبازە تەصەووفی‌یەکەی کە تێ‌ی‌دا گەیشتبووە پایەی خەلیفەی شێخێکی رابەری رێبازی نەقشبەندی ، شێخێکی ناوداری وەکو (شێخ محەمەد بەهائودینی کوری شێخ عوسمانی سیراجودین)ی تەوێڵەو خۆیشی خاوەنی خانەقا بوو لە شاری سولەیمانی . لە سەرێکی دیکەشەوە فەقێ‌یەکی زیندە زیرەکی زانای هەرە گەورەی کورد (موفتی زەهاوی) بووەو ، ئیجازەی مەلایەتی لە شاری بەغدا لێ‌وەرگرتووەو ، لە ساڵی ١٨٥٩دا بۆ ماوەی ٣ ساڵ کراوە بە مامۆستای مزگەوتی ئیمام ئەعزەم[4] . لە سەردەمێکی زووەوەش بەهرەی شاعیریی تێدا بەدیارکەوتووەو ، شیعری هۆنیوەتەوە ، بەڵام تا لە زانینو

فەلسەفەی ئاینیو تەصەووفدا پایەی وا بەرزنەبۆتەوە ، نەبووە بەو شاعیرە لووتکەیەی کە تا ئەمڕۆ ئەدیبو شیعرناسانی کورد هەر خەریکی تێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی شیعرە بەهێزو پتەوەکانینو هێشتا بە تەواوی دەرەقەتی نەهاتوونو نەگەیشتوونەتە ئەنجامێکی دیارو چەسپاوی یەکلاکراو . چونکە شاعیرێك بووە بەهێزی بەهرەی شاعیریی خۆیو بە باڵی زانینی ئاینیو تەصەووف لە ئاسمانی شیعری رەسەنی کوردیدا کەوتوتە پەروازو فرینو ، لە ئازاردانی نەفسی خۆیدا خۆشیی وەرگرتووەو ، لە پیاڵەی غەمی زەمانە ، شەربەتی خۆشەویستیی خودایی نۆشیوەو لە ئەنجامی ئەم موعاناتەی گەلێ جار لە وشەی رەقو نارێك شیعری ناسكو جوانو رێكوپێكی خوڵقاندووە .

لە بارەی شاعیریو زانایی مەحوییەوە هەندێ لە نووسەرو ئەدیبانی کورد بەم جۆرە لێیەوە دواون ، هەیە دەڵێ:مەحوی ئەوەندەی شاعیرە ئەوەندەش زانای ئاینییەو ، ئەوەندەش کە زانایە شاعیرە»[٥] ئەم رایەش لەوەوە سەری هەڵداوە کە لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی مەحوی کارێکی گرانـەو بەهەموو کەسێك ناکرێ ، مەگەر بەو کەسانەی کە ئاگاداری هەموو لایەنێکی ئەدەبیو فەلسەفی جیهانی مەحوی شاعیری لووتکە بن ئەنجام بدرێ .

(گۆران)ی شاعیری نەمری کورد ، لەبارەی رێچکەی شیعردانانو قووڵی بیرو وردیی واتاو وشەکانییەوە گوتوویەتی : «دەڵێن مەحوی هۆنراوەکانی لەسەر رێچکەی هیندی ووتوە لە قووڵی بیردا ، لە وردیی واتادا ، لە رێكو پێکی وشەکانیدا زۆر هونەری نواندووە»[٦] .

مامۆستای خوالێخۆشبوو عەلائەدین سەجادی لە بارەیەوە گوتوویەتی :

«مەحوی شاعیرێکی وردەکار بووە ، بەڵام ئەم وردەکارییەی ئەگەر تێکەڵاو بە فەلسەفەی تەصەووف نەکردایە ، نەی ئەتوانیّ بستێ بەولاوە بچیّو . هەروەها قسەی نەستەقو جیناس پەروەریش بووە ، دیسان ئەویش تا بە تەصەووف ئاوی نەدایە هەر بۆی نەهاتووە»[٧] .

وەك سەرنجدەدەین ، دەبینین ئەو نووسەرانە بیرو رای خۆیان لەبارەی مەحوییەوە دەربڕیوە ، بە زۆری بە شاعیرێکی وردەکار و شارەزایێکی فەلسەفەی تەصەووفیان داناوەو لە هونەری شیعردا گرنگیی بە قووڵی واتاو رێكو پێکی وشەکانی داوە . من زۆربەی لایەنەکانی ئەو بیروڕایانەم لەبارەی مەحوییەوە لا ڕاستە ، بەڵام ئەوەی من ئاسەر لەگەڵیاندا نیم ئەوەیە ، کە دەڵێن : لە رێكو پێکی وشەکانیدا زۆر هونەری نواندووە . چونکە ئەگەر شاعیر لە هەندێ لە شیعرە دڵدارییەکانیدا ئەمەی پەیرەوکردبێ ، دەبینین لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا بەتایبەتی لە شیعری تەصەووفو ئاینیو کۆمەڵایەتیدا ئەوەندەی گرنگیداوە بە قووڵی مانا ئەوەندە گرنگی نەداوە بە جوانیو رێكوپێکی وشەکانیو ، زۆر جار وشەی بە قوربانی مانا کردووە ، تاکو بتوانێ فەلسەفەی تەصەووفەکەی باشتر لە هۆنراوەکانیدا دەربڕێو ، وشە ڕێ لە بیرو بۆچوونەکانی نەگرێ . بۆیە دەبینین گەلێ جار لە وشەو دەربڕینی ئاسایی دوور لە جوانیو رازاندنەوە ، شیعری جوانی ناوەرۆك بەهێزو پتەومان بۆ دادەڕێژێ ، هەروەك لەمەودوا دەریدەخەین .

**چۆن مەحوی وشەی شیعریی بەکارهێنازە ؟**

مەحوی شاعیری زانای ئاینیو صۆفی بە چوار جۆری سەرەکی وشەی شیعریی لە هۆنراوەکانیدا بەکارهێناوەو ، تا رادەیەکی باش لەهەموو جۆرە بەکارهینانەکانیدا سەرکەوتووەو ، بەرهەمی شیعریی پتەوی پێشکەش بە شیعرناسانی کورد کردووەو سەرنجی رەخنەگرانی ئەدەبی کوردی راکێشاوە ، وەکو ئەمانە : -

**( أ ) . بەکارهێنانی وشەی شیعریی جوان لە داهێنانی هۆنراوەی جواندا :-**

شاعیر ئەم جۆرەبەکارهێنانەی لە شیعرە دڵدارییەکانیدا پەیرەو کردووە ، لە وشەی جوانو ناسکی شیعریی هۆنراوە جوانو رازاوەی پڕ مانای بەهێزو پتەوی دارشتووە ، هەروەك لەم نموونە شیعرانەی خوارەوەیدا دەردەکەوێ : -

١) . لە لاپەرە (١٣)ی دیوانەکەیدا ، هۆنراوەیەکی دڵداریی ناسکی دەست - پێدەکاتو ، وەك شاعیرە هاوچەرخەکانی لە وشەی جوانو ناسك شیعری بەهێزو جوانمان پێشکەش دەکاتو ، لە سەرەتادا دەڵێ : -

**ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵڕەنگت لە گوڵ چ بکا ؟**
**کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ ، بولبول لە چڵ چ بکا ؟ !**

کە لەم دێرە شیعرە ورد دەبینەوە ، دەبینین لەکۆمەڵە وشەیەکی شیعریی جوانی وەکو (دڵ ، شەراب ، گوڵ ، گوڵشەن ، لەعلی گوڵڕەنگ ، جیلوە ، بولبول ، چڵ) پێك هاتووەو ، هەموویان کەرەسەی روخساری جوانیو بەشدارییان لە دروستبوونی شیعری جواندا کردووەو ، کاتێ لە دێری دووەمی هۆنراوەکەش وردەبینەوە کە دەڵێ : -

**کە هەڵگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە**
**نەچێتە سەر تەریقەی حەزرەتی پەروانە دڵ چ بکا ؟**

دەبینین لەم دەستە وشە جوانەی خوارەوە دروستبووە :

(هەڵگیرسا ، نوور ، بادە ، شەمع ، حوسن ، جانانە ، تەریقە ،

حەزرەت ، پەروانە ، دڵ) ئەمانەش کەرەسەی جوانو سروشبەخشن بنیاتی شیعرە ناسكو جوانەکەی‌دا .

کاتێ لە دێرە شیعری هەشتەمی هۆنراوەکەش ورد دەبینەوە کە دەڵێ :-

**چ حاجەت نەرگسی مەستت بکەم وەصفی بە مەخمووری**
**کە چاوی سەرمەکێشراوی خودایی بێ ، لە کل چ بکا ؟ !**

دەبینین لەم دێرەشی‌دا وشەو دەربڕینی جوانو ناسکی وەکو (نەرگسی مەست ، مەخموور ، چاوی سورمەکێشراوی خودایی ، کل ) بوون بە کەرەسەی جوانی هەیکەلی شیعرەکەو بە مایەی ماناو ناوەرۆکێکی جوان بۆی .

٢- لە لاپەرە (٢٠) دا ، لە هۆنراوەیەکی دیکەی‌دا ئەم دێرە شیعرەی هاتووەو دەڵێ :-

**خەندەی لەبو عەبیری‌خەتی تۆ بوو وەك منالْ**
**تۆوی‌تکا کە غونچە ، وەنەوشە ملی شکا ! !**

دەبینین وشەو دەربڕینی جوانو ناسکی وەکو (خەندە ، لەب = لێو ، عەبیری خەت ، غونچە ، وەنەوشە) کەرەسەی جوانی دارشتنی شیعرەکەن .

٣- لە لاپەرە (٧٤) داو لە سەرەتای هۆنراوەیەکی دیکەی‌دا ئەم دێرە شیعرەی خوارەوەی گوتووە :-

**خەرامی ناز ئەگەر هێنایە لەنجە سەروی مەوزوونت**
**وەکو لەیلا ، لەسەر ڕێ پرسشێ کە حاڵی مەجنوونت**

دەبینین بە وشەو دەربڕینی ناسکی وەکو (خەرامی ناز) واتە : ڕۆیشتنی بە نازی و (لەنجە) و (سەروی مەوزوون) و (لەیلا) و (مەجنون) ی عاشیق ، بنیاتی شیعرەکە دادەڕێژێو جوانترین واتایشی بەبەردا دەکاتو لە دێرە شیعری دووەمی‌دا دەڵێ :-

**دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ ،**
**وەگەرنا ، غەم نی‌یە بمرم ، لە حەسرەت لێوی مەیگوونت ! !**

لێرەش‌دا وشەو دەربڕینی وەکو (گەردی خوێن) و (شیشەی گەردن) و (لێوی مەیگوون) واتە : لێوی وەکو مەی سوور ، جوانن‌و وشەی وەکو (غەم) و (حەسرەت) یش هەرچەندە خۆشی نابەخشن ، بەڵام بۆ ڕاگرتنی بەرانبەر بە خۆشی‌و شادی ، ئەوانیش وەك وشەی جوانو خۆش لە بنیاتی شیعرەکەدا خۆیان دەنوێنن‌و ئەمە لەبارەی وشەوە ، دەبا بزانین لەبارەی ماناشەوە چۆن ئەمانەبوون بە مایەی جوانی واتای شیعرەکەو ، مەبەستی گشتی‌ی شیعرەکە چی‌یە ؟ لە وەڵام‌دا دەتوانرێ بەم جۆرە مانای لێ بلرێتەوەو بگوترێ : «من خەمی ئەوەم نی‌یە لەتاو لێوی سووری تۆبمرم ، بەڵکو لەوە دەترسم تۆزی خوێنی وشك‌بوەوەم لە گەردنی سافو لووسی وەکو شوشەت بنیشێو ببێتە تۆباڵی تاوانی کوشتنەکەم» .

٤- لە لاپەرە (١٣١) دا ، لە دێرە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دا دەڵێ :-

**سیاپۆشن لە داخی خەططو خاڵو لێوو ڕووو زوڵفت**
**وەنەوشەو میسکی چینو ئاوی خضرو لاڵەوو عەنبەر**

وشەو دەربڕینەکانی (خەت) و (خاڵ) و (لێو) و(ڕوو) و (زولف) لە نیوە دێری یەکەم‌دا بەرانبەر بە (وەنەوشە) و (میسکی چین) و (ئاوی خضر) واتە : ئاوی ژیانو (لالە) و (عەنبەر) کراونو ، هونەری پێجانو کردنەوەیەکی ڕێکیان پێکەوەناوەو (خەت بە وەنەوشە) و (خاڵ بە میسکی چین)و (لێو بە ئاوی حەیات : ژیان) و (ڕوو بە لالەی ئاڵ) و (زوڵف بە عەنبەر) چوێنراون ، هەمووشیان وشەی شیعری جوانن‌ودێرە شیعرێکی جوانو ناسکیان بنیاتناوەو ، مانایێکی پتەویان بۆ دروستکردووە

٥- لە لاپەرە (٢٢٣) دا لە هۆنراوەیەکی‌دا ئەم دێرە شیعرەی گوتووە :

**لە کن پشکووتنی غونچەی دەمی ، وەك گوڵ ، سەراسەر گوێم**
**گوڵی ڕوخساری دەرخا ، نێرگس ئاسا ، سەربەسەر چاوم ! !**

مەبەستی ئەوەیە (کە غونچەی دەمی یار دەپشکوێو قسەیەکی‌دەکا ، هەموو گیانم وەك دەکرێتەوەو دەبێ بە گوێ بۆ بیستنی ئەو قسەیە . کە گوڵی ڕوویشی دەردەخا ، هەموو گیانم دەبێ بە چاوو وەك نێرگز مەستی تەماشا کردنی دەبێ»[8] .

دەبینین ئەم دێرە شیعرەش لەم وشە جوانە شیعریانە پێك‌هاتووە :- (پشکووتن) ، (غونچە) ، (دەم) ، (گوڵ) ، (گوڵی ڕوخسار) . (نێرگس) ، (چاو) و ماناکەیشی وەك بۆت دەرکەوت لەم وشە ناسکانە وەشاونەتەوە .

٦- لە لاپەرە (٣١٥) دا ، لە سەرەتای هۆنراوەیەکی تری‌دا ئەم دوو دێرە شیعرەی خوارەوەی گوتووە :-

**دڵی بردم بە شۆخی دولبەرێکی تازە ، سەرلەنوێ**
**موبارەك‌بێ لە دڵ سەودایەکی کەی کەوتەسەر لە نوێ**

**کەچ ئەبرۆ ، دیدە ئاهوو ، شۆرشین خوو ، فیتنەجو ، تورکێ**

**خورۆش‌و شۆرو شین خسته ئاو ئه‌هلی نه‌زور له نوێ**
**دمبتین له دێری یه‌کەمی ئه‌م وشه شیعریی یانه‌ی دڵ ، شۆخ**

(دولبه‌ر ، تازه ، سه‌له‌نوێ ، موباره‌ك ، سه‌ودا ، نوێ) بوونه‌ته که‌ره‌سه‌ی بنیاتی دێره شیعره‌که‌و ، له دێری دووه‌میشی‌دا وشه‌کانی (که‌چ ، ئه‌برۆ ، دیده ، ئاهوو ، شۆرشین خوو واته : تووره ، خورۆش ، شۆر ، شین ، ئه‌هلی نه‌زه‌ر ، واته : عاشیقی ته‌ماشاکه‌ر) ئه‌مانه هه‌موویان به‌شدارییان له دارشتنی شیعره‌که کردووه‌و ، له‌گه‌ڵ مانا جوان‌و ناسکه‌که‌ی‌دا لێك‌وه‌شاونه‌ته‌وه .

ئه‌مانه‌چه‌ند نموونه‌یه‌ك بوون له شیعری جوانی له‌سه‌ر وشه‌ی ناسك‌و جوان دامه‌زراو له‌لای مه‌حوی شاعیرو ئه‌م دیارده‌یه‌ش به زۆری له شیعری غه‌زه‌لی دڵداری‌دا خۆی ده‌نوێنێ‌و له شیعری فه‌لسه‌فی‌و ته‌صه‌ووف‌و کۆمه‌ڵایه‌تی به‌ره‌و کزی ده‌چێ‌و مانا له ووشه‌کانی به‌هێزترو جوانتر ده‌بن .

**(ب) به‌کارهێنانی وشه‌ی دووباره‌کراوه له شیعردا :**

مه‌حوی له دارشتنی شیعردا زۆر جار وشه‌ی دووباره‌و سێ‌باره کراوه‌ی به‌کارهێناوه‌و به‌بێ ئه‌وه‌ی به‌م کاره‌ی بارگرانی‌و ناشیرینی به‌سه‌ر شیعره‌کانی بێنێ ، به‌ڵکو به پێچه‌وانه‌وه ، جۆره جوانی‌یه‌کی به روخسارو به ناوه‌رۆکی هۆنراوه‌کانی داوه‌و ، له بواری به‌کارهێنانی ئه‌م جۆره وشه دووباره‌کراوانه دوو مه‌به‌ستی سه‌ره‌کی بووه ، ئه‌وانیش ئه‌مانه‌ن :-

یان بۆ مه‌به‌ستی پێکه‌وه‌نانی شیعری به‌هێزو جوان بووه ، یاخود له پێناوی پێکه‌وه‌نانی هونه‌ری جوانکاری ره‌وانبێژی ئه‌مه‌ی کردووه .

١- به‌کارهێنانی وشه‌ی دووباره‌کراوه له‌پێناوی شیعری جوان‌دا :-

بۆ ئه‌م جۆره به‌کارهێنانه‌ی هه‌ندێ نموونه‌ی پته‌ومان له شیعری مه‌حوی له‌به‌رده‌ست‌دایه ، وه‌کو ئه‌م دێره شیعرانه‌ی خواره‌وه‌ی :-

ا- له غه‌زه‌لێکی‌دا که به‌م دێره ده‌ست‌پێ‌ده‌کات ، ده‌ڵێ :-

**که بێ لێوی له‌سه‌ر لێوم بنێ رۆحم له‌سه‌ر لێوه**
**که‌لێوی‌لابه‌رێ ، ئه‌لبه‌ته رۆحم ده‌رده‌چێ پێوه(٩)**

وه‌ك سه‌رنج‌ده‌ده‌ین ، ده‌بینین له‌م دێره شیعره‌ی‌دا دوو جار وشه‌ی (رۆح و دوو جار فره‌یزی (له‌سه‌ر)و چواریش وشه‌ی (لێو)ی تێدا به‌کارهێناوه‌و ، ده‌بوایه ئه‌م دیارده‌یه‌ی دووباره‌کردنه‌وه‌ی وشه ببێته مایه‌ی وه‌ڕه‌س‌بوونی خوێنه‌ر یاخود گوێ‌گرو جۆره کزی‌یه‌ك بدات به روخسارو ناوه‌رۆکی شیعره‌که که‌چی به پێچه‌وانه‌وه جۆره پته‌وی‌و جوانی‌یه‌کی پێداوه‌و له شیعره جوانه‌کانی شاعیر ده‌ژمێردرێ .

ب - یاخود که له‌م دێره شیعره‌ی‌دا سێ جار وشه‌ی (ئه‌و)و پێنج جاریش وشه‌ی (که‌س) به‌کاردێنێ‌و ده‌ڵێ :-

**چ بکه‌م نه ئه‌و که‌سه‌م که که‌سم بێ له‌لا به که‌س**
**خۆشم نه‌گه‌یه‌ئه‌و که‌سه‌ئه‌و من بکا به‌که‌س(١٠)**

له دێری دووه‌می شیعره‌که‌شی‌دا دوو جار وشه‌کانی (رۆح) و (که‌س) دووباره ده‌کاته‌وه‌و ، له‌جیاتی کزیی ، هه‌ست به جۆره جوانی‌و خۆشی‌یه‌کی ناوه‌رۆکی هه‌ردوو دێره‌که ده‌که‌ین‌و ده‌ڵێ : -

**گه‌ر ئیشی رۆحته که نه‌بوو که‌س به ده‌سته‌وه**
**ده‌ست‌هه‌ڵگره له رۆح‌و مه‌به ئیلتجا به که‌س**

ج - له لاپه‌ره (٢٢٧) دا ، ئه‌م دێره شیعره‌ی گوتووه‌و سێ جار وشه‌ی (حه‌ق)و دوو جاریش وشه‌ی (ناحه‌ق)ی به‌کارهێناوه‌و ، ده‌بینین ناوه‌رۆکێکی پته‌وی به گیانی ته‌صه‌وف ئاودراو بۆ دێره شیعره‌که خوڵقاندووه‌و گوتوویه‌تی :-

**به حه‌ق هه‌ر حه‌ق ، به ناحه‌ق ناحه‌قم وتوه له رۆژێ بووم**
**وه‌کو مه‌نصوور ئه‌گه‌ر بیشمکوژن ناکه‌م له حه‌ق لاده‌م !**

شاعیر ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌برێ که له‌وه‌تی هه‌یه هه‌ر لای هه‌قه‌و دژی ناهه‌ق وه‌ستاوه ، بام وه‌کو مه‌نصووری هه‌لاجیش له‌سه‌ر هه‌ق له داریش بدرێ‌و بشکوژرێ هه‌ر له هه‌ق لانادات‌و راستی ده‌وێ .

د- له لاپه‌ره (٧٧)ی دیوانه‌که‌دا ، له دێره شیعرێکی‌دا سێ‌جار‌وشه‌ی (غه‌م)ی به‌کارهێناوه‌و جارێکیش بووه به وشه‌ی (به‌غه‌م) واته : به خێوکردن‌و له جیاتی کزیی مانا ، جوانی ناوه‌رۆکی به شیعره‌که به‌خشیوه‌و . ده‌ڵێ :-

**غه‌می خۆشی نی‌یه (مه‌حوی) له دڵیا ، هه‌ر غه‌می تۆیه ،**
**له عیشقت‌دا ده‌که‌م غه‌م بۆ به‌غه‌م ، بڕوانه چۆنم بۆت ؟**

هـ - له لاپه‌ره (١٣٠) دا له دێره شیعرێکی‌دا سێ جار وشه‌ی (ئه‌هل) ی به‌کارهێناوه‌و دوو جاریش وشه‌ی (دنیا)و ده‌ڵێ :-

**ئه‌وه‌نده‌ی ئه‌هلی دنیان ، ئه‌هلی دنیا تاقه رۆژێ گه‌ر**
**به قه‌رنێ من ئه‌وه‌ند ئه‌هلی خوا بم ده‌بمه پێغه‌مبه‌ر**

له نیوه دێری یه‌که‌م‌دا دوو جار ده‌ڵێ (ئه‌هلی دنیا) یه‌که‌م جار مه‌به‌ستی له (خه‌ڵك) ه‌و دووه‌م جاریش مه‌به‌ستی له‌و که‌سانه‌یه که دنیایان ده‌وێ یاخود ده‌نائه‌ت‌و سووکین‌و جاری سێ‌یه‌میش که ده‌بێته (ئه‌هلی خودا) مه‌به‌ستی له‌و که‌سه‌یه که خواپه‌رسته ، ئه‌م دووباره کردنه‌وه‌یه . شیعره‌که‌ی جوانتر کردووه ، نه‌ك تووشی کزیی‌و لاوازیی کردبێ .

و - له لاپه‌ره (٥٩) دا ، له دێره شیعرێکی هۆنراوه‌یه‌کی‌دا سێ جار وشه‌ی (ده‌رد) ی به مانای نه‌خۆشی‌و دوو جار وشه‌ی (نه‌هاتن) ی بۆ نه‌هاتنی یاره‌که‌ی به‌کارهێناوه‌و جارێکیش (نه‌هات) ی به مانای نه‌گبه‌تی کردووه به سه‌روای شیعره‌که‌ی‌و ده‌ڵێ :

**ئەو نەهاتن دەردە ، داغی ئەو نەهاتن دەردەها**
**کەس بە دەردی من نە چیٚ ، وەك من نەبیٚ تووشی نەهات**

مانەکەیشی جوانو تەواوەو دەڵیٚ : نەهاتنی یارەکەم نەخۆشی‌یەکەو داغی ئەو نەهاتنەیشی نەخۆشی‌یەکی دیکەو ، خودایە کەسێ تووشی دەردی من نەبیٚ ، بە نەهاتنی یار تووشی کارەساتو نەگبەتی نەبیٚ .

**٢- بەکارهێنانی وشەی دووبارەکراوە لەپێناوی رەوانبیٚژی‌دا :-**

گەڵیٚ جار مەحوی شاعیری هونەرمەند وشەی شیعری لەپێناوی پێکەوەنانی هونەری جوانکاری رەوانبیٚژی دووبارە کردۆتەوەو ، بەم کارەیشی هەندیٚ هونەری جوانکاری وەك رەگەزدۆزی پێکەوەناوەو ، جۆرە هیٚزو جوانی‌یەکی داوە بە شیعرەکانی ، چونکە مامڵەت‌کردنی لەگەڵ هونەرەکانی جوانکاری‌دا تایبەتمەندی‌یەکی دیاری شیعری کلاسیکی کوردی بووەو پیٚوانەی سەرکەوتنی شاعیر بووە لە کرداری شیعرووتن‌دا ، هەروەك لەم نموونە شیعرانەی خوارەوەی‌دا دەردەکەون :-

ا - لە لاپەرە (٥٩) ی دیوانەکەی‌دا ، دیٚرە شیعریٚکی گوتووەو دوو جار وشەی (نەبات)ی تیٚدا بەکارهێناوە ، یەکەمیان : بە مانای جۆرە شەکریٚکی شیرینەو ، دووەمیشیان : بە مانای (نەهێنان) دیٚ ، وەك ناو نەهێنانو دەڵیٚ :-

**عەنبەری سارای ووتم : زوڵفی ، (نەبات) ی میصری لیٚو**
**زوڵفی ئاڵۆزا ، ووتی: لیٚوی کە ناوی من (نەبات)**

بەم دوو جۆرە بەکارهێنانەی ، لە نیٚوانی وشەی (نەبات) ی یەکەمو (نەبات) ی دووەم‌دا هونەری رەگەز دۆزی تەواو (جناس‌تام) هەیە .

ب - لە لاپەرەی (١٢٣) دا دیٚرە شیعریٚکی گوتووە، دوو جار وشەی (چار)ی بەکارهێناوە ، بە مانای (چارەو عیلاج)ەو ، دوومیشیان بە مانای (قەیسەری رووس)ەو ، هەروەها وشەی (ناچار) یش هاتووەو ، دەڵیٚ :-

**چاری قەدەر بزانە نی‌یە ، چەندە چاری وا**
**بیٚ‌چارە مابوو بە دو پەنجەی قەزا دوچار**

لەنیٚوانی وشەی (چار)ی یەکەمو (چار) ی دووەم‌دا رەگەزدۆزی تەواو هەیەو ، لە نیٚوانی (چار) و (ناچار) یش رەگەزدۆزی ناتەواو هەیەو شیعرەکەیان بە هیٚزکردووە .

ج - لە لاپەرە (٢٤٢) دا دیٚرە شیعریٚکی گوتووە ، دوو جاران وشەی (دامان)ی بەکارهێناوەو ، دەڵیٚ :-

**هەموو عالەمە پابەندو لە دامان**
**کەچی دەستی کەست نا گاتە دامان**

لەنیٚوانی هەردوو وشەی (دامان)دا رەگەزدۆزی تەواو هەیەو ، (دامان)ی یەکەم بە مانای (لەدواوەتن) دیٚو (دامان)ی دووەمیش بە مانای (داویٚن) دیٚ.

د - لە لاپەرە (٢٧٧)دا دیٚرە شیعریٚکی گوتووەو لە سەرەتاو لە کۆتایی‌دا وشەی (غوڵامانە)ی بەکارهێناوەو گوتوویەتی :

**(غوڵامانە) سەرم دانا لە بەرپیٚ ... روی**
**کەچی ئەو هەر منی خستۆتە پشت گویٚ وەك (غوڵامانە)**

وەك نۆکەرو خوڵامو ، (غوڵامانە)ی دووەم بەمانای کاکۆڵ رەگەزدۆزی تەواوی پێکەوەناوە .

هـ - لە لاپەرە (٢٨٣)دا لەسەرەتای هۆنراوەیەکی‌دا دەڵیٚ :

**لەسەیری خەستەخانەی عیشق ، ئەوی سەوزەی کەواشینە**
**لەسەرهەر خەستە دیٚ یاخوێندنی یاسینە یا شینە ! !**

دەبینین شاعیر دوو جار وشەی (شین)ی بەکارهێناوە . یەکەمیان بە مانای (رەنگی شین)و دووەمیشیان بە مانای (شیوەن) هاتووەو لە نیٚوانی هەر دووکیان‌دا رەگەزدۆزی‌یەکی تەواو هەیە .

و - لە لاپەرە (٢٨٢) دا لە دیٚرە شیعریٚکی‌دا دووجار وشەی (رووت)ی بەکارهێناوەو ، یەکەمیان بە مانای (بیٚ بەرگو پۆشاك) دیٚو . دووەمیشیان بە مانای (رووی تۆ) دیٚو ، لە نیٚوانی هەردووکیان‌دا رەگەزدۆزی تەواو هەیەو دەڵیٚ :-

**وتم : بۆرووتو پووتن ئەو کەسانەی عاشیقی رووتن**
**وتی : شانو شکۆهی زیندە دڵ هەر ژەندە پۆشینە**

ز - لە لاپەرە (١٠١) دا ، دیٚرە شیعریٚکی هەیەو دوو جار وشەی (زار)ی بەکارهێناوە ، یەکەمیان بە مانای (نارەحەت) و (زار)ی دووەمیش بە مانای (دەم) دیٚو لە نیٚوانی هەردوو (زار) دا رەگەزدۆزی تەواوی پێکەوەناوەو ، دەڵیٚ :-

**پرسشی‌کا حاڵی (زار)ی ئیٚمە ، (زار)ی کردەوە**
**لەو ددانانە کە دەدرەوشایەوە نەجمی فوتووح**

**بەکارهێنانی وشەی ناشیعری لە دارشتنی شیعری جوان‌دا**

هەرچەندە ئێمە ناتوانین بەر لە بەکارهێنانی وشە لە دارشتنی شیعردا بڕیاری خۆمانی بەسەردا بدەین و بڵێین: ئەمە وشەیەکی جوان و ناسکی شیعرییەو، بۆ دارشتنی شیعری پتەوو جوان دەشێ و، ئەوەی دیکەیان جوان و پڕ ماناو گەش و گوڵ نییەو بۆ شیعر ناشێ. چونکە جوانی و بەهێزیی وشەو ناسکی وەختێ بەدیاردەکەوێ کە شاعیر لە دارشتنی شیعرەکەیدا بەکاری دێنێ و بەندە بە هونەرمەندیی و دەستەڵاتی شاعیرییەوەوە. دەتوانین بڵێین وشەش لە بازاری شیعردا نرخ و بەهای بە جێگەو چۆنیەتی مامڵەت لەگەڵ کردنیدا دەگۆڕێ و ناوەڕۆکی شیعرە فەلسەفییەکەی حەمدی صاحیبقران (١٨٧٨ - ١٩٣٦)ی بە جوانی بۆ دەگونجێ کەدەڵێ :-

**بازاڕی دەهرە ، قیمەتی ئەشیا بە جێگەیە**
**مێشێ گەیشتە ڕووی نیگارێ لە خاڵ ئەچی**[11]

لێرەدا دەتوانین بڵێین : وشەی ناشیرین و کەم نرخ وەکو مێش وایە، ئەگەر لە دەربڕینێکی ناشیرین بەکارهات، ئەوا ناشرین و بێ بەها دەردەچێ و. ئەگەر بە جۆرێکی جوان لەپاڵ وشەی بەنرخ و پتەو بەکارهات ئەوا ئەویش نرخ پەیدادەکات و، وەکو ئەو مێشە وایە کاتێ لەسەر ڕووی ئافرەتێکی جوان دەنیشێ خۆی وەکو خاڵێکی ڕەشی سەر گۆنای دەنوێنێ ! !

بەڵام کە هەڵفڕی و نیشتە سەر شتێکی پیس و کەم نرخ، ئەوا خۆی وەك زیندەوەرە ناشیرین و پیسەکەی جاران دەنوێنێتەوە.

هەر بەوچەشنەش گەلێ وشەی ناشیرینی وەکو جنێو کە لە بنیاتی شیعری هەجوکاری یا کۆمەڵایەتی یا فەلسەفیدا، بەرانبەر بە وشەی جوان و پتەو دادەنرێن و هونەری جوانکاریی ڕەوانبێژییان لێ بێك دێ. هەستدەکەین ئەوانیش نرخ و ڕووەتێك پەیدادەکەن و خۆیان جوان دەنوێنن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین وەك دەستوورێکی گشتی ئەم چەند هەڵ و مەرجانەی خوارەوە بکەین بە پێوانەی دەستنیشانکردنی وشەی شیعریی جوان و پتەو :-

١- وشەیەك بێ سروشێکی خۆش و هەستێکی ناسك بداتە گوێگرو خوێنەر. لەگەڵ ماناکەیدا لێك بوەشێتەوە. وەك ئەوەی بڵێی ناوی بەرجەستەی ناسك. یا ناوی گوزارەیی سرووش بەخش بێ. یاخود ڕەمزو نموونەی مێژوویی. یا ئەفسانەیا داستانی کەلەپووری نەتەوایەتی بێ.

٢ لەگەڵ وشەکانی پێش و پاشیدا بەجوانی خۆی بنوێنێ و بەرێکی بگونجێ و هیچ ناسازییەکی لەگەڵیاندا نەبێ.

٣ لە بنیاتی شیعردا دوو جۆرە کێشی نەبێ. واتە : دوو جۆرە خوێندنەوەی نەبێ. تاکو لە دێڕە شیعرەکەیدا نەخوڵقێنێ.

٤- پێشگر یا ناوگر یاخود پاشگری وای پێوە نەبێ وشەکە بارگران بکات.

ئێستاش هەندێ نموونە لەسەر ئەو جۆرە وشانە لە شیعرەکانی مەحوی دێنینەوە تاکو بزانین چۆنی بەکارهێناون و چۆن خۆی لەو ناتەواوییانەی وشە ڕزگارکردووەو بە سەریاندا زاڵبووە ؟

**١- بەکارهێنانی ئەو جۆرە وشانەی بە تەنیا سرووشێکی خۆش نادەن :-**

مەحوی بە پێچەوانەی شاعیرانی سەردەمی خۆی، هەندێ جار خۆی بە هەڵبژاردنی وشەی شیعرییەوە ماندوو نەکردووە، ویستویەتی عەفەوی چۆنی بۆ دێ ئاوا بەکاریان بێنێ. بەڵام کە بەکاریشیان دێنێ ناوەڕۆکێکی جوان و بەهێز بۆ شیعرەکەی دەخوڵقێنێ، وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە :-

ا - لە هۆنراوەیەکیدا وشەی لێکدراوی (چەرمەکەر) ی بەکارهێناوەو کە بەتەنیا وەریدەگرین بە وشەیێکی شیعریمان نایەتە بەرچاو، هەروەك لەم دێڕە شیعرەیدا کردوویەتی و دەڵێ :-

**کەی لەکن ئەحمەق دەبێ حاجەتی دانا ڕەوا**
**قەت دەکرێ (چەرمەکەر) یا بە عەبا یا کەوا؟ !**[12]

کاتێ لێی ورددەبینەوە هەستدەکەین ئەم وشە ناسازە وەختە موسیقای نیوەدێڕە شیعرەکە تێكبدات، بەتایبەتی کە وشەکانی (عەبا) و (کەوا)ی بەدوادا دێ. بەڵام چونکە ناوەڕۆکی بەهێزەو لە ئادەمیزادی نەفامەوە دەدوێ کە کاری باشی پێ جێبەجێ ناکرێت و، وەکو «چەرمەکەر» وایە بەکەڵکی هیچ نایەت و، چ بەرگێکی ی دروستناکرێ.

ب- وشەی وەکو (تیرۆك) و (نۆك) کە بەتەنیا وەرگرین وا دەزانین کەبخرێنە شیعرەوە، سرووشێکی خۆش نادەن بە دەستەوەو. وشەی (تیرۆك) بیر لێکدانەوەمان بۆ مەسەلەی نانکردن دەبات و. وشەی (نۆك) یش بۆ دنیای کشتوکاڵ و دانەوێڵەمان دەبات. کەچی دەبینین بەم جۆرە بەکاریان دێنێ و دەڵێ :-

**زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە (تیرۆك)**
**لەتێ نانت دەداتێ دوو بەشی (نۆك)**[13]

هەستدەکەین وشەی (تیرۆك) دەورێکی ڕەوانبێژی دەبینێ و هونەری (درکە) دروستدەکات. بەوەی تیرۆك لە باریکیدا درکەیە بۆ نە لاوازیی ئادەمیزادو. وشەی (نۆك) یش کە ناوی دانەوێڵەیەکی هەرزانە کەتێکەڵاو بە باراش بکرێ نانی باش لێنایەت. ئەمەش هەر درکەیە بۆ خواردەمەنی ناخۆش. پاش ئەو بەکارهێنانەیان .. تێکرای دێڕە شیعرەکەش ناوەڕۆکێکی لەباری پێکەوەناوەو. خراپەی زەمانەی پڕ ئازارو مەینەتی ماندووبوون دەردەبڕێ بەرانبەر بە مرۆڤ و ژیان و گوزەرانیو.

هەست دەکەین هێزی ماناکەی دەستی بەسەر کڕێی وشەکاندا گرتووەو وەکو دێڕە شیعرێکی پتەو دێتە بەر دڵ .

ج- وشەی وەکو (بلح) و (نامەرد) سرووشێکی گەش و رووناك نادەن بە گوێگرو خوێنەر ، بەڵام کاتێك کە لە شیعردا بەکاریان دێنێ و دەڵێ :-

**بەپێری مەرگەوە فەرسەخ بە فەرسەخ ڕۆیون مەردان**
**ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە (بلح) و (نامەردە)**(١٤)

دەبینین مانایێکی لەبارو پڕبە پێستی خۆیان بەو جۆرە کەسانە دەبەخشن کە لە مردن دەترسن ، بە تایبەتی لەو جۆرە مردنەی کە لە پێناوی سەربەرزیی و خزمەت کردنی خاك و نەتەوە بێ ، چونکە پیاوی راستەقینە نەك هەر لە مردن ناترسن بەڵکو بەپێی خۆشیان بەرەو ئەو جۆرە مردنە دەچن .

د- لە لاپەرە (٢٩٦)ی دیوانەکەیدا ، دێڕە شیعرێکی گوتووەو وشەی وەکو (پاقلە)ی تێدا بەکارهێناوە، ئەم وشەیەش ج سرووشێکی شیعریمان نادات ، بەڵام کاتێ لە شیعرەکەدا بەکاری هێناوەو کردوویەتی بە نموونەی خۆراکی سادە یان بڵێین ناخۆش و بەرانبەر بە خواردەمەنی خۆشی وەکو (پەقلاوا)ی دادەنێ ، دەبینین دەبێتە وشەیەکی جوان و لێی دەوەشێتەوە هەروەکو دەڵێ :-

لەبەر هەر دادەرنرێ جل ، چ (پیناوی) چ (چیناوی)
دەبێتە لوقمە لوقمە (پاقلە) یا (پاقلاوا) بێ ! !

شاعیر لە بەرانبەرگرتنی وشەکانی (پیناوی) و (چیناوی)دا کە جۆرە قوماشێکی جوان و بەنرخەو ، لە نێوانی وشەکانی (پاقلە) و (پاقلاوا)دا ، جۆرە رەگەزدۆزیەکی پێکەوەناوەو ناوەڕۆکی شیعرەکەی پێ بەهێزکردووە .

هـ- لە لاپەرە (٣٤٩)دا ، لە چوارینی ژمارە (٣٣)دا ، فرمانی رانەبوردووی وەکو (دەزەرن) و (دەوەرن) و دەربڕینی وەکو (بەزەرن) و (نەزەرن)ی بەکارهێناوەو دەڵێ :

**ئەربابی غینا ئەوەندە غەررە (بەزەرن)**
**بێ بۆنی بەهارو دیتنی جۆ (دەزەرن)**
**ئەمیانە مەقام و بەستەیان ناشکورییە**
یەعنی (دەوەرن) ئەگەر دەمێ بێ (نەزەرن)

ئەم وشەو دەربڕینانە هەر یەکەیان بەتەنیا سرووشی ناخۆش و مانای ناشیرین دەبەخشن ، بەڵام کە بەو جۆرەی کە لە شیعرەکەدا بەکارهاتن و ، خوو و رەوشتی دەوڵەمەندی لە خۆبایی بووو زیان بەخشیان دەربڕی ، دەبینین نرخ و بەهایێکی نوێیان پەیداکردو وەك وشەی شیعری لەبارو گونجاو خۆیان لە بنیاتی چوارینەکەدا نواند .

**٢- گونجانی وشە لەناو دەربڕینی شیعریدا :-**

وشە لەناو دەربڕینی شیعریدا ، دەبێ بەجوانی لەگەڵ ماناکەی و لەگەڵ سەرجەمی وشەکانی پاش و پێشیدا بگونجێ و لە رووی دەربڕینەوە رەوان و بێ گرێ بێ و زمان و قورگ و لێو لە دەربڕینیدا پێیەوەی ماندوو نەبن هەناسەی خوێنەری شیعری پێوە سوار نەبێ . مەحوی شاعیری لوتکە بەزۆری خۆی لەو جۆرە وشە ناسازانە نەداوەو خۆی نەخستۆتە داوی رستەو دەربڕینی گیرو نارەوان ، مەگەر بەدەگمەن تووشی گرفتی رەوانبێژیی بووبێ و ، هەروەك لەم یەك دوو نموونەیەی خوارەوەدا بۆمان دەردەکەوێ :-

ا- لە لاپەرە (٦٧)ی دیوانەکەیدا ، لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ :-

**فەضیلەی ئەصل و فەصل ئینسانی پێنابێ بە صاحیب فەضڵ**
**کەتۆکۆسەی ، بە تۆچی مامە ریشی بابو باپیرت ؟ !**

وەك سەرنج دەدەینە نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکە دەبینین دەنگەکانی (ضاد) و (صاد) هەر یەکە دوو جار بەر گوێ دەکەون و دەنگی (سین)یش لەناوخۆیاندا دەگرن و وشەکانی(ئەصل و فەصل)(فەضیلە)(ئینسان)صاحیب فەضڵ زمانیان زۆر پێوە ماندوو دەبێ تا دەریان دەبڕی ، بەڵام کە نیوە دێڕی دووەمی بەجوانی و بەرێکی بەدوادا دێ ماندوویەتی خوێنەری شیعرەکە دەحەسێنێتەوەو ناوەڕۆکە جوانەکەیشی ئەوەندە خۆش و پرمانایە ، خەوشی دەربڕینی نیوە دێڕی یەکەم دادەپۆشێ و بەتێکرایی شیعرەکە خۆی جوان و بەنرخ دەنوێنێ .

ب- لە لاپەرە (١٠٤) دا ، لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ

**بووە هەم قافیەی لێوت زوبانم ئیتیفاقانە ،**
**دەبێ عاجز نەبی ، واهاتووە ، ئەو ئەملەح ، ئەم ئەفصەح**

وەك سەرنج دەدەین دەبینین نیوەدێڕی یەکەم زۆر بەرەوانی رۆیشتووە ، بەڵام نیوەی دووەم لەبەر لێك نزیکی دەنگی وشەکانی ئەملەح و ئەفصەح کەمێك بەگرانی بەسەرزماندا دێ . بەڵام چونکە مانای دێڕە شیعرەکە زۆر جوان و ناسکەو دەڵێ : «زمانی من و لێوی تۆ بوون بە هاو قافیە ، چونکە زمانم (ئەفصەح)ە واتە رەوانترەو لێوی تۆش (ئەملەح) ە واتە : سوێرترە ، بۆیە نابێ تۆ پەست بی ئەگەر زمانم لێوی سوێری تۆ بلێسێتەوە ! » بۆیە دەتوانین بە نموونەیێکی جوان و پرمانای دابنێین .

ج- لە لاپەرە (٢٢٨)و لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ :-

**ئەسیرو صەیدی قەیدی کەیلو شەیدی نەفسی ئەممارەم**
**لەدەست ئەم مارە بەد چارە ، چیە چارم خودا چارەم**

لەدەربرینی دەنگی وشەکانی (صەید) و (قەید) و (کەیدو شەید) کە بەمانای (نێچیر) و (کۆتو زنجیر) و (فروفێل) دێن ، زمان کەمێك ماندوو دەبێو ، ئەگەر خوێنەر ئاگاداری خۆی نەبێ تووشی هەڵەی خوێندنەوە دەبێ ، بەڵام کاتێ نیوەدێری دووەمی وا بەرەوانی بەدوادا دێ ، هەستدەکەین گرتنی شیعرەکە زۆر کەمدەبێو بە رەو نەمان دەچێ . دەبێ رەخنەگری ئەدەبی ئەو راستیەش بڵێ :

کە کاتی خۆی مەحوی لەپێناوی هونەری جوانکاریی و وشەئارایی یەوە ئەو وشە هاو کیشانەی بەدوایەکتری دا هێناوە ، چونکە ئەو جۆرە کردەوەیەی شاعیرانی ئەوسا تایبەتمەندێکی شیعری کلاسیکی سەدەی نۆزدەهەم بووە .

**– ٥ خۆلادان لەو وشانەی دوو خوێندنەوە هەڵدەگرن : –**

مەسەلەی بەکارهێنانی ئەو وشانەی کە دوو جۆرە کێش هەڵدەگرنو دوو جۆرە خوێندنە وەیان لە شیعردا دەبێ ، گرفتێکە هاتۆتە پێش گەلێ شاعیرە گەورەکانو دێتە پێش شاعیرانی ئەمرۆشمان . بەڵام هونەر لەوەدایە شاعیر چۆنیان بەکاربێنێ تا بەراستی بخوێنرێنەوەو وەك وشەی شیعریی بێگرفت بێنە بەرچاو . مەحوی کەم واهەیە تووشی گرفتی وشەی وابووبێ ، بۆیە لەم چەند نموونەیەی خوارەوە زیاتر ئەو جۆرە ووشانەمان لە شیعری مەحویدا بەرچاو ناکەوێ .

أ . لە لاپەرە (٣)ی دیوانەکەیدا ، ئەم دێرە شیعرەی گوتوە : –

**لە بەحری فیتنە بەلکی نەجاتت بدا خودا**
**داوێنی باخودا (بگرە) ، بەردە ناخودا**

کاتی لە نیوەدێری دووەمی شیعرەکە ورددەبینەوە ، هەستدەکەین وشەی (بگرە) دوو جۆرە کێش هەڵدەگرێو هەرچەندە کە شیعرەکە خۆی لەسەر کێشی عەرووزە ، بەڵام دەتوانین بە برگە (تفعیلە) بیکێشینو هەر نیوەی ١٤ برگەیە. کەچی دەبینین نیوە دێری دووەمی کە وشەی (بگرە) بە دوو برگە بخوێنینەوە ، ژمارەی برگەکانی دەبێتە ١٣ برگەو لەنگدەبێ بۆیە دەبێ وشەی (بگرە) بە سێ برگە دەربرێ تاکو کێشی شیعرەکە تەواو دەربچێ. جا لێرەدا شیعرناسی تەواو ئەم شیعرەی مەحوی بەراستی دەخوێنێتەوەو ، بەپێی شوێنی فرمانە داخوازییەکەی (بگرە) بە سێ برگە دەردەبرێ.

ب. لە لاپەرە (٣١) داو لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ :–

**لە فیرقەی خاکسارانی مەحەببەت (بفکرە) یەك یەك**
**بە دیەن یەك نەفەر ، دامەن بە لێوی صەد فەریق ئەمما**

کاتێ لە نیوە دێری یەکەمی ئەم شیعرە ورددەبینەوە ، هەستدەکە وشەی (بفکرە) دوو جۆرە خوێندنەوەی هەیەو هەردووکیشیان هەر برگەیین بەڵام چونکە شیعرەکە لەسەر کێشی عەرووزەو پشت بە (نەبزوێن)و (بزوێن) واتە : (ساکنو متحرك) دەبەستێ بۆیە دەبێ فرم داخوازی (بفکرە) وەکو عەرەبی پیتی (ف) بە ساکن بخوێنرێتەوە تا کێشەکەی تەواو دەربچێ.

ج. لە لاپەرە (١٨٢)و لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ :–

**لە سوق دەهردا دووکانی هەرکەس موددەتی عومرە**
**گوهەر دانە بە پشکل دانە «مەحوی»! مامەڵەی مەخلووق**

لە نیوە دێری یەکەمی‌دا وشەی (دەهر)و پاشگری (دا)ی بەکارهێناو کەوتونەتە پاڵ یەكو بەیەکەوە دەردەبرێنو گوتراوە (دەهردا) دەبێ ئەمەش دوو جۆرە خوێندنەوەی هەیە ، هەردووکیشیان سێ برگەیی بەڵام شیعرناس دەتوانێ کام کێشی باشتر دەگونجێ لەگەڵ کێشی شیعرەکە بەو جۆرە بیخوێنێتەوە ، چونکە شیعردانان چەندە هونەر خوێندنەوەکەیشی ئەوەندە هونەرە.

د. لە لاپەرە (٢٦٢)و لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ : –

**(خوێنی) دڵ لەبەر چاوم نەبێ تاکەی رەوان ئاخر**
**ئەوا رۆیی لەبەر چاوم ئەوی رۆحی رەوانم بوو**

لە نیوە دێری دووەمیدا دەبینین وشەی (خوێنی) دوو جۆرە خوێندنە هەڵدەگرێ دوو برگەییو سێ برگەیی ، ئەگەر بە سێ برگەیی نەخوێنرێتەو شیعرەکە لەنگ دەبێ ، جا بۆیە پێویستە لەسەر دەنگی (خ) بوەستینو ز کورتەکەی بنی لابەین.

هـ – . لە لاپەرە (٣١٢) و لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ : –

**لە سایەی دەوری چەرخی سوفلەپەروەر لەك بە لەك دەدوێ**
سەگی ئاواتەخوازی (ئێسکی) وشتر لە شەك دەدوێ

دەبینین لە نیوە دێری دووەمدا وشەی (ئێسکی) دوو جۆرە کێش خوێندنەوە هەڵدەگرێ ، دوو برگەییو سێ برگەیی ، لێرەدا دەبێ بە س برگەیی دابنرێ تاکو کێشی شیعرەکەی پێ لەنگ نەبێ ، خوێنەر بەپێی شوێنو جێگە هەست بە گۆرانی کێشی ئەو جۆرە وشانە دەکاتو ، گیروگرفتەی بەکارهێنانی وشەی دوو کێش لەلای شاعیرە کلاسیکیەکا زۆر بەرچاو دەکەونو لەلای مەحوی کەمتر هەستی پێدەکرێ.

٤ – خۆلادان لەو وشانەی پێشگر یا ناوگر یا پاشگری ناساز

ـمنهلکیٚ:

هەندیٚ جار شاعیر وشەی وای دیٚتە پیٚش کە پیٚشگر یا ناوگر یان یتگریٚکی ناسازی پیٚوە لکاوە، وا راستە تا پیٚ‌ی دەکریٚ خوٚی لەو جوٚرە وشـە لابدات، چونکە سیٚبەرگرانی ئەوانە بەسەر دیٚرە شیعرەکەیشی‌دا هەسەکیٚشریٚو، لە شیعرەکانی مەحوی‌دا بەدەگمەن نەبیٚ چاومان بەو جوٚرە وشانە ناکەویٚو، ئەگەر چاویشمان پیٚکەوت ئەوا لەم یەك دوو نموونە تیٚناپەریٚ: –

١ – لە لاپەرە (١٦٧) و لە دیٚرە شیعریٚکی‌دا دەڵیٚ:

**کەلامیٚکە لە حیکمەت کەیل‌و جامیع:**
**عەطاکەر هەر یەکە، هەر (ئەوشە) مانیع**

دوا بە دوای ئەم دیٚرە شیعرەی دەڵیٚ:

**نعمەت زانی، لەکەس باکت نەمابو توٚ**
**ضەرمەردەر هەر ئەوە هەر (ئەوشە) دافیع**

کە لە دوو شیعرەکە وردده‌بینەوە، دەبینین لە هەردووکیان‌دا وشەی (ئەوشە) کە کورت کراوەی (ئەویشە)یە بەکارهاتووەو ئەمەیش لەپیٚناوی ریٚککەوتنی کیٚشی شیعرەکان بووەو کەمیٚك دەربرینەکەی ناسازکردووە. بەڵام چونکە ناوەروٚکی شیعرەکان بەهیٚزن، ئەم وردە خەوشە دەوریٚکی ئەوتوٚی لە کز کردنیان‌دا نی‌یە.

٢ – لە لاپەرە (٢٢٧)ی دیوانەکەی‌دا ئەم دیٚرە شیعرەی گوتووە:

**بە حەق هەر حەق، بە ناحەق ناحەقم وتوە لە روٚژیٚ بووم**
**وەکوو مەنســـــوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم حەق لادەم**

وەك سەرنج دەدەینە نیوە دیٚری دووەمی شیعرەکە، هەست دەکەین وشەی (بیشمکوژن) کە لە جیٚ‌ی خوٚی‌دا (بشمکوژن) بووەو، لە بەر کیٚشەکەی وای لیٚکراوەو، ئەم ئامرازەی (یش)ە، کەمیٚ وشەکەی بیٚهیٚزکردووەو، دەیەویٚ لە کاروانی وشەی جوانی شیعری لابدات، چونکە ناوگریٚکی سیٚبەرگرانەو ئەگەر ئامرازەکەی (یش) ریٚ‌ی بدایەو لە جیاتی (ئەگەر بیشمگوژن) گوترابایە (ئەگەر بیٚو بمکوژن) ئەوا وشەکە رەونەقی جوانیی پەیدادەکردەوە. بەڵام چونکە ناوەروٚکی شیعرەکە بەهیٚزەو لە مەسەلەی تەصەووف‌و حەق پەرستی‌یەوە دەدویٚ، ئەم وردە خەوشەی داپوٚشیوە.

٣ – لە لاپەرە (٢٩٨)دا، ئەم دیٚرە شیعرەی خوارەوەی گوتووە: –

**روخیشی کردە ئەولا، دەیشیپرسی،**
**بە شوٚخی، شاهی من، توٚ بوٚچی هاتی؟**

دەبینین لیٚرەدا شاعیر وشەی (دەیشیپرسی) بەکارهیٚناوە کە لە جیٚ‌ی خوٚی‌دا (دەشیپرسی) بووەو، لەبەر کیشە عەرووزی‌یەکەی وای لیٚکراوە تا هەست بە لەنگی نەکریٚت. وشەکە بە ناوگری (یش)ە کە بارگران‌بووەو، تەنانەت ناوەروٚکە بەهیٚزەکەیشی ئەو بارگرانیەی پیٚ ناشاردریٚتەوە

**د . بەکارهیٚنانی وشەی سادە لە دارشتنی شیعری جوان‌دا : –**

مەحوی شاعیری لووتکە ، زوٚربەی هوٚنراوەکانی لەم جوٚرە شیعرانەن کە بە وشەی سادەو ئاسایی دوور لە رازاندنەوەی جوانکاری‌و بەبیری تیژو واتای قووڵ‌و هەستی ناسکی ، بەرهەمی بەرزو جوان‌و بەهیٚزی خوڵقاندووەو گوٚی هونەری شیعری پتەوی لە مەیدانی ئەدەبی کوردی‌دا بردوٚتەوە. لیٚرەدا چەند نموونەیەك لەو جوٚرە شیعرانەی لە مەیدان‌و بواری جیاجیادا دیٚنینەوە تاکو خویٚنەری بەریٚزیش ئاگاداری بیرو هەست‌و هونەری بەرزو پتەوی شیعری مەحوی بیٚ:

١ – لە چامەی بەحری نووردا هەستی نەتەوایەتی کوردی‌ی خوٚی بە وشەی سادەی دوور لە رازاندنەوەی رەوانبیٚژی دەردەبریٚو دەڵیٚ: –

**لە (هەمزیە)و لە (بردة) م چونکە کەم دی ئیستیفادەی کورد**
**منیش ئەم کوردی‌یەم دانا، لە ریزی ئەو قەصیدانە! ! (١٥)**

وەیاخود کە لەم دیٚرە شیعرەی‌دا دەڵیٚ:

**موکەرەر بوو قەصیدەی بوردە نەشئەی عالەمی پرکرد**
**بفەرموو بەم قەصیدەی کوردە نوٚبەی نەشئە پیٚوانە!**

مەحوی هەروەك شاعیریٚکی سوٚفی‌و زانایەکی ئایینی بووە، شاعیریٚکی نەتەوەیی کوردیش بووەو، شانازیی پیٚوە کردووەو، بە وشەی سادەو ساکار شیعری جوان‌و پتەوی نەتەوەیی هوٚنیوەتەوە.

٢ – لە هونراوەیەکی دیکەی‌دا، بەگژ واعیزدا دەچی‌و دەیداتە بەر تیرو توانجی رەخنەو دەڵیٚ: –

**لا لغاوەی واعیظ ئەمرۆ، مەوجئەدا دەم پر لە کەف**
**ریشی فیروسیا، کتیٚبی وەعظەکەی بوو بەر تەرەف (١٦)**

مەحوی شاعیری گەورە، بەم وەصفەی لا لغاوەی واعیز، سەرنجی تیژو بیری ورد لەشیعرەکەی‌دا، دەردەبریٚ، چونکە «ویٚنەگرتنی دیمەنی لا لغاوەی واعیزو شەپوٚلی کەف‌و خووسانەوەی ریش‌و خەفەت خواردنی شاعیر بوٚ لەکیس چوونی کتیبەکەی» (١٧) مایەی سەرنج تیژی‌و بیری وردو قووڵی‌یەتی‌و ئەمانەی بە وشەی سادەی دوور لە رازاندنەوەی جوانکاری ئەنجام داوەو ، جوانترین شیعری وەصفی خوڵقاندووە.

٣ – لە لاپەرە (١٢٩) دا ئەم دیٚرە شیعرەی گوتووە:

**بە زەردو سووری دنیا زەردەواڵەت لیٚ نەگوٚرابیٚ**
**بە هەنگی تیٚبگەی، هەر نیٚشە، نوٚشیٚکی نی‌یە زەنبوور**

ئەم دێڕە شیعرەی نموونەیێکی سەرکەوتووە لە شیعری فەلسەفی مەحویو خەڵکی هوشیار دەکاتەوە لەوەی بە دیمەن هەڵنەخەلەتێنو زەردەواڵەی زەردو سووری لێنەبێ بە زەردو سووری دنیاو وابزانی هەنگەو هونگوینی پێدەبەخشێ کەچی زەردەواڵە هەر ئێشی پێوەدانی هەیەو نۆشی هەنگوینی نیەو نابێو ئەم بیرە وردەی بە وشەی سادە دارشتوەو ئەم دێڕە شیعرەی پێ خولقاندوە.

٤ – لە لاپەڕە (٢٤٣)دا لە دێڕە شیعرێکیدا بەوردی فەلسەفەی ژیانی ئادەمیزادی بە وشەی سادەو ساکار دەردەبڕیو دەڵێ: –

**لەگەڵ زانت دەکەویە کۆشی دنیا**
**سبەی قاتیلتە، ئەمرۆ بۆتە مامان**

ناوەرۆکەکەی ئەوە دەگەیێنێ کە «کاری دنیا سەیرە، کە ئەدایك بووی دەس بەجێ دەکەویە ناو کۆشی ئەو دنیایە، وەك بڵێی ئەو مامانتە، کەچی سبەینێش هەر ئەو خۆی بە کوشتنت دەدا»[18].

٥ – مەحوی باسێکی خۆیو نەفسو زەمانەو دنیا لە هۆنراوەیەکیدا دەکات. وشەکانی سادەو ساکارنو کەمیان ئاشنای فەرهەنگی وشەی جوانو رازاوەی شیعری کلاسیکی سەدەی نۆزدەهەمن، کە شاعیران نەیان دەهێشت دێڕە شیعرێکیان بێ وشەئاراییو جوانکاریی لەدەست بڕواتو لەپێناوی جوانی وشەدا ناوەرۆکیان لاوازدەکرد. کەچی بە پێچەوانەوە. مەبەستی سەرەکی ناوەرۆكو مانای پتەوە. هەروەك لەم چەند شیعرەدا دەڵێ: –

**لە ناکەس کاریا خاکم بەسەر. رۆژی بەبا عومرم**
**خودا! تۆ بژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم**
**بە ضایع چوو لە (ما لا یعنی) یا وەقتم هەموو. یەعنی**
**دەبێ وەقتێ لە (بوالوقت)ێ بخوازم دا تیا بمرم**
**ئەجەل دەوروەم دەدا. حازربە. وادەی دەورو تەسلیمە**
**منی غەفڵەت زەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم**
**خەیاڵی پووچی دنیا وا دەماغ و دڵمی پێچاوە. «١٩»**
**قیامەت. هەر مەگەر رۆژی قیامەت بێتەوە فکرم!!**

٦ – دیسانەوە لە بارەی (فەلسەفەی ژیان)ەوە. مەحوی ئەم دێڕە شیعرەی گوتووە،هەموو کەرەسەیەکی دارشتنەکەی تەنیا وشەی سادەو ساکارەو. جوانترین ناوەرۆکی فەلسەفی پێ خولقاندووەو دەڵێ:

**فەلەك هەرگا کەسێکی هەڵبڕی. وەقتی هیلاکەتیە**
**کە سەر بۆ گەینە پەتێ. پێ لە کورسیو ئەسکەمل چ بکا**[20]

مەبەستی شاعیر لەوەیە. کە زەمانە کەسێکی بڵندکردەوە. مانای ئەوەیە بەرەو مردنی دەباتو، سەر ئەگەر بۆ پەتی سێدارەبێ، مرۆڤ چ لەو کورسییە بکات کە لەکاتی لەسێدارەدانیدا دەخرێتە ژێر پێیو دەتوانین بڵێین. (ئەم دێڕە شیعرە یەکێکە لە بەناخا چوونە فەلسەفییەکانی مەحوی)[21].

لێرەدا کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکەم دێنم کە لە هەموو کەرەسەکانی شیعری بەهێزو پتەوی مەحوی تەنیا وشەی شیعریم وەرگرت، چونکە نەدەکرا لە هەموو کەرەسەکانییەوە بدوێمو بیان خەمە بەر تەرازووی هەڵسەنگاندنو نرخاندنو تەنانەت بۆشم نەکرا لە هەموو هۆنراوەکانیدا بەدوای وشەکانی بکەومو لە هەموو رووێکی مۆرفۆلۆژیو زمانەوانیو ئەدەبی لێیان بکۆڵمەوە، بۆیە تەنیا وشەی شیعریم لەلای مەحوی شاعیر خستە بەر تیشکی رووناکی لێکۆڵینەوە..

**پەراوێزو سەرچاوە:**

١. ئەوانەی ئاوریان لە وشەی شیعری لەلای مەحوی داوەتەوە. جگە لە مامۆستایان (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسو محەمەدی مەلا کەریم) لەکاتی لێکدانەوەی شیعرەکانی دیوانەکەیدا - مامۆستا (محەمەد ئەمین هەورامانی) یش لە کتێبی (لە بارەی مەحوی لووتکەوە) باسێکی لەبەرەی هەندێ لە وشەکانی شیعری مەحوی نووسیوە. بەڵام بە زۆری لایەنی زمانەوانی گرتۆتەوە. ... وشەی شیعری لە بارەی جوانیو رەوانبێژیبەوە... (بڕوانە لەبارەی مەحوی لووتکەوە - ... ١٩٨٦. ل: )
٢. د. علي جواد الطاهرو د. عناد غزوان – النقد الأدبي – بغداد ١٩٨٢، ص٨٣
٣. هەمان سەرچاوە. ل: ٨٤
٤. عەلائەدین سەجادی – مێژووی ئەدەبی کوردی – چ١. بەغدا ١٩٥٢. ل: ٣٢٨
٥. کاکەی فەللاح -- وتارێکی لە کتێبی «لە بارەی مەحوی لووتکەوە» بەغدا ٩٨٦. ل: ...
٦. مەلا عەبدولکەریمی مودەریسو محەمەدی مەلا کەریم دیوانی مەحوی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا ١٩٧٧. ل: ٥٥٢
٧. عەلائەدین سەجادی – مێژووی ئەدەبی کوردی چ١. ل: ٣٣١
٨. دیوانی مەحوی بەغدا ١٩٧٧. ل: ٢٢٣
٩. دیوانی مەحوی. ل: ٢٩٠
١٠. دیوانی مەحوی. ل: ١٤٦
١١. دیوانی ئەحمەد حەمدی صاحێبقران چاپی یەکەم ١٩٥٧. ل:
١٢. دیوانی مەحوی. ل: ٣٦
١٣. دیوانی مەحوی. ل: ١٩٠
١٤. دیوانی مەحوی. ل: ٢٧٠
١٥. دیوانی مەحوی. ل: ٤٥٢. ٤٥٤
١٦. دیوانی مەحوی. ل: ١٧٤
١٧. کاکەی فەللاح گۆڤاری برایەتی ژمارە (٧) بەغدا ١٩٧٠. ل: ٢٣
١٨. مەلا عەبدولکەریمی مودەریسو محەمەدی مەلا کەریم دیوانی مەحوی ل: ٢٤٣
١٩. دیوانی مەحوی ل: ٢٢١
٢٠. دیوانی مەحوی ل: ١٥
٢١. مەحوی پەراوێزی لاپەڕە: ١٥.

# خەرمانی خەم

محمەد بەدری

## کە دەروون ئەسووتێ

• • •

کاتێ سەری بەرز کردەوە
نێر ، تێر ، سڵاوی لە ڕۆژ کرد
بە پەنجە هەستی دەربڕی
هەناسەی دەروونی کپ کرد
لە دەروونیا شتێك ئەسووتا
لە بیریا دەنگێك هەڵتووتا
کە چاوی بیری کردەوە
خەمو هەستی سارد کردەوە
فریشتەی بەخت هاواری کرد
ئەوەی ویستی ڕسوات کا
مرد . .

## قەرە قۆش

• • •

چەند پێم وتی جێم مەهێڵە
ڕێ هەورازەو
مەڵبەند بێ ناسیاوو خێڵە
تۆش ئەناسم
شاعیرێکی ، ڕێبوارێکی دەربەدەری
دەروون سووتاوو بە هەستی
لە بەردەمی پەیکەرەکەی قەرەقۆشدا
بە کڕنووشەوە ناوەستی . .

## بەڵێ گەورەم

نیرۆن کاتێ ڕۆمای سووتاند
مێژو دونیاو هەموو جیهان
تفیان لێ کرد
کەچی ئەو ڕۆژەی کە سوڵتان
گڕی لە دونیادا بەردا
بۆچی هەموو بە چەپڵەوە
هاواریان کرد :
گەورەم ، هەر بژیت ،
چاکت کرد ! !

## خواوەندی مەرگ

• • •

ئەو کەسەی جاندارکی سووتاند
ئەو کەسەی عیسای هەڵواسی
ئەوەی ژەهری بە سووقراتدا
ئەوەی هەژارانی چەوساند
ئەوانە گشتیان پێکەوە
هاواریان ئەکرد بە یەك دەنگ
هەموو وتیان : کوانێ تفەنگ
مێژووی ئێمە تارو تەنگە
ئەوەی گوللەی خۆشو ڕەحمەت
پێمان ببەخشێ . . تفەنگە . .



# پەڵە هەورێ

○
لەتیف بەرزنجی - هەولێر
○

لە تافی گەنجی سەرم نایەوە
شۆڕشی عومرم روو پێچرایەوە
بەجوانەمەرگی رۆیم بەلاوی
ئەمەلی کورت‌و بەرگی خوێناوی
لە بیرم نەکەن وەرنە سەرێم
سەر لە هەوارو لانەی خەمگینم
درێغیم نەکرد بۆ گەل‌و هۆزم
کوردی چەوساوە رۆڵەی دڵسۆزم
لە بۆ ئاوارەو لێقەوماوانی
لەو رێبازەدا بوونە قوربانی
ئاسەرم دانا لە رێی هەژارا
لە ئیش‌و کاری پاکو جوانیارا

شێخ ئیسماعیل:

شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ «عەبدولکەریم» ی - دارەخورما یە. لە ساڵی ١٩٣٤ - لە شاری هەولێر لە گەڕەکی «خانەقا» هاتۆتە دنیاوە.

لە ٢٥ ٣ ١٩٨٧ - دا بە کارەساتی ئۆتومۆبیل کۆچی دوایی کردووە!! کە لە سەفەری شاری سلێمانی دەگەڕایەوە. لە رێگەی نێوان شاری کەرکووک‌و هەولێردا نزیك ئاوایی «دۆڵەبەکرە».. بەو کارەساتە دڵتەزێنە ماڵ ئاوایی لە گەل‌و نیشتمان کردو. هەموو هیواو ئاواتەکانی بردە ژێر گڵەوە!

جا بە بۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەو کارەساتەدا. بەهەڵبەستی (پەڵە هەور) یادی ئەو جوانە مەرگە دەکەینەوە. کە لە کاتی خۆیدا ئەم هەڵبەستە هەر بەو بۆنەیەوە دانراوە.

پەڵە هەورێ لە ئاسمانا
لەسەر دەشتی کوردستانا
هێنای لەگەڵ بای شەماڵا
گەواڵەی رەشی ئەم ساڵا
بروسکێ دێ لە دوورەوە
بە ئاگرێکی سوورەوە
پەلاماری زەوی داوە
خوێن‌و دوکەڵ تێکەڵاوە
تەمە لەپێش رەشەباوە
شەوە یا رۆژە گیراوە
تەپ‌و تۆزە لەگەڵ زریان
هێرش ئەبانە سەر کاروان

رەهێڵەی بارانی بەهار
شێواندی رێگەی شۆڕەسوار
گێژەلۆکەی هەردەو کەنار
کارەساتی کرد بە رێبوار
بارانێکی بەتاو دێنێ
لافاوی خەم هەڵئەسێنێ
لەسەر هەولێر ئەگرمێنێ
قەڵای هەژار ئەڕوخێنێ
لەو کۆشك‌و سەراو کەلاوە
لەو کارێزو جۆگە ئاوە
لە خانەقای پەشێکاوا
شارو بازاڕی داماوا

لە ناو دێهاتی سووتاوا
ماڵە دەروێش لێ قەوماوا
لە گەرمیان‌و لە کوێستانا
لە بادینان‌و سۆرانا
لەبەر تەکیەو دیوەخانا
لەناو رەشماڵی جارانا
لە خێوەت‌و لە ساباتا
لە رۆژێکی وا نەهاتا
قوڕێکی خەست گیرایەوە
شینگەڕ سەری تێنایەوە
قوڕێ تێکەڵی خوێناوی
هەوێنی فرمێسکی چاو بێ

بگەڕێی، بەخێرایی پەڕەکانت هەڵ دەدایەوە.. شیبایەکی فێنك لەدەم‌و چاوێ دەدا، لەناخی خۆتدا ناکۆکیەك هەبوو (باشە تۆ بۆ وا دەستەمۆی کەرامەت‌و ئەفسانە بووی؟) شارەزا ببوی داخوا لەکام لاپەڕەیە، چونکە ئەمە ئیشی ڕۆژێك‌و دوو ڕۆژت نەبوو.. لەوەتای عەشق لە کەللەی دابووی، دەبوو هەموو ڕۆژێ بورجی میزانت خوێندبایەوە!.

پۆل پۆل قوتابیانیش بەرەو قوتابخانە دەکشان.. هەر کە ڕۆژنامەکەت خوێندەوە خەندەیەك زایە لێوەکانتەوە (دەبێ وابێ؟) ئەمڕۆ هاوڕێ کەشت دڵی خۆشە، ئەویش هەر هاوڕێی ڕێچکەی ئەوین‌و دڵداری بوو.. زۆرت خۆش دەویست. هەموو ڕۆژی بەسەرهات‌و تام‌و چێژی جی‌ژوانی خۆیی‌و ژانەکانی بۆ یەکالا دەکردی.

تەماشای کات ژمێرەکەت کرد، یەکسەر داوای یارمەتیت لەهاوڕێ‌کەت کردو، نزیکەی سەد مەنزێك لە هاوڕێ‌کەت دوور کەوتیەوەو لە شوێنە ستراتیژی‌یەکەی ڕۆژانت وەستای، سێ چوار کچت بینین لەدورەوە دێن.. هەموویان بەردەمت دەگرنەوە.. وێستگە لە تەنیشت تۆوەیە، ناچاری لێرە بوەستی چونکە ئەویش هەر بێرهدا دێ.

بەبەر دەمتا تێ‌پەڕین‌و گەیشتنە وێستگەکە، تەماشای ڕوخساریانت نەکردن، پێت سەیر بوو.. ڕۆژان ئەو کاتانە دەهات، کەچی ئەمڕۆ دوا کەوت لەبەر خۆتەوە لێکت دەدایەوە (دەبێ ئەمڕۆ بۆ دیار نەبێت، تۆ بڵێی نەهاتبێ بۆقوتابخانە؟ ئەگەر نەهاتبێ شتێك ڕووی‌داوە.. هەموو شتێك دەبێ). کەوتیە جووڵە لەداخان جگەرەیەکت پێ‌کردو مژێکی قووڵت لێ‌دا، تا ئەو کاتە گاڵتەت بەوانە دەهات کە دەیان گووت: «ناخۆشترین کات چاوەڕوانی‌یە» دەهاتی‌و دەڕۆیشتی.. جمووجۆڵەکەت لە پانتایی سێ مەتر تێ‌پەڕی نەدەکرد، دیسانەوە تەماشای کات ژمێرەکەت کردەوە، باش بوو ئەم جارە کە سەرت هەڵ بڕیەوەو سرنجت دا، لەشت گەرم داهات.. لێدانی دڵت ئاسایی نەما.. دەت گووت لەپێش برکێی هەزار مەتری بەشداریت کردووە، یەکسەر زانیت ئەوە.. جگەرەکەت فڕێ‌دا.. دەستێکت بە سمێڵتدا هێناو تەزوویەکی شادی ئاشنای گیانت بوو، هەموو ڕۆژێ بە بەهانەی شتێکەوە بەیەکەوە دەوەستان، ئەمڕۆ لە گوماندا بووی، جاران دەهات دەیگووت:

– ئەوە بۆ ماوەیەکە نایەی بۆ ماڵەوە، دایکم گلەیی لێ دەکردی! خەریك بوو بگاتە بەردەمت.. لەو کاتەدا وات هەست دەکرد لەناو جیهانێکی خۆش‌و سەیری ئەفسوناویدا باڵ ڕادەوەشێنی، بۆ خۆشت نەت دەزانی چۆن چۆنی ڕوو بەڕووی ببیەوە.. باڵایەکی بەرز.. قژێکی خاو.. جەستەیەکی گۆشتین‌و ڕووخسارێکی بەسۆزو خەندەیەك لە خەندەکەی مۆنالیزا جوانتر هەموو ڕێبوارێکی ئەو ناوەی دەتاساند، دڵی خۆش یا ناخۆش هەروا بوو..

جار جارەش گومان‌و ڕاڕایی وەك هەوری هاوین سێبەری لە هۆش‌و بیرت دەکرد، چونکە ڕۆژی پێنج شەممە بینیت، زۆر بە بێ کەیفی چاك‌و چۆنی‌یەکی ساردی لەگەڵ کردی، هەر بۆیە شەوی هەینی وەك خوی‌یان لەچاوان کردبێ، چاوت لێك نەنان، چاوەکانت وەك دوو پرۆژکتۆر بڕیە سیاو چاوەکانی، هات تا گەیشتە ئاستت خۆت ئامادە کرد تا بەووزەی ووشەکانی وەرزی تاسەو هیوات تێراوکەی، کەچی بەبەر دەمت‌دا تێ‌پەڕی‌و چاوێکی گرژو مۆنی لێ‌کردی، بێ‌مەیلی‌و شەڕو گۆڕانی تێدا دەخوێندرایەوە، زۆر تاسای. قەت بڕوات نەدەکرد، وەك لەسەر بانێکت بەردەنەوە..

سۆزت کەوتە سکالا کردن لەبەردەمی دادگای هۆش‌و ویژدانت:

– مانای چی، تۆ بڵێی گۆڕابێ؟ خۆ من خەتایەکم نەکردووە، کوا سۆزو گڵپەی ئەوینی جارانی؟ ئەی لەو ووشانە ناپرسێتەوە کە دەی گووت:

– من بە هەموو قەناعەتێکەوە خۆشم ویستووی، لەوەتای تۆ دەناسم، ژیانم خۆشتر دەوێت!.

هەروا بیرۆکەو ڕابردووی عەشقت دەخستەوە بەر نەشتەرگەری ڕەد و ڕاستی.. دڵت بڕوای نەدەکرد، لەگەڵ ڕۆیشتنی ڕووت لەگەڵ سوڕاند تا گەیشتە وێستگەکە، چاوت بە مۆلەق وەستا بوون، تێ‌نەگەیشتی چی ڕووی داوە؟

هێندەی جگەرە کێشێك وەستاو، ئەمڕۆ پشتی تێ‌کردی‌و وەك چاوەڕوانی یەکێك بکات وایە، کەچی ڕۆژانیش بەرامبەری یەکتری دەوەستان‌و لەدوورەوە خەندە بارانی یەکتریتان دەکرد.. لەو بیرو ئەندێشەدابووی، ماشێنێکی سپی دوا مۆدێل هات لەبەر دەمی وەستا. پێش ئەوەی سەرکەوێ، ئاوڕێکی ڕق‌و کینەی لێ‌دایەوە، پڕ بوو لە منەت ئاوایی و «ناتناسم». تا لە چاوان وون بوون لەجێی خۆت بووی، یەکەم ساتی سەرەتایی ئەم ئەوینەت بیر کەوتەوە (سەردەمێ هەوڵی دنیای‌دا تا نەگەڵیدا پێ‌بکەنم‌و جارێك پێی بڵێم خۆشم دەوێی!).

زۆرت پێ سەیر بوو، بەڵام گەیشتیە قەناعەت‌و بڕیارت‌دا (کە دنیا خۆشەویستی، بە وەرزێکی تووش ساڵت لەبەر چاو ناخا) بە بیرێکی جەنجاڵەوە بەرەو قوتابخانە هەنگاوت نا!.

# دوو پەریزادەی ئەفسووناوی



وەرگێرانی :
لە ئینگلیزی یەوە
[redacted]

لەمانگەشەوێکی سەرماوتۆفی زستاندا ، ڕووناکیەکی هەمەڕەنگی دڵرفێن لەسەر ڕووی پەنجەرە بەزوقم داپۆشراوەکان پەخش‌ببۆوە . ڕەشەبا لق دارەکانی بەم لاو ئەولادا دەشەکاندەوەو دوکەڵکێشی ماڵە خنجیلانەکانی ئەو دەوروبەرەی سەراپا کپ کردبۆوە .

(ئۆلیا) ، هەردوو دەستە نەرمۆڵەکانی پەیتا پەیتا بەسەر دەستە چرچو لۆچەکانی داپیرەیدا دەهێناو ، وەك هەموو شەوانێکی ڕابووردوو چاوەنواری چیرۆكو سەرگوزشتەی خۆشی لە داپیرەی دەکرد . (تۆلێك)ی براشی ، کە بە چیچکانەوە لە تەکیانەوە دانیشتبوو بە پەرۆشەوە چاوەکانی بڕیبوە چاوەکانی داپیرە . .

داپیرە ، بزەیەکی بەسۆزی بۆکردن‌و ، خوری‌و شیشی چنینەکەی خستە لاوەو ناوە ناوەش دەستی بەسەر تۆلێکدا دەهێناو ووتی : ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە چیرۆکێکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە . هەر کە ئەمەی بەزارداهات ، یەکسەر ئۆلیاو تۆلیك لە شوێنی خۆیان ڕاپەڕین‌و بە چیچکانەوە لە بەردەمیا قوت بوونەوە. داپیرە بەم دیمەنەیان ئەوەندە شادو دڵخوش بوو ، چرچو لۆچی نێو چاوانی گەشایەوەو ووتی : ڕۆڵەکانم ئێستاش چیرۆکی - دوو پەریزادە بچکۆلە ئەفسووناوی‌یەکەتان - بۆ دەگێڕمەوە :

«ڕۆژێ لە ڕۆژان ؛ پینەدۆزێك ، هێندە دەست‌کورت‌و هەژار دەبێت جگە لە چەرمی جووتێك پێڵاو بەولاوە هیچی تر شك‌نابات . پینەدۆزەکە ، چەرمەکەی بڕی‌و نیازی وابوو بۆ سبەینێ دروستی بکات . ئەم بڕیارەی‌داو چووە سەر جێگاکەی‌و نوست . سبەینێ کە لە خەو بێدار بووەوە ویستی دەست بداتە دووریني پێڵاوەکان ؛ تەماشای کرد وجۆتێك پێڵاوی جوان کە لە ژیانیدا نەی‌بینیبو والەسەر کورسیەکە بۆی

دروستکراوە ! . بەم کارە زۆر سەرسامبوو . پاشان دەستی دایە جووتە پێلاوەکەو بردیە بازارو فرۆشتی . بە پارەکەی بەشی چوار جووت پێلاوی‌تر چەرمی کڕی‌و ئنجا دەستی کردە بڕینیان . بۆسبەینێ دیسانەوە پێلاوەکان بە دووراوی بۆی ئامادەکرابوون بۆ چەند جارێك ئەم کارە دووپات دەبۆوە .. بۆیە بە پەرۆشەوە حەزی دەکرد بزانێ کێ بەم کارانە هەلّدەستێت . ! . شەوێك خۆی ئامادەکردوو لە پشت ئاگردانەکەوە خۆی مەلاّس‌داو ورتەی لە خۆی بڕی . لە نیوەشەودا دیتی وادوو پەریزادەی خنجیلانە وەدەرکەوتن‌و لەسەر کورسی‌یەکە دانیشتن‌و دەستیان بە دادووڕینی پێلاّوەکان‌کرد . هەر بە تەواوکردنی ئیشەکەیان لە چاو وون بوون» .

داپیرە ئەو شەوە گەلێك چیرۆکی خۆشی تری بۆگێڕانەوە ؛ بەلاّم هیچیان بە قەد ئەم چیرۆکە ئۆلیاو تۆلێکی نەهەژاند . هەر بۆیە تۆلیك ئەم پرسیارەی ئاراستەی داپیرە کردوو ووتی : باشە تۆ حەز دەکەیت یارمەتی‌دەرێکی وەك ئەوانت هەبێ ؟ . داپیرە (بە دەم چنینەوە) ، ووتی : بێگومان ! . (ئیتر کە کاتی نووستن نزیك بوووەوە ؛ داپیرە پێی ڕاگەیاندن کە پێویستە بچن پشووبەن .) .

ئۆلیا ، لەسەر جێگاکەیەوە ڕاکشابوو سەیری ئەو دیمەنەی دەکرد کە مانگەشەوەکە ڕووناکی لەسەر پەنجەرەکان پەخش کردبۆوە. ناوە ناوەش چاوێکی بە ژوورەکەدا دەگێڕاو لە هەمان کاتیشدا هەربیری لەو چیرۆکەی دوو پەریزادەکە دەکردەوە ! ئەو شەوە هەرچەندی دەکرد خەوی لێ نەدەکەوت . بۆیە ناچار تۆلێکی برای بێدار کردەوەو بانگی کردە لای خۆی‌و پێی ووت : تۆ ئەزانی ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە کە چۆن.

بتوانین دەستی یارمەتی بۆ کەسانی لە خۆمان گەورەتر درێژ بکەین‌و ببینە نموونەی ئەو دوو پەریزادە بچکۆلانەیە. (تۆلیك)، سەری سوڕماو ووتی. چۆن؟ (ئۆلیا) بە چرپەوە قسەی دەکرد تاداپیرەی بێدار نەبێت. ئەو شەوە دوو بە دوو چەند بڕیارێکیان‌داو کەس نەیدەزانی دەربارەی‌چی دواون. بۆ سبەینێ لە گەلّ خۆرکەوتندا، داپیرە لە خەو هەستاو نیازی وابوو بچێت لەدەرەوە هەندێ دار بهێنێ. بەلاّم بینی واگورزەیەك دار لە تەك ئاگردانەکەوە دانراوە. ئنجا کە بەرەو دالاّنەکە کەوتە ڕێ بینی بەفری ڕێڕەوەکەشی بۆ مالّراوە. پاشان کە چوو بۆ گەورەکە تامانگاکانی بدۆشێ بینی ئەو ناوەش هەمووی گسك دراوەو خاوێن کراوەتەوە.. داپیرە، بەم کارانە بڕوای نەدەهات، تەنها ئەوە نەبێ کە سەرێکی بۆ لەقاندو زەردەخەنەیەك گرتی. لەو کاتەشدا ئۆلیاو تۆلیك بە دزی‌یەوە سەیری داپیرەیان دەکردو بزەیان دەهات!.داپیرە زۆر خۆشحالّبوو بەوەی کە کەسانێك هەن یارمەتی دەدەن‌و ئیشی مالّەکەی بۆ جێ‌بەجێ دەکەن‌و ئەرکی سووك دەکەن.

پاش چەند ڕۆژێك کە دایك‌و باوکی ئۆلیاو تۆلیك گەڕانەوە، داپیرە هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. دایکیان سەیرێکی ئۆلیاو تۆلیکی کردو ووتی: «جا ئێستا چۆن پاداشتی ئەو جووتە پەریزادانە بدەینەوە». باوکیان، دەستی برد لەناو جانتاکەی دوو پرتەقالّی گەورەی دەرهێناو ووتی: «ئەم دوو پرتەقالّە دەدەین بەو دوو پەری زادانە لە پاداشتی ئەو یارمەتیەیان».

تۆلیك هەر کە چاوی بە پرتەقالّەکان کەوت بە هەلّەداوان بەرەو باوکی ڕای‌کردو ویستی ئەو کارەی کردبوویان بۆیانی بدرکێنێ. بەلاّم ئۆلیا دەستی تۆلیکی گرت‌و نەیهێشت ورتەی لە زاربێت. باوکی واخۆی پیشان‌دەدا کە ئاگاداری هیچ بەسەرهاتێ نیە، ووتی: «تۆلیك وەرە کوڕم بزانم ئەتویست چیم بۆ باس بکەیت!» بەلاّم ئۆلیا دەست پێشخەری لە وەلاّمی تولیك‌کردوو ووتی: «بابەگیان ئەیەوێت بپرسێ کە چۆن ئەو پرتەقالاّنە دەدەن بەو پەریزادانە کە بێ ئەوەی بزانن لە کوێن؟!»داپیرە، بزەیەکی بۆ کردن‌و ووتی: «ئێمە بە دوایاندا ناگەڕێن، تەنها پرتەقالّەکان دەخەینە ناو قاپێکەوەو لەسەر مێزەکە بەجێی دەهێلّین ئەوجا کە خۆیان هاتن دەزانن کە ئەمە پاداشتی کردەوەکانیانە».

ئۆلیا تۆلیك دەستیان‌کرد بە خواردنی پرتەقالّەکان‌و توێکلّەکانیان لە ناو قاپەکە داناو پاشان قاپەکەیان گەڕاندەوە سەر مێزەکە تا دانەو وابزانێت کە پەریزادەکان خواردوویانە..

لە دواییدا تۆلیك بە ئۆلیای خوشکی ڕاگەیاند کە بۆ سبەینێ هەمان ڕەفتار بنوێنن‌و خۆیان بکەنەوە بە پەریزادەکان ئۆلیا، بەم بڕیارە گەلێ شادومانبوو، ئەویش بڕیاری‌دا کە بە هاورێیانی: ناتاشاو ئیراو‌نادیاو.. ئەوانی‌تر ڕابگەیەنێ. هەر وەها (تۆلیك)یش، بڕیاری‌دا کە بۆ هەموو هاورێیانی پۆلەکەی باس بکات تاوەکو ئەوانیش لە کاروو باری ناو مالّدا یارمەتی دایك‌و باوکیان بدەن‌و گوێ ڕایەلّیان‌بن‌و لە ئامۆژگاری‌یان دەر نەچن.

(٠). ئەم چیرۆکە لە کتێبی:

(The white stork in the sky) p.p: 26- 29

وەرگێراوە.

# گـــۆڕ

**ئاسۆ ئەحمەد**

لەنێو گێژاوی پێکداچوونی دەنگە جوداکانی ناختدا وونیت.. یەك سەعتی تەواوە کەللەت بۆتە پوورە هەنگێکی وورووژاو.. لە دووریانێکی دخرۆد دەستەوسان ماویت.. نازانیت گوێ بۆ کام دەنگی ناخت رِدێریت. هەر ساتەو دەنگێکیان بلّندە.. وەك هەڵچوونو داچوونی شەپۆلی توورەی دەریا لە بلّندبوونو کپبووندان.

ئۆقرەت لەبەر براوەو وەك لەسەر پەنگر تروشکەت کردبێت جێ بە خۆت نکریت. بۆ جاری دەیەم بەرزەپێ هەڵدەستیتو جگەرەیەکی تر پێ دکەیت.. لە توێی تاریکییەکەوە بە چەند هەنگاوێك لە تەرمەکە دوور دکەویەوەو لەدووری سێ چوار مەترەوە بەرامبەری تروشکە دکەیت. شەو پەردەیەکی قەترانیی لە دەورت هەڵداوە.. هیچ نابینیت.. پێلووە ماندووەکانت هەڵ دەگلۆفیت.. بێهوودە.. ڕەشاییەکی تۆخو هیچی دی هێندە نابات گەرمیی ئاغزی جگەرەکە بە لێوتدا دچزێت.. سەرسام دەبیت.. خۆشت نازانیت چۆن وابەزوویی تەواو بوو.. پاکەتی «بەغدا»کەی نێو بەرکیشت تەنیا سێ جگەرەی تێدا ماوە.. «لە ماوەی سەعاتێکدا ئەمە پاکەتێك.. بوومەتە دووکەڵکێش!».

خشەی پێکدادانی لقو پۆپی درەختو گفەی بارەشی چیا موچڕکەی ترس بە لەشتدا دێنێ. بەرزەپێ هەڵدەستیەوەو بە چەند شەقاوێکی گەورە خۆدەگەیەنیەوە تەنیشت تەرمەکە.. بۆ جاری دەیەم بە گردانی تەلە شەمچەیەك سیمای سرو بێڕەنگی ڕۆشن دەکەیتەوە. بە ووردی لە بەرزو نزمیو هێڵو زیپکەکانی ئەم سیما ترسناکە ڕادەمێنیت. لە ناکاو هەستێکی سەیر گیانت دێنێتە لەرزەو لێوەکانت هێندەی تر ووشكو تینوو دەکا.. شپرێو دەبیت.. یەك سەعاتی تەواوە لە سیمای ڕەنگ پەڕیوی ئەم مردووە ڕاماویت.. کەچی تەنیا ئێستا لەم ساتەدا.. کۆنە یادێکی تاڵ لە ناختدا زیندوو بۆوە.. قارچك ئاسا لە دەروونتدا قوت بۆوە، کۆنە یادێك.. ئاوازی خەمناکی ڕابردوویەکی دوور بە گوێتدا دەداتەوە، لە نێو تەمو دووکەڵی دەیان ساڵی تەمەندا وونت دەکاتو لە توێی ئەم تاریکییەوە دیمەنی زەردی بەیانییەکی ساردی زستانێکی سەخت بە پێش دیدە ماندووەکانتدا دێنێتەوە، ئەو بەیانییەی لە دەنگو هەرای گەرەكو قیژەو گریەی دایکت بێدار بوویتەوە، ئەو بەیانییەی تۆی نۆ ساڵان بۆ یەکەم جار مرۆڤێکی مردووت بینی، ئێستاش کە ئەو دیمەنە سامناکە لە پێش چاوتدا خۆدەنوێنێتەوە هەمان ترسو سەرمای ئەو بەیانییە دەمارەکانت سر دەکەن... هێشتا کازیوە بوو کە قیژەو هاواری دایکت ڕایچڵەکاندیتو لە نێو پێخەفی گەرم وەدەری نایت... بە چاوی خەواڵووەوە بە ژێر کلوو بەفردا غارتدا.. بەرەو حەشاماتی نێوەندی گەرەك پەلت کوتا، لە دوورەوە دایکت بینی پرچی خۆی دەسکەنە دەکا، نەتدەزانی دایکت بۆ دەگریو لە خۆ دەدا.. سۆنگەی خڕبوونەوەی خەڵکی گەرەکت لا وونبوو.. بەڵام هەر کە گەیشتیە نێو بازنەی سیما خەواڵووەکان.. ئاوەزی بچکۆلەت هەموو شتێکی بۆ ڕوون بۆوە.. بابت لە نێو بەفرەکەدا کەوتبوو.. جەستەی ببووە پەیکەرێکی بەفرین.. ڕوومەتەکانی سوور هەڵگەڕابوونو قامکەکانی ببوونە چلوورە. سەراسیمەو زارەترەك بوویتو لە حەژمەتا چاوەکانت زەقبوون. ئاوێزانی شانو ملی دایکت بوویتو لە گەڵ گریانی ئەودا کانیی چاوانی تۆش تەقینەوە. تائێستاش سۆنگەی ئەو گریانەی خۆت نازانیت. لە هەموو ژیانتدا تەنیا ساتێك بابت خۆش نەویستووە، تاقە وێنەی ئەو کە بە قووڵی لە یادتدا هەڵکەندراوەو هەرگیز گەردو تۆزی زەمەن نایسرێتەوە.. وێنەی مەستیو بێ ئاگایییەتی، هەمووان ئاشنای بەرنامەی ووشكو سوواوی ڕۆژانەی بوون... بەیانیان دەچووە دایەرە.. دوا نیوەڕۆ دەگەڕایەوەو پاش نیوەڕۆژە کردنو جەند قرقێنەیەکی قیژەوەن لەسەر سیسەمە بەرزەکەی ڕادەکشاو پرخە پرخی لە گشت کونجێکی ماڵەکەدا سەدای دەبیسترا. دەمەو ئێوارەش لە خەو ڕادەبوو.. خۆی دەگۆڕیو هەر بە مۆنیو توورەییو بێ ئەوەی تەنیا ووشەیەك لە گەڵ شناقتان بلّێت وەدەردەکەوتو نیوەشەو بە مەستی بە لۆژە لۆژ خۆی بەماڵدا دەکردەوە.. هەر لەبەر دەرکەشەوە بە پانتایی گەرووی نوزساوی دەیقیژاندو دەینەڕاندو جوێنی دەدا.. کپیو خامۆشیی گەرەکی دەخرۆشاند. نەفرەتی بەسەر ژینو بوونو دنیاو ئافرەتو منالدا دەبارانو هێندەی برست لە

دەستە سرو لەرزۆکەکانی‌دا هەبایە لە دایکی دەدا، بە بۆنەو بێ بۆنە لە دایکی دەدا.. گەر پارەی پێ نەمایە یان کەسێك توورەی کردبایە یان دایەرە سووکایەتی پی‌بکرایە یان.. یان.. ئەوا داخ‌و خەم‌و توورەیی خۆی دەکردە پەڵە خوێن‌و ئاوساوی‌و نیشانە بە جەستەی هەمیشە زامداری دایکتەوە، دایکیشت کۆیلەیەکی گوێ رایەڵ ئاسا لەبەردەمی‌دا مل کەچ دەوەستاو متەقی نەدەکرد، بۆیە تاماوەیەکی دووریش لە ئاست گریانەکەی دایکت‌دا سەرسام بوویت‌و مانای فرمێسکە گەرمەکانی ئەوت بۆ لێك نەدەدرایەوە، تۆ پێت وابوو گەر بابت بەو شێوەیەش نەمردبایە ئەوا دەبووا رۆژێك دایکت بیکوشتایەو کۆتایی بە زەبرو زەنگ‌و رەقی‌و درندەیی بهێنانە.. بەلام هەرگیز بە بیرت‌دا نەدەهات پاش مەرگی بابت دایکت وابەکوڵ بگری‌و لەسەر تەرمەکەی فرمێسکی گەرم برێژێ. ئەو چەند فرمێسکەی دایکت رۆژانێکی دوورو درێژ خەمبارو بێ‌ئارام‌و پەشێویان کردبیت‌و مێشکی بچکۆلەتیان لە نێو گێژاوی دەیان پرسیاری ئاڵۆزدا ورکرد، شەوگارێکی بێ‌پایانیش لە ژێر لێفە شرەکەت‌دا گینگڵیان پێ‌دایت‌و وەنەوزیان لە چاوانت تۆران، هەرچەندت دەکرد نەتدەتوانی شینی دایکت بۆ مەرگی بابت بە رەوا ببینیت.. نەشتدەتوانی بە یەکجاری ئەم بیرۆکە بە ئازارە لە کەللەت دەرباوێیت‌و خۆ لە گێژاوی ژانو بێ ئارامی‌یەکەت قوتار بکەیت‌و بحەوێیتەوە.. تا رۆژێك هەگبەی پرسیارە ئاڵۆزەکانت بۆ دایکت هەڵرشت‌و چاوەڕێ‌بوویت وەڵامەکانی ئەو گڕی بە جۆشی ناخت دامرکێنن..

- دایە.. تۆ بابەت خۆش دەویست؟
- چی؟ ئەم پرسیارە سەیری چی‌یە؟!
- هیچ.. هەروا.. حەز دەکەم بزانم.
- هەموو ئافرەتێك دەبێت مێردەکەی خۆی خۆش بوێت.
- ئاخر ئەو هەمیشە لێی دەدایت.
- ها؟ چ قەیدی‌یە.. پیاو گەورەی ماڵەو زۆر جار توورەش دەبێ‌و...
- ئاخر تۆ هیچ گوناهێکت نەبوو.. ئەو هەر لە خۆیەوە لێی دەدایت.
- نا.. هەموو بەشی خۆمان گوناهمان هەیە.. ئێستاش بیبرەوە.. چیدی لە سەری مەرۆ.. تۆ هێشتا منالێت‌و کاتی ئەم قسانەت نی‌یە.. برۆ وانەکانت بخوێنەوە چاکترە..

وەڵامە شێواوەکانی دایکت نەك هەر تاسەی نەشکاندیت بەڵکە هێندەی دی وێل‌و تینووی کردیت.. لە گەردلوی پەژارەو وونبوون‌دا نوقمی کردیت، بەلام درەنگ.. زۆر درەنگ نهێنی‌یەکانت بۆ ئاشکرابوون‌و تەم‌و لێڵی‌ی بیرو هۆشت رەوینەوە، زانیت کە بۆ دایکت‌و گشت ئافرەتانی وەك ئەویش مەرگی مێرد گەورەترین کارەساتە.. رانەمەر پاش مەرگی شوان چی‌ی بەسەردێت.. چۆن‌دەژی؟ کێ لە هێرشی گەڵە گورگی دەپارێزی؟ ئەوسا سۆنگەی فرمێسکەکانی دایکت بۆ دەرکەوت.. زانیت بوونی بابت - لە گەڵ هەموو رەقی‌و بێ‌باکی‌و درندەیی‌دا - پێویست بوو.. ئای کە راستی‌یەکی تاڵ‌بوو!

سەدای لوورەیەك‌و هاوارێکی تاساو چۆڵەکەی ئەم کۆنە یادە لەبیرت هەڵ دەفرێنێ‌و لەنێو تەم‌و دووکەڵی رابوردوو دەرت دێنێ، سەر هەڵدەبڕێت.. گوێ هەڵ‌دەخەیت.. بۆ ساتێك هەناسەکانت لە قەفەزی سنگت‌دا بەند دەکەیت.. نە تریەیەك.. نە چریەیەك، دیسان بێ‌دەنگی‌یەکی قورس وەك کپی‌و خامۆشی‌ی گۆڕێکی تەنگ‌و تار لە تۆو تەرمەکەو دەورو بەرەوە دەئاڵێتەوە.

ئەمشەو لەم هەوارە چۆڵ‌و نوستووەدا تێشکی جەستەیەکی سرو بێ‌گیان.. تێشکی رۆحێکی مردوو دەگریت. تۆی لە مەرگ هەڵاتوو ئەمشەو رێکەوتێکی نالەبار کردیتیە خەمخۆرو تێشك‌گری تارمایی‌یەکی نامۆی مەرگ، لە پاڵ تەرمی مرۆڤێکی نەناس‌دا تروشکەت کردووەو بە هەر چوار لادا دەروانیت.. لە توێی تاریکی‌یەکەوە نیگای وێڵ ولە ترسا راچەنیو بە کەندو لەندی دەورت‌دا وەردەکەیت، چاوەکانت ماندوون.. دەکزێنەوەو بە ئاستەم هەڵ‌دێن.. بەلام ترسێکی بێ‌ئامان.. ترسێکی ئاڵۆزو تەلیسماوی وەنەوزی لە چاوانت تەراندووەو ناوچەکەی لێت کردۆتە دارستانێکی بە مەرگ تەنراو، دەترسیت.. لەم بێ‌دەنگی‌یە قورسە دەترسیت.. لە هەموو خشەو تریەیەك دەترسیت.. لە لوورەی دووری رەشەباو سێبەری تاریکی خۆت دەترسیت.. لە تەوێڵی زەردو سپای بێ‌رەنگ‌و جەستەی سرو پێڵووی داخراوی مردووەکەی تەنیشتت دەترسیت.. دەترسیت لە ناکاو دێوی مەرگ لە رۆحی مردووی تەرمەکەوە بێتە دەرێ‌و بە نێو گیان‌و دەروونت‌دا بکشێ.

وەك هەموو جارێکی دی کە ترسە کوشندەکە دەتاسێنێ.. بە گردانی تەڵە شقارتەیەك تاریکی‌یەکەی دەورت کەمێك دەرەوێنیەوەو تروسکەی وورە بەگیانی شپرێوت دەدەیتەوە.. کپی‌و بێ جووڵەیی تەرمەکە بەسەر دەکەیتەوەو لەبەر رۆشنایی زەردی تەڵە شقارتە داگیرساوەکەدا تۆری سەرنجەکانت لە سپا ساردو سامناکەکەی دەئاڵێنیت. ئەم مرۆڤە نەناسەی ئەمشەو چارەنووسێکی رەش کردیتیە تێشك‌گری جەستەی بێ‌گیانی، بە گەورەیی وێنەی مەرگی لە پێش چاوت‌دا بەرجەستەکرد، مەرگ بە هەموو مەزنی‌و دزێوی‌و دڵرەقی خۆیەوە لە توێی تەرمەکەی بەردەمتەوە خۆ

دەنوێنێ، بۆنو دەنگو ڕەنگی زەردی خۆی بەسەر ئەم هەوارە تاریکو خامۆشەدا پەخش دەکات. تۆ لە دووریی چەندان فرسەخەوە دەنگو ڕەنگی مەرگ دەناسیەوە، ئاوێتەی گشت ساتەکانی ژیانت بووە.. مەرگ تەمەنتە لە منداڵییەوە.. یەکەم دیمەن کە هەموو بەیانییەك پێڵووەکانتی لە ئاست واڵا دەکەیتو دوا دیمەن کە شەوان پێڵووەکانتی لە ئاست لێك دەنێیت.. دیمەنی تاڵو سامناکی مەرگە: خانووەکەتان لە سێ لاوە بەسەر گۆڕستانی «سەیوان»دا دەڕوانێت.. لە هەیوانو پەنجەرە بچکۆلەکانی هەردوو ژووری تەنیشتی ڕاستو چەپەوە تاکە دیمەن کە بە درێژایی مەدای سەرنجی مرۆڤ ڕاکشاوە.. دیمەنی کێلو خۆڵەو ساباتی ئاسنینی سەر گۆڕەکانە. ئەوسا.. ئەوسای ڕۆژانی زەردی منالّی.. بەیانیانی هەینیو سێ شەممەو یەکەم ڕۆژێ جەژنانو زۆر ڕۆژانی تریش لەسەر گوێسوانەی خانووە بچکۆنەکەتان تروشکەت دەکردو لە ئافرەتە ڕەشپۆشەکان ڕادەمایت، لە دوورەوە بەرەوە ڕیشۆڵە دەچوون، دەستە دەستە لە پایینی گۆڕەکاندا هەڵ دەتروشکانو دەگریان.. دەیانلاواندەوە زۆر جار ڕۆرۆو لاواندنەوەی پڕسۆزی ئافرەتێکی دڵ بریندار لەو دوورەوە دەهاتە گوێتو تەزووی بەدەمارەکانتدا دێنا.. تەنانەت جار جارە ئەسرینی گەرمیشی پێ دەڕشتیت.. خۆشت نەتدەزانی بۆ دەگریایت؟ دووبارە بوونەوەی بەردەوامی ئەو دیمەنە درامییەو بە هەمان گەرمو گوڕیشەوە سەرسامی دەکردیت.

هەفتەی چەند جارێك دەبوویتە تەماشاکەری ئەو دیمەنە سوواوە، لە سیمای بێ ئارایشتی ژێر «عەبا» ڕەشەکان وورد دەبوویتەوە.. زۆریان دووبارە دەبوونەوەو جارجارەش سیمای نوێ دەکەوتە نێو تۆڕی سەرنجتەوە، هەرکە تەرمێکی نوێش بەرەو گۆڕستان دەهێنرا.. لە چاوتروکانێکدا خۆت دەخزاندە نێو ڕیزی پرسەدارانەوەو چیرۆكو سەرهاتی مردووەکەت دەپرسی، بە بێدەنگیش لە ڕەهێڵ کردنی تەرمەکە لە گۆڕنانو خۆڵ بەسەردا کردنی ڕادەمایتو بە وورییایی چاودێری سیما ماتو خەمبارەکانت دەکرد، بێدەنگیی قورسی ئەو کەشە سیحراوییە سەراسیمەی دەکردیت. هێند لە گەڵ ئەو دیمەنانە ژیاویت بە چاکی شارەزای دابو نەریتی ئەلّقین دادانو تەرم ناشتن بوویت.. تەنانەت گەلێك جار لە ژوورە بچکۆلەکەتاندا لە کەسێکی هێمنو سیحراویدا لاسایی یەکە یەکەی جووڵەی مەلاو گۆڕهەڵکەنو پرسەدارانت دەکردەوەمەرگ دێوەزمەیەکی زەبەللاحە بەسەر ڕۆژانی زەردی تەمەنتەوە، «گردی سەیوان» دوومەڵێکی چارەگرانە لە بەرامبەر خانووەکەتاندا قوت بووەتەوە.. خانووە بچکۆلەکەتان بۆتە بەشێك لەو... بۆتە گۆڕێك لە گۆڕە بێژمارەکانی تاکە ئاوازو سەمفۆنیا کە گوێیەکانتان زیاد لە هەموو شتێکی دیکە پێی ئاشنان سەمفۆنیای قورسو خاوی مەرگە، گەلێك جار هەوڵ دەدەیت سەدای جارسکەری کپ بکەیتو تارمایی ڕەشی لە ناختدا بسڕیتەوە.. ڕادیۆ پێ دەکەیت.. گەرەکتە هارەی گۆرانییەکی کەیف بەخش دارەڕاو کۆڵەکە ڕزیوەکانی کۆنە خانوو بێنێتە لەرزەو گەواڵەی ڕەشی پرسەو ماتەم لە ئاسمانەکەی ژوور سەرت بڕەوێنێتەوە.. کەچی کاتێك بە ئاگا دێیتەوە سەدای مەقامێکی خەمهێن فرمێسك لە چاوی دارەڕاو دیوارە بۆرەکان دەهێنێ! گەلێك جاریش خامە دەست دەدەیتیو دەتەوێ وێنەی دیمەنێکی سروشتیی ڕەنگاو ڕەنگ بکێشیتو تاریکیو ڕەنگی ڕەش لە دیدەکانتدا بسڕیتەوە کەچی هەر هێندە بە خۆ دەزانیت کاغەزە سپییەکەی بەردەمت بۆتە باخێکی ڕووتو بێ گەڵای پایزی زەردو قەلە ڕەشی شوومو مەرگ بە ئاسمانیدا هەڵ دەفڕێ. ئەوسا ئیدی کە لە بێهوودەیی هەوڵەکەت دڵنیا دەبیت.. خۆ دەدەیتە ژێر لێزمە بارانی مەرگو ماتەمو بەقەد قووڵاییو بێسنووریی چاوەکانت گۆڕستانو ئافرەتە ڕەشپۆشەکان لە ئامێز دەگریت.. لێ دەگەڕێیت ئاوازی خەمناکی مەرگ بڕژێتە ناختەوەو گشت گەردیلەو خانەیەکی جەستەت بۆنی مەرگو پرسە بگرێ.

گەلێك جاریش گومان دڵی کرمێ کردوویت.. گومان لە خۆت.. لە بوونو ژیانو زیندوویت..

«من زیندووم یان مردووم؟ خۆشم نازانم.. وڕو کاسمو لە هیچ ناگەم، هەڵبەت دەبێت زیندووبم.. ئەوەتا هەناسە دەدەمو گوێم لە ترپەی لێدانی دڵمە... وەك هەر مرۆڤێکی زیندوو دەبینمو دەبیستمو قسەش دەکەم.. ئا.. ئا.. وایە، بەڵام.. بەڵام بۆ لە هەموو شتێکدا بۆنی مەرگ دەکەم؟! کەللەم پێشانگای هەزاران تابلۆی مەرگ ئامێزەو گشت بیرۆکەو خەونەکانم لە تەوەری مەرگدا خول دەخۆن.. نا.. من لە مێژە مردووم... لە مێژە ڕۆحم تێکەڵ خاكو خۆڵەکەی «سەیوان» بووە».

سەرما لەسەر زەوییە شێدارەکە گرمۆڵەی کردوویت.. هەردوو ئەژنۆت لە قەفەزی سنگت گیر کردووەو باسکەکانت لێ شەتەك داون، واهێدی هێدی تاریکییەکەی دەورت دەڕەوێتەوەو ئیدی هێندە نابا یەکەم گزنگی ڕووناکی بەسەر چیاکەدا پەخش دەبێو بەرەو دامێن دادەکشێ، ئەم شەوە پڕ ترسو ئازارو دوودڵییە کۆتایی دێت. سەرنجت لە سەر تەرمەکە سەقام گیرە.. بزەیەکی تاڵو پڕ کەسەر لەسەر لێوانت نیشتووە، تۆی بێزارو لە تەرمو گۆڕو پرسەو لاواندنەوە.. بێزار لە ترسو دڵەڕاوکێو ئیقاعی قورسو خاوی مەرگ.. ئەمشەو ڕێکەوتێکی نالەبار

ِدیته ئێشكگری تەرمی نامۆیێك، تۆی لە ڕەنگی ڕەش هەڵاتوو.. ـ
ـرەكت بوو ئاوازی خەمناكی پرسە لە گوێكانتدا كپ بكەیتو تارمایی
ـرگ نە ناختدا بخنكێنیت، دەتویست ئیدی بۆنی ژیان كونە لووتو
ـیەكنت پڕ بكاتو زیندووبیت! كەچی ئەمشەو بوویتە هاوڕێی
ِدوویەكو هێندەی گشت ڕۆژانی تەمەنت ئاوازی خەمهێنی مەرگت
ـستو قەتماغەی دەیان زامی بەسوێ لە دەروونتدا هەڵ درانەوە،
ـنگە نەسرەوتەكانی ناخیشت بەرەو ڕووی هەڵبژاردنێكی قورسیان
ِدوویتەوەو لە گێژاوی دووڕیانێكی بە تەمو مژتەنراودا وڕیان كردوویت..
«واتاریكو ڕوونی بەیانە.. درەنگە.. كاتی ئەوە هاتووە بەڕێ بكەوم..
.. ئیدی هەڵ تروشكانو دۆش دامان هیچ مانایەكیان نی‌یە، بەڕێ
ـكەومو تەرمی ساردی ئەم مرۆڤە نەناسە كلۆڵە.. ئەم مرۆڤە خۆشبەختە..
ـ كۆڵ دەنێم، گەر ئێسكو برِبرەكانم لێك ترازاونو هەرچوار پەلیشم لێك
ِونەتەوە.. جێی ناهێڵم.. تادەیگەنمە جێیەكی ئاوەدانو وەك هەر
ِدوویەكی دی دەشۆرێو كفن دەكرێو دەنێژرێ.
ـ ئەمە شێتی‌یە.. كەللەڕەقی‌یەكی بێمانایە.. من لە دیمەنی دزێوی تەرمو
ـقاعی قورسی مەرگ هەڵاتووم.. كەچی ئێستا لە پێناوی مردوویەكدا بە
ـیی خۆم بە گەرووی مەرگدا ڕۆچم؟ بۆ دەبێت خۆ بكەمە قوربانی‌ی
ِدوویەك؟ مرۆڤ كە مرد هەموو شتێك تەواو دەبێت.. لای ئەو هەموو
ـتێك دەمرێ.. ژیان نامێنێو تۆپی زەوی دەبێتە هەڵم، ئەوسا هیچ شتێك
بایەخی نامێنێ، لە گۆڕێكی زێڕیندا بنێژرێ یان جەستەی ببێتە لانەی
كرمو مارو مێروو.. سروەبا بیلاوێنێ یان گەردەلوول.. بۆ ئەو وەك یەكە!
ئیدی هەموو هەوڵو ماندوو بوونێك ڕەنجی بە هەدەر چووی فەرهادە.
ـوڕێنەیە.. ترسنۆكی‌یە.. چۆن دەتوانم وابەسانایی بەسەر ئەم تەرمەدا
هەنگاو بنێمو لە كۆچە زەردەكەی خۆمدا بەردەوام بم؟ گەر وابكەم.. تا
هەم تەنیا ساتێك ناحەوێمەوەو هەردەم ناڵەو هاوارو نەفرەتی ئەم مرۆڤە
بێگیانە لە كەللەو ناخمدا دەزرنگێنەوە، نا.. ئەمە كردەی من نی‌یە.. خۆ
من زۆربەی ڕۆژانی تەمەنم لە گەڵ مردووان بەسەر بردووەو بوونەتە
بەشێكی گەورەی بوونم.. نا.. هەموو كەسێكی تر ئەوە بكات.. من
نایكەم.»

هێشتا دەنگە جیاوازەكانی ناخت هەر لە هەڵچوونو داچووندان،
شێت ئاسا رادەچەنیت.. لە چاوتروكانێكدا وەك بالیفێك هەڵگریت..
تەرمەكە لە كۆڵ دەنێتو بە هەنگاوی خێرا توولە ڕێكە دەدروویتەوە..
هەنگاوێك.. دووان.. سیان.. دە... پازدە.. هەنگاوەكانت هێدی هێدی
خاو دەبنەوە.. نم نم ئارەقەت لێ دەتكێو پێش چاوەكانت لێڵ دەبن،

هێشتا هەنگاوی بیستەمت نەناوە كە لە ناكاو ئێستێك دەكەیت.. مێخ
ئاسا لە جێی خۆت دەچەقیت.. گەرەكتە شەقاو هەڵبێنیتەوەو بەرەو
پێش خۆبكوتیت.. بەڵام قاچەكانت لە دوات نایەن.. ماندوو نیت كەچی
ئەژنۆكانت شل بوونو بڕستی خۆڕاگرتنیان نەماوە، بە دەوری خۆتدا خول
دەخۆیت.. تەرمەكەی كۆڵیشت تادێ شانت قورستر دەكا. بەر لە چەند
ساتێك هەر كە هەستت كرد لە گێژاوی پێكدادانی دەنگە دژەكانی ناخت
قوتاربوویت، خێرا لە ماوەی چەند چركەیەكدا تەرمەكەت لە كۆڵ ناو
بەڕێ كەوتیت بە گڕ هەورازو ماندوو بوونەدا دەچوویتو پێت وابوو چیدی
هێزنی‌یە بتوانێ هەنگاوەكانت خاوبكاتەوەو بڕیارەكەت پووچ بكاتەوە،
كەچی ئەوەتا لە بیست هەنگاو زێترت نەبڕیوە گەردەلوولی دوودڵیو
گومانو ڕاڕایی لێت ئالأیەوەو هەنگاوەكانی سڕ كردیت، ئەوەتا پەیكەر
ئاسا لە جێی خۆت چەقیویت.. ئەژنۆكانت دوو كۆڵەكەی ڕزیوی
كۆڵیتێكی نیمچە ڕووخاونو چیدی بڕستی خۆڕاگرتنیان نەماوە.. شانەكانت
قورس بوونو هاوسەنگیت شێواوە.. گاە بەلای ڕاستو گاە بەلای
چەپدا لاسەنگ دەبیت، هەست دەكەیت گەر تەنیا ساتێكی دی
لەسەر ئەم حاڵە بمێنیەوە.. بەلادا دێتو خۆتو تەرمەكەی سەر شانت
هەرەس دێننە سەر عەردە ڕەقەكە، خەمی خۆت نی‌یە.. لە كەوتنو گلان
باكت نی‌یە.. خەمی تەرمەكەتە.. دەترسیت لە كەوتنو بەلادا هاتنێكی
كتوپڕدا ڕكە بەردێك كەللەی شەق بكات یان دەلاقەیەك بكاتە سنگی
ساردی. هێدی هێدی نەوی دەبیتو دێیتە سەرچۆك... ئەژنۆ
لەرزۆكەكانت لە زەوی‌یەكە توند دەكەیتو بەكاوە خۆ هەروەك ساوایەكی
نوستوو لە نێو لانك بنێیت.. تەرمە شلو قورسەكەی سەر شانت لەسەر
خاكە شێدارەكە درێژ دەكەیت.. «ئاهـ!» لە گەڵ ئاهێكی قووڵدا خەمو
بێزاریو تووڕەییت ئاوێتەی تاریكی‌یە ڕەمویوەكەی دەوروت دەكەیتو
هەروەك لە ژێر باری هەرەسی كێوێكی هەزار ساڵە قوتار، بوویت
بەلادادێیتو لە تەنیشت تەرمەكەوە هەڵ دەتروشكێیتەوە، كەللەی وڕت
مەیدانی جەنگی تەڕوادەیە، بە ئاسەوە دوا جگەرەی پاكەتی «بەغدا» كە
پێ دەكەیت.

وڕو كاس.. نیگا وێڵ.. هەناسە سوار.. چاو تەڵخو تەماوی.. بێزارو
هەراسان.. بە قووڵایی تەنیایی‌یە سامناكەكەی خۆتدا ڕۆدەچیتو جگە
لە ژاوەژاوی بێسرەوتی دەنگە دژەكانی ناخت هیچی دی نایستیت.

**تۆكتۆبەری ١٩٨٦**

O

# دەروازەیەکی رەخنەیی

محمد تیمور

# درامای نوێی کوردی

به‌شی دووه‌م و كۆتایی

## ڕووداوی گشتی

**The Whole Fabula**

هەر شانۆگەری‌یەك پیشاندانی ڕووداوێکی گشتی‌یە. ڕووداوی گشتیش چێوەی ئەدەکی‌ی واقیعێکی لاسایی‌کراوە. یا چیرۆکە فراوانەکە پیشاندانە. جا چیرۆکەکە سەر بەزێی کۆمەڵی ئادەمیزاد بێ. یا باڵندەو گیان لەبەرو بووکە شووشە. کە چەند بەشی سەرەکی‌و لاوەکی‌ی - Themes - لە ئامێزدەگرێت. جا شانۆگەری‌یەکە ڕەدەی داهێنان بێ. یا لە ئەفسانەو داستانو مێژوو یا لە حیکایەتێکی کۆنو بەسەرهاتو چیرۆكو ڕۆمانێکی نوێ وەرگیرابێ. هەر ئامادەکراوەکە بە دراما یا بە شانۆنامە دادەنرێت. چونکە یەکسەر بۆ سەر شانۆ نووسراوە. نەك بۆ خوێندنەوەو. بە هیچ جۆرێکیش هەست بە بوونو هەناسەی نووسەر ناکرێ. لە تەك

دەرەکتەرەکاندا . هەر جۆرە درامایەکیش بەبێ ڕووداوی گشتی نابێت. بازارەکی‌و ئیرتجالی‌و پانتومایم بێ. یا بینەران هاوبەشی‌ی پیشاندان بکەن. ئەمەش جۆرە دەقێکی سەرپێی‌یەو. بەبێ جەوهەریش نابێتو فەلسەفەیەکی لەپاڵدایە.

نووسەر زۆر چاك دەزانێ کە مێژووی واقیعێك بە شێوازە هونەری‌یەکەی خۆی دەنووسێتەوە. با مێژوو نووس‌و. کامیرە هەڵگریش نەبێت. ئەوەتا لە ڕێگای شانۆگەری‌یەکانی ئەسیناوە لە مێژووی گریك دەگەین. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە. دەڵێین شانۆگەری‌یەکانی عبد الرحیم ڕەحمی هەکاری‌و. أحمد حمدی صاحبقرانو جلادت عالی بدرخانو أبو بکر هەوری مۆرکی مێژوویی سەردەمی خۆیانیان پێوە دیارەو. هەر نووسەرێکیش مافی ئەوەی نی‌یە دەستکاری ڕاستی‌یە مەزنەکانی واقیعو مێژوویی بکات. گەرهاتو ئەوەشی‌کرد ئەوە بە خۆی ئەم هەڵوێستەی هەڵبژاردووەو مافی قەدەغەکردنی ڕادەربڕینی خەڵکی‌تری بۆ نی‌یە. جا بۆ ئەوەی زیاتر لە ڕووداوی گشتی بگەین کە وەك پروازو قەپێکڵێکی کۆکەرەوەی شانۆیی‌یە - Play - شانۆیی (خانزادێکی‌تر) بە نموونە دەهێنینەوە...

برای خانزادێکی‌ترو هەڤاڵەکانی کە یەکێکیان دۆستی خوشکەکەیەتی. بە

.رزگانی‌یەوە خەریکن‌و هەموویان لەگەڵ بازرگانێکی شاری بەغدا ئاڵوگوری دەکەن‌و هەڤاڵەکان‌و تاکە یارو بازرگانەکە بە پیلان ژەهر دەرخواردی کاکی خانزادێکی‌تر دەدەن‌و، خانزادێکی‌تر بەمە دەزانێ‌و، لە یارەکەی هەڵدەگەڕێتەوەو، لە ئەوەندا تاقی‌گەری‌یەك دەگێڕێ ؛ بەڵام لە تۆڵەی براکەی لەشکری ناکوژێ‌و، لە پاش خۆ گەیاندنە قەناعەتی بێ گوناهی تاکە یار، بە هۆی بەدەرکەوتنی خاتوو خانزادی پەشیمان‌و گێڕانەوەی لەشکری بۆ چۆنێتی پیلانی بازرگان جا خانزادێکی‌ترو لەشکری ئاشت دەبنەوەو، چیرۆکی دڵداری بەسەر دەکەوێت‌و خێزانێك پێك‌دەهێنین‌و، بەکورتی ئەمە ڕووداوی‌گشتی‌یەو کورت‌تریش دەکرێتەوە، یا درێژترو. لە چەند چیرۆك‌و ووردە باس پێك‌هاتووەو، لە پێشەکی‌ی ڕەخنەی درامانی‌دا دەنووسرێ بۆ ئەوانەی دراماکەیان نەدیوە، یا نەیانخوێندووتەوەو، لە جەماوەری بینەران زۆرترن‌و، ئەمەش ناچێتە ڕیزی ڕەخنەگرتن‌و، خستنە ڕووێکی کورتەی ڕووداوی گشتی‌یەو ، هیچ جۆرە تێرامانێکی ڕەخنەیی تێدانی‌یەو، خستنەرووش لە عورفی ڕەخنەدا بە ڕەخنە ناژمێردرێ، گەربێت‌و تێبینی‌ی ڕەخنەییشی لە باردابێ‌و، هەموو کەسێکیش بە سەیرکردن، یا بە خوێندنەوەیەکی ئاسایی هەر درامایەك دەتوانن ئاوا کورتی بکەنەوەو، بەبێ خۆماندووکردن چەند وردە زانیاری سەرپێ هەڵێنجێنن ؛ بەڵام ناگەنە بنج‌و بنەوانی بزووتنەوەو، کارو کاردانەوەی‌کردەی هێڵەکانو، لە پەناو کەلێنەکانی دیارو نادیار تێ‌ناگەن‌و، هەر ڕووداوێکی گشتیش کە زۆر دوورو درێژبێ، بەکەم بزوتنەوەو کاری گەیێنەر بێ ناتوانێ پرسیارو وەڵام بۆ هێڵەکانی خوێ پەیدا بکات‌و، هێڵێکی ڕوونی سادەو ساکار دروست‌دەکات‌و ، سەرنەکەوتنی‌هەندێ دراماو چەند چیرۆك‌و ڕۆمانی کوردی‌و شیعرە نوێ‌یەکان لێرەدایە، کە ناوەرۆکەکانیان لە شێوەی دەنگ‌و باسێکی ڕووتدا لە چەند دیمەنێکی مەیبودا بە هەشتاوی دێن‌و دەڕۆن‌و، ڕوودانیان مەودا نادیارو تەسك‌و چێوە داشکاون. کەواتە ڕوو داوی گشتی‌و ڕوودان جیاوازی‌یەکی زۆریان لە نێواندا هەیەو، ئەگەرچی بەیەکترەوە بەندن‌و، یەکتر پێك دەهێنن، هەر بۆیە بە تەنیا لە ڕوودان‌و چۆنێتی‌ی هەر دوو جۆرە چنین دەدوێین‌و، بۆ ئەو مەبەستەش باسی چۆنێتی یەکەکانی (هاوارێکی تاساو) دەکەین‌و، درامای خانزادێکی‌تر شی‌دەکەینەوە...

کورتە شانۆیی (خانزادێکی‌تر) درامایەکی ئاسایی‌یەو، سێ چارێکە نیوە شەوی شەوێکی زنجیرەی زەمەنی‌ی بەسەرهاتی خانزادێکی‌تری هاوچەرخ پیشان‌دەداو، شانۆکەی شانۆیەکی (ژوور)ەو، دۆخێکی تراژیدیی لەباردایەو، تێکەڵ بە بینای دراماکەی بووەو، بێجگە لە حەمباڵەکان بە چەمکی نوێ‌ی تراژیدیادا، کارەکتەرەکانی‌دیکە تراژیدی نین، بەڵکو چەند نموونەی پیتی بۆرژوان‌و، ڕیبازگەی (خانزادێکی‌تر) ڕیالیزمی‌یەکی تەعبیریی خوودی‌یەو، لە شێوەیەکی چنین لێکدراودا، بەکردەو دژەکەی هەوڵی ڕەوا دانە خۆی دەدا، بۆیە دەتوانین بڵێین «خانزادێکی‌تر» جۆرێکی درامای فکری‌یەو، بینەر دەدوێنی‌و بە تەمایە بینەر بیری سەرەکی‌و بیرۆکەی بزوێنەری پەسند بکات‌و، ڕێگای باور پێ‌کردنی بۆ خۆش بکرێت، لە بەرگێکی دڵداریدا، کەوابێ چەشنە ڕاگەیاندنێکی کلێشەیی لەدەم دایەو، هەندێ لە بینەران (خانزادێکی‌تر) یان بە درامایەکی مێژوویی لە قەڵەمدا، گوایە باری خۆناساندن لە پۆپەی کارەساتە مێژوویی‌یەکە دەستی پێ‌کردووە، هەر چەندە باری بنچینەی خانزادێکی‌تر بێجگە لە پەیوەندی‌یەکی فەلسەفی نەبێت. هیچ جۆرە پەیوەندی‌یەکی بە کارەساتی میرنشینی سۆرانەوە نی‌یەو. گەر پۆپەی کارەساتە مێژوویی‌یەکە باری

خۆناساندن بوایە، شێوەی چنین لێکدراو نەدەبووو.ژەهرلەدەرخواردداندا دەستی پێ‌دەکرد، کە پۆپەی کارەساتی میرنشینی سۆرانە بە تێکرایی‌و هۆی گرێ‌ی سەرەکی‌ی چیرۆکی تۆڵەسەندنەوەیە، بەڵام تارمایی خاتوو خانزادی سۆران لە (خانزادێکی‌تر)دا لە زنجیرەی زەمەنی مێژوویی (خانزادێکی‌تر) بەدەرەو. گونجاندنی دوو بەسەرهات لە پێناوی هاوکێشەکەی جەوهەری دراماکەدا بووو. نەیتوانی مێژووییکی نوێ بهۆنێتەوەو، گومانیش لەوەدا نی‌یە واقیعی ؛ یا باری گشتی‌ی دیاری هەر دوو بینای ئاسایی‌و ڕەمزیی (خانزادێکی‌تر) هاوچەرخ بوون‌و خانزادێکی‌تریش خانزادی سۆران نەبوو، بەڵکو هەر کەسێکە خۆی لە هاوکێشەکەدابدۆزێتەوە

## ڕوودان
## Action

لە درامادا ڕوودان بزوتنەوەو، سەرئەنجامی بزوتنەوەیە، پاشگەز بوونەوەی بۆنی‌یەو، لە سفریشەوە دەست پێ‌ناکات، کاتێ کە بە «هەستی شانۆیی»و «هەستی دەرهێنان»و هوشیار بوون بەرامبەر بە (ئامۆژگاریی شانۆیی) درامایەك دەخوێنینەوە، یا دەبینین بزوتنەوە – Movement – ی ڕوودان وا دەکات لە ناوەوەو دەرەوەی هێڵەکانی دراما تێ‌بگەین‌و، گەلێ زانیاری‌و شارەزایی‌مان لا گەڵاڵە دەبێت‌و، جەوهەری دراماکەمان بۆ خورددەکرێتەوەو، هەر بزوتنەوەی ڕوودانیش دینامیکی‌یەتی ململانێ‌و گرێ‌یەکان گەشە پێ دەداو، ڕووداوی گشتی دەخولقێنێ‌و بەرەو دووا سەرئەنجام[٢١] دەبات‌و بە تێك شکاندنی دیواری چوارەم لە مەودای سێهەمدا بە پێ‌ی جەوهەری دراماکە لە دووا چڤانۆکدا هەڵویست‌و مەودا فەلسەفی‌یەکەی بەرامبەر بە باری بنچینە دەردەخسێنێ‌و، بینەریش بە بۆچوونی خۆی ئەو حاڵەتەی سەرئەنجام شیتەڵ دەکاتەوەو، بۆ هەر بەرهەمێکیش چەپڵە لێ‌نادات، ئەگینا شانۆ لە هەر سێ مەوداکانیدا تووشی نەخۆشی‌بووە.

لە درامادا ڕوودان بە گشتی، هەمووی لە یەکتر هەڵکێشراون‌و ڕوودانی ئاوێتەش نی‌یە، بەڵکو ڕووداوی ئاوێتە هەیە، کە چەند باس‌و چیرۆکی یەکەکانی بینای درامان‌و، بە هۆی چنین لە پێناوی مەبەستی سەرەکی‌و سەرئەنجام کورت کراونەتەوەو پەیوەندی‌یەکانیان لە شێوەدا نابینرێن‌و لە ڕوودانێکی گشتی‌دا کۆدەبنەوەو، بەرامبەر بە یەکتر دێن‌و دەڕۆن، یا بە پیچەوانەی یەکتر هێڵەکان یەکتر ڕوون دەکەنەوەو، بینەریش وا تێ‌دەگات کردەوەکە ئاوێتەیە یا ئامێری‌یەو، هەر لە ناو خۆیدا سەرهەڵدەدا هەر وەك شانۆیی «هاوارێکی تاساو»و «خانزادێکی‌تر».

کەچی لە دراما چنین ئاسایی‌یەکاندا هەر چەندە ڕووداوی گشتی کورت بکرێتەوە، یەکەکانی ڕوودان لە شێوەیەکی سروشتی‌دا دژ بە یەکترو یەك لە دووای یەك دێن‌و دەڕۆن، هەر وەك «مەمی ئالان»و (دڵداری‌و پەیمان پەروەری)، ئەگەرچی لە هەر جۆرە درامایەکدا بنکەی ڕاپەڕینی هێڵەکانی دراما هەر یەکەو بە تێکرایی چەند

ووردە باس‌و چیرۆکی سەر بە هۆیەکانی خوودی‌و دەرەکی‌ی خۆیان‌و هۆو سەرئەنجامی یەکترین‌و، ڕیزەی زەمەنی‌یان هەڵدەکشی‌ێو یەکەی گشتی‌ی دراما پێك‌دەهێنن‌و یەکەکانی یا چیرۆکەکانی نادژو دژی – Counter Unit – باری گشتی دیارن‌و بە باری بنچینەوە بەندن، تەنیا لەبەر بەیەك نەچوونی دیاردەکانی کۆمیدیا پەیوەندیی دۆخی یەکەکانی بە دەگمەن بە باری بنچینە دەچن، یا لە شێوەدا وەك دراماکانی‌تر دەبن، هەر چەندە لە گشت جۆرە دراماکاندا دۆخەکان سەر بە باری بنچینەن، گەرهاتوو پیشان‌بدریێ، یا پێناسەبکرێت، واقیعی بینای دراما خۆی بەدیی دەیکات..

لە شانۆیی‌یە چنین لێکدراوەکاندا هێڵی زنجیرەی زەمەنی‌ی ڕووداو جۆرە جیاوازی‌یەك بەرامبەر بە هێڵی نادیاری ڕووداو دەنوێنی‌ێو گەیاندنی ڕووداوی گشتی بە هێڵێکی سەرەکی‌ی ڕاست‌و دروست وەك درامایەکی چنین ئاسایی ناڕوات، بەڵکو دوو ئاستی بەرامبەر بە یەك وەردەگری‌ێو هەر ڕووداوێك بە بەرامبەرەکەی زەندی دراماییی دەدرێتێ، ئەگەرچی پێکەوە هێڵی سەرەکی هەڵکشاون‌و، لە یەك بنکەی باری بنچینەدا دەستیان پێکردووە، جا زنجیرەی هێڵی زەمەنی‌ی مێژوویی پاش‌و پێش دەکات. جاری بۆ پێشەوە، جارێکی‌تر دەکشێتەوەو،[٢٢] تەوەری – Sujet – چیرۆکێك یا زیاتر دژی یەکتر ڕادەگیری‌ێو زەندی دراماییی دەبەخشن‌و یەکتر دەخۆنەوەو ئەوەی مەبەستی چنینە، بەسەر دەکەوێت‌و جاری وایش هەیە کشاندنەوەی هونەری لە ناو کشاندنەوەدا بۆ هەمان مەبەست ڕوودەدات‌و باری بنچینەو باری گشتی‌ی دیار ڕوون دەکاتەوەو، دووا جاریش هێڵی دراما ئاستی خۆی وەردەگرێتەوە، بۆ نموونە:–

شانۆی (ژوور)ی ئەستاف لە (هاوارێکی تاساو)دا باری خۆناساندنی، یەکەم تابلۆیە، بەلاّم سەرەتای ڕاستەقینەی بەسەرهاتی «ئەمیلیان» نی‌یە، بەڵکو دۆخی کۆتایی‌یەکانی ژیانی (ئەمیلیان)ە لە پاش تەقینەوەی گریێی سەرەکی، کە ڕوو بە ڕووبوونی ئازادی‌خوازان‌و ڕژێمی قەیسەری بووەو، هەوڵی کوشتنی قەیسەر دراوەو، لەبەر چۆنێتی چنین بە پێش خراوە، جا بینەر لەو باری خۆناساندنەدا بەتەواوی لە باری بنچینەو پەیوەندیی کارەکتەران‌و ڕابووردووی «ئەمیلیان» ناگات‌و، بە ڕێگای خەونی ئەمیلیان، بینەران دەچنە بەندیخانەو لە چۆنێتی باری بنچینەو، هۆی شلەژان‌و نالەباری‌ی ئەمیلیان دەگەن‌و، لە بەندیخانەشدا بە هۆی دەرزی لێدان (زیرەکی بەکارهێنانی ئەکسسوار) ئەمیلیان‌و بینەران بە هۆی (سلایدات) دەگەڕێنەوە ماڵی ئەمیلیان، کە چەند ماوەیەك بەر لە ژوورەکەی ئەستافی‌یەو، ژیانی ڕۆژانەی ئەمیلیانی زۆر شوخ‌و چاپوك‌و ژن‌و منداڵەکەی لە هێلانەی خێزاندا دەبینین، کە سەرەتا ڕاستەقینەکەی «هاوارێکی تاساو»ەو، مەوداکانی باری بنچینەشی لە باردایە، جا بەندیخانەکە یەکەی نادژی باری بنچینەیە – Basic Situation – و لەگەڵ ماڵی ئەمیلیان بەتێکرایی کە باری گشتی‌ی دیارن‌و، یەکەی ژوورەکەی ئەستاف ڕوون‌دەکەنەوەو، بە باری‌بنچینەوە دەیبەستن، کەناکۆکی‌و بەگژیەکدا چوونی نێوان دوو جیهانی ئازادی خوازو ڕژێمی ڕوسیای قەیسەری‌و هەوڵدانی کوشتنی قەیسەرە (هەوڵدانەکە ناسێندراو پێناسەکرا) لە پاش ئەو زەندە دراماییی‌یەدا هێڵی دراما بە پێش دەکەوێتەوەو، بینەر ژوورەکەی ئەستاف دەبینی‌ێو، ئەملیان نەخۆشەو، لە سەرە مەرگ‌دایەو، چراکەی دەست ئەستاف دەکوژێتەوە، (دووا سەرئەنجام)و، سەکۆی شانۆ نامینیێ، جا ئەم پاش‌وپێش کردنەی دژ بە یەك، یا بەرامبەر بەیەك، بینەر تووشی لێکۆڵینەوەو، بەراووردکرن دەکاو، هەوڵی ڕاست‌کردنەوەی هێڵی زنجیرەی زەمەنی‌ی ڕووداوی گشتی‌دەدات‌و، بەم خۆماندوو کردنەش زۆریی ڕاستی‌ی هێڵەکانی باری بنچینەو مەوداکانی لە مێشکیدا ڕوون‌دەبێتەوە، کەچی هەر وەکو پێشتر باسمان‌کرد، ئەم حاڵەتە بەهۆی ڕووداوی گشتی ڕوونادات‌و جیاوازی‌یەکانی نێوان ڕووداوان‌و ڕووداوی گشتی لێرەدایەو، بۆ ئەوەی زیاتر : لایەنەکانی دیکەی هونەری درامای کوردمان بۆ ئاشکرا بێت، شانۆ «ژوور یا ناو ماڵ»ەکەی خانزادێکی‌تر دەکەین بە نموونە، کە باری خۆناساندن بە شکاندنی هونەریی یەکەم دەژمێردری‌ێو دوو چیرۆکی تۆڵەسەندن‌و دڵداری بە باسە لاوەکی‌یەکانیانەوە لە شێوەی یەکەکانی دژو نادژ – Anti Counter Unit –دا بەرەنگاری یەکتر دەبن‌و یەکتر دەخۆنەوە..

کە پەردە دەکرێتەوە ، لەگۆشەیەکی سەر سەکۆدابەرامبەر بەچاوی چەپی بینەر (تا زیاتر سەرنج ڕابکێشریێ) ژوورێکی دیکۆر تەعبیریی ڕیالیزمی دەبینری‌ێو ، کچێکی شۆخ‌و شەنگ‌و ، سەرو سیما – Profile – کزی چاو لە خەو ، ڕازاوەتەوەو ، کراسێکی ئاسایی‌ی ئاڵی کراوەی خەوتنی لەبەردایەو ، قژەکەشی بە گوێرەی سەردەمی بینەران ڕێکخراوەو خورت‌و خەریك دیارەو ، تەمەنیشی (٢٥) ساڵ دەبێت‌و نابێت (سەرنج ڕاکیشان‌و ناساندن بە مەودای بەدەنی‌و ڕواڵەت‌وماکیاج) گورج‌و ئامادەیەو سروشی هێمنی‌و خۆش باوەری‌و چاوەنواری دەدات ، دەرگای ژوورەکەی داخراوەو ، پەنجەرەی ئاسنین شووشە بەندەو ، بە ژووری ماڵێکی ناو شار دەچی‌ێو کاتیش شەوە (ناساندن – Personification –بە تیشك‌و دیکۆر) کەسێتی‌ی خانزادێکی‌تر بە کچێکی شارستانی دەناسێندرێت‌و ، لە هاتوو چۆکردندایەو ، کلیلی بزووتنەوەی زۆر بەتێنەو سەرتاپا جەستەی ناز دەفرۆشی‌و سنگی والآیەو مل‌و ئەستۆی ڕووتەو دووشان‌و ملی شەریانەو ، سەربەستی‌و هەست‌کردن بە کەسێتی‌ی خۆی دەنوێنی‌ێو ، شایانی سوارێکی ئاواتە وەك هەموو کچێکی هاوتەمەن (ناساندنی دەروونی بە ڕواڵەت‌و بزووتنەوەی دیار) کلیدی بزووتنەوەی گەشەدەکاو ، دەچێتە نێوان قەروێڵەی دوونەفەری‌و میزتوالێتی سیستەم نویێ (ناساندنی جێگا بە ئەکسسوارو زەپۆشی گشتی) دەبیێ تەنیایی خانزادێکی‌ترو ، ئەم حاڵەتانەی لە ژوورێکی ئاوادا کە بە ماڵی خۆی دەچێت‌و ناچێت لەبەر چی بیێ؟ ! ئایا سەیرکردنە ئاوێنە لە باوەر بەخۆبوونە ؟ ، یا باوەر بە بەخت‌و نەسیبە ؟ ، چونکە ئافرەتی کورد بەر لە شووکردن‌و کاتی مارەکردن‌و لە بە بووك چوونیشدا دەچێتە بەر ئاوێنەو ، کە دەگوزرێتەوەش بەر بووك ئاوێنەی لەبەر ڕادەگری‌ێو ، حەوت ڕۆژی ناو پەردەش ئاوێنە بەجیێ ناهێڵێت ؛ بەلاّم خانزادێکی‌تر ، ئەنگوستیلەی لە پەنجەدا نی‌یە ، (گرنگی ئەکسسوار) و ، قەروێلەکەش دوو نەفەری‌یەو ، دوو باقە تیشکی ئاڵو بنەوشەیی لیێ دەدات ، کپی‌ی دراماییی نێوان بزووتنەوەی خانزادێکی‌ترو مەندبوونی لە ژوورەکەدا ، وامان لێدەکات بڵێین خانزادێکی‌تر بەم درەنگی شەوە چاوەڕێی‌ی یەکێکەو خۆشی‌یەکی ڕابووردوو لە داهاتووێکی

ناخۆشدا دەبینێ ، یا خوشی‌ی داهاتوو مەستی‌کردووە ، چونکە ئادەمیزاد لە حاڵەتی ئاواداو لەبەر ئاوێنەدا بیر لەخۆی‌و هەرسێ مەوداکانی تەمەن دەکاتەوەو ئاوێنەش بەگشتی هێمای ئەو حاڵەتانەیەو ، بۆیە خانزادیکی‌تر بە هەردوو دەستی قژە جوانەکەی بەنازەوە هەڵدەخاو لەتۆ وابێت دوو دەست لەیەکتر ئاڵاندن‌و ناوقەد گرتن هەوڵی زاڵ بوونە سەر خەیاڵێکی نامۆ دەدات‌و لە دووایدا بەبێ باکی هەر لە پێوە تاکە کتێبی ژوورە بێ کتێبخانەکە دەخوێنێتەوەو ، کتێبیش هێمای بەسەرهات‌و تاقی‌کردنەوەو هەوڵێکە ، ئادەمیزاد بە مەبەست دەیخوێنێتەوە ؛ بەڵام خانزادێکی‌تر بە نارەزارایی‌یەوە زوو دایدەخا (کپی درامایی) دەبێ ناوەرۆکی کتێبەکە لەگەڵ بەسەرهاتێکی ناخۆشی بگونجێ‌و ، دەچێتە بەر ئاوێنەو سەری شانە دەکاو ، خەم دەروێنێ‌و ، بەخۆی دەخەفێ (تامەزرۆیی داگیرساندن) و ، شتێکی لە دڵدایەو ، پاش ئەوەی چەند جارە تەماشای کاتژمێر دەکات (ووشیارکردنەوە) درەنگەو چاوەری‌کراو نەهات‌و ، خانزادێکی‌تر خۆی دەدوێنێ (شکاندنی بێ دەنگی) :- نەء هەردێ - بێدەنگی - ئەمجارە هەردێ - بێدەنگی - دڵنیام - بەتووندی - لەشکری - کپی درامایی - (بەهێمنی) ئەوە بووە سێ شەو (بێدەنگی) سێشەوە ، بریارە بێت (کپی درامایی) ئەگەر ئەمجارە نەهاتی (بەتووندی) خۆم دەزانم چی‌دەکەم - بۆن لە خۆی دەدا - بێدەنگی - سەیرە دەڵێی لێم دەترسێ (بێدەنگی) یا هەستێکی کردووە (کپی درامایی) ...

ئەگەر هاتوو بیرمان لەو خۆدوواندنەی خانزادێکی‌تر کردەوە ، هەست بە قسەیەکی ئاسایی برگە بە پاش‌و پێش خراو دەکەین ، ئالێرەدا دەڵێین : - هەندێ وا تێ‌دەگەن گەرهاتوو هەر قسەیەکی ساکاری بێ‌سوودی درامایی ئاوەژوو بکرێتەوەو پاش‌و پێش بکرێت دەبێ بەدراماو گەر ووشەکانیش بەریزو ئەستوونی رێکخران ، ئەوە شیعری لێ دەردەچێ ! ! کەچی ووت‌ووێژەی درامایی دەربرینی ئاسایی‌یەو ، بنەماکەی کردەو حاڵەتەکانێتی‌و هەندێ جاریش ووشەیەك جێگەی دەیان رستە دەگرێتەوەو دراماش وەك چیرۆك‌و رۆمان پەنا ناباتە بەر وەسف‌کردن‌و ، پیشاندانی پالپشتێتی‌و خۆ هەر قسەیەکی ئاسایی‌ی بە ژمێرە لە دراما بەدەر نی‌یەو کارەکتەریش بەگوێرەی مەبەست‌و حاڵەتەکانی خۆی دەدوێ ، کەوابێ پێشتر قسەی شەق‌و پەق بۆ ئامادە ناکرێ‌و ، بەداخەوە ئەم دیاردەیە لە هەندێ درامای کوردی‌داو لە «خانزادێکی‌تر» دا زاڵەو کاری کردۆتە سەر بزووتنەوەی دیمەنەکان‌و ناخی دەروونی هەڵوێستە دراماییەکان‌و ماوەی رووبەڕووبوون‌و پرسین‌و وەڵام‌و هێرش‌و کشانەوەو نزیك‌بوون‌و دوورکەوتنەوەی شێواندووەو ماوەی گونجان‌و نەگونجانی کردەکانی زۆر تەسك کردووەو ، بۆتە دەنگ‌و باس‌و زۆر هەناسەی ژێرە دەق‌و بیرکردنەوەی بینەری بڕیوە ، جا لێرەدا شێوە ئاسایی‌یەکەی قسەی خانزادێکی‌تر دووبارە دەنووسینەوەو ، ووشەکانی زیادو ئامۆژگاری‌یە شانۆیی‌یەکانی لێ‌فڕێ دەدەین ، کەچی مەبەستی قسەکە ناگۆڕێ :- «ئەوە سێ‌شەوە ، بریارە لەشکری بێت .. دەڵێی هەستێکی کردووە ! ، (نەء هەردێ ئەمجارە هەردێ .) دووبارە کردنەوەی هەردێ دڵنیایی‌یەو ، پێویست بە ووشەی دڵنیایی ناکات‌و دەڵێی هەستێکی کردووە ، بە چۆنێتی نواندن‌و کپی‌ی درامایی دەسەڵات‌و هەرەشەو ترسی لێ بەدەی دەکرێ کەچی نووسەر (نەء . هەردێ .. ئەمجارە هەردێ . دڵنیام) ی پێش خستووە تا لەگەڵ هاتنی لەشکری‌دا نەگونجێ ، تا گرژبوون دەربارەی هاتن‌و نەهاتنی لەشکری پەیدا بێ ، هەر چەندە لە سەرەتاوە ئەو حاڵەتە دروست ببوو ، بۆیە گونجاندنی (ئەمجارە هەردێ) لەگەڵ هاتنی لەشکری زیاتر تامەزرۆیی دادەگیرساند کە دەبێ لە پاش گرژبووندا بیری لێ بکرێتەوە ، هەروەها گەر دڵنیایی لەو رادەیە بێت نابێ دوودڵی‌ی بەدووادا بێت ، کەوابێ پاش‌و پێش خستنی برگەکانی قسەی خانزادێکی‌تر لە جێگەی خۆی نەبوو ، چونکە یەك لە مەبەستەکانی خۆدوواندنەکە ئامادە بوونی لەشکری بوو ..

بە هەر حاڵ کە پەردە دەکرێتەوە تا خۆدوواندنەکەی کارەکتەری خانزادێکی باری خۆناساندنی کورتە شانۆیی «خانزادێکی‌تر» کرۆکی خۆی بۆ بینەر ئاشکرا دەکات‌و ماوەی بابەت خستنە رووش دەدات ، کە لە پاش دانیشتنی یەکەم جاری لەشکری‌ی لەسەر کورسی‌دا دەست پێدەکات‌و لێرداش پێویستە بووترێ کورتە شانۆیی یەکان هەرلەپێوە دەست پێ ناکەن‌و باری خۆناساندنی خانزادێکی‌تریش گرفتێکی ناوەراستەو بەهۆی چنینەکەی کە لێکدراوە بەرەو سەرەتای راستەقینە ئەنجام دێت‌وەدەروات..

خانزادێکی‌تر لە خۆدوواندنەکەیدا چەند حاڵەتێ دەنوێنی :-

دوو دڵی‌و دڵنیایی ، گازاندەو سوو لەخوبوونەوەو ، سەر سوورمان‌و هێمی‌و هەرەشەکردن‌و لە خۆبایی‌بوون‌و دەسەڵاتداریتی ، هەروەها هۆیەك بۆ ئامادە نەبوونی سێ جاران دەدۆزێتەوە (هۆی گری‌ی سەرەکی) ، بەڵام باسی ناکات دەیشارێتەوەو‌بەدووای دەخات ، لە هەمان کاتدا چۆنێتی تەلەفوزکردنی خۆدوواندنی رەفتاری خانزادێکی‌تر هەوڵی ئەوەی‌دا چێوەی چقانۆکەکە زیاتر بشکێنێ لێك‌ترازان‌و بابەت‌و ووردە باس‌و رەفتاری کارەکتەران لە دوو ئاستدا روون بێتەوە لە ئاستی سەر شانۆو لە ئاستی بینەراندا ، چونکە لە خۆدوواندنەکەی خانزادێکی‌تر بە ناساندن بە قسەو بە ناساندن بەرا لەشکری ناسێندرا ، کە دڵدارێکی بەڵێن شکێنە پێشتر خوا خوای بوو خانزادێکی‌تر ببینێ کەچی ئەوە سێ جارە بەڵێن دەشکێنێ جاری چوارەمیش هێشتا ئامادە نەبووەو ، شتێکیشی دەرحەق خانزادێکی‌تر کردووە زانیوێتی خانزادێکی‌تر بە کردەوەکەی زانیوەو لەترسان ئامادە نابێت ، بەڵام ئەمجارە هەردێ چونکە وا دیارە بەڵێنێکی خۆشی درەنگە شەوێ لە خانزادێکی‌تر وەرگرتووە هەروەها ، لە خۆدوواندنەکەدا بە گوێرەی خانزادێکی‌تر ناساندنی خودیی تێدایە . کە دەسەڵاتدارەو هەموو شتێکی پێ دەکرێ‌و لە گرفتێکی سەخت‌دایە بە هۆی کردەوەکەی لەشکری ، کە تەنیا جارێ هەردووکیان بەکردەوەکە دەزانن‌و بینەر هیچی لێ نازانێ ، جا بۆ گەیشتنە چۆنێتی ئەو کردەوەیەو هۆی نەهاتنی سێ جارەی لەشکری ، خانزادێکی‌تر بەڵێنی خۆدانەدەستی بە لەشکری داوە ، بۆیەش خۆی رازاوەتەوەو ، بۆن بەکار دەهێنێت‌و ژوورو قەرویلە دوو نەفەری‌یەکەی وا جوان رێخستووە ، چونکە گەر مەبەستی شتێکی‌تر بووایە لە پاش نەهاتنی سێ جار لەشکری جەب‌نەدەدرا ، کەوابێ خانزادێکی‌تر دەیەوێ بەرووارد‌ێك لە نێوان زانیاری‌یەکانی خۆی‌ولەشکری‌بکات‌و بینەران نازانن خانزادێکی‌تر چۆن پێشوازی لەشکری دەکات

بەلاٰم ئاشکرا کردنی ناوی لەشکری و ناونیشانی دراماکەو بەلێنی شەوو. ئامادە
نەبوونی لەشکری و گفتی خۆدانەدەست هاوکێشەیەك لەگەلٚ بەسەرهاتی خاتوو
خانزدای سۆران دروست دەکات و

> چوارەمین هەولٚی خانزادێکی تر بە دووا هەولٚی خاتوو خانزادی
> چل بسك دەبەسرێتەوە ، کەلە پاش هەولٚیکی زۆروو بە بەلێنی
> شووکردن بە لەشکری سەرکردە لەشکری و چل سوار
> رابکێشێتەوە قەلاٚتی سۆران و بە تەگبیری ئاوایی هەر سوارێك لە
> مالێکدا دابەزن و لەشکری سەرکردەیانیش بووە میوانی خاتوو
> خانزادی چل کەزی و دەرگای ژووری میر سلێمانی بۆ کردەوەو
> خانە خوێیەکانیش بە شەو لە سەری هەر چل سوارەکانیان داو
> لەگەلٚ سپێرەی بەیانی سەرەکانیان لە دیوەخاندا لە بەر دەم خاتوو
> خانزاددا کۆمەلٚ کردو ئینجا وورده وورده کەوتنە کوشتنی
> لەشکری

کەواتە لەشکری هاوچەرخ براکەی خانزادێکی تری بەکوشتن
داوەو. خانزادێکی تریش بە بەلێنی خۆدانەدەست وای کردووە. کە لەشکری لە
ژووانگەکەدا ئامادەبێت. بەلاٚم ئایە دلٚدارەکەی خۆی دەکوژێ. یا بە گوناهباری
نازانی؟! (ژێرە دەق + سەرە دەق) زەپۆشە سیکسی‌یەکەی باوەش دووتیشکی ئالٚی
شەیدایی و بنەوشەیی پەرۆشی ناو گلٚپەی زەردی سارد تێکەلٚ بە سوورێکی گەش
(ناساندن بە زەپۆشی گشتی) وا دەکات بە شەوانی ئالٚی تێبگەین و لە شەوانی ئالٚیشدا
زۆر شتی خۆش و سەیرو سامناك روودەدات بەلاٚم ناساندنە جوراو جۆرەکانی چنین
کارەکتەری خانزادێکی تری لە دەروازەیەکی خودیٚ نەزعەی تاکەکەسی‌دا ناساندو
وای لە بینەر کرد ئەنجامی دراماکە بە خۆش ئەنجام --APPY END--ی ژووانگە
کە بزانیٚ ئا لەم حالٚەتانەی باری خۆناساندن کە تێکرایی دراما ئاشکرا دە
کات. پێویستە ئاگامان لە چۆنیێتی رووداو هەبێو سەرنج بدەنیە لایەنە
هونەرییەکانبە ساردی سەیری پیشاندان نەکەین و لە هدلتگەو هۆیەکانی ناوەر
ۆك بگەیە. ئەگینا پێویست بە دتین و خوێندنەوەی تەواوی دراما ناکات،
بە تایبەتی ئەوانەی سوودیان لە مێژووو. فولکلۆر وەرگتووە، چونکە زانراون

کاتێك تەپەی پیٚ دیٚ. خانزادێکی تر گوێقولاغ دەبیٚو (گوێزرا
نەوەی دیمەن و هوشیارکردنەوە) لە بەر پەنجەرەدا سەر
دەتکی دەکاو لە نێوان قەروێلەو میزی توالێت. لە کلیل دەگەرێو، د
دەستە کلیلێك دەدۆزێتەوەو لە پەنجەرەوە داوێتە خوارەوە (ناساندنی مەو
دا کانی جێگا. کە کۆشکەو حەوش و بانی هەیەو لەشکریش لە دەرەوەیە
)و. جا خانزادێکی تر چەرچەف و بالیف چاك دەکاو. شەش ئاگرێك بەر
دەبێتەوەو بە ئەسپایی هەلیٚ دەگرێو. هەر لەژێر بالیف دەیشارێتەوە (گرژ
وون و گوایە شتیٚ روودەدا) دەرگا لە دەرەوە دەکرێتەوە. بەلیٚ لەشکری
هت. بەگەرم و گوری لە تۆ وا بێت گورکی بەدوواوەیەو خۆیدەکا بە ژوو
وکەدا. ئەفەندییەکی کەترەو دەم و چاو مەپپوبوو. کلیدی بزووینەوەی ئالٚو
زی کەسێتی هەلٚەپاسێکی دەنواندو. بە خەندەیەکی ساردو سرو خۆی ب
ە سەرداری مالٚ دەشوبهاند. بە شێتایی دەنگە کەخەکەی خانزادێکیتری
دەلاواندەوەو دەچەمایەوە!! جۆرە کشانەوەیەکی لە ناخدابوو. خانزادێ
کیتر دەرگا قفل دەداو پەنجەرەکەش جوان دادەخا (ئامادەکردنی بینەر) بەلام

ئەم حالەتەو چوونە پشت لەشکرییو سەر قەروێلەو دلٚدانەوەی ـە شکری
ییو دانیشتنی لەسەر کورسیدا کە نەدەبوایە بەم جۆرە ئامۆژگاریە شانۆییـنە
پێناسەبکرێت، دۆخێکی ئاساییبوو، وای بەدەرخست کە هیچ جۆرە گر
فتێکی وا زۆر سەخت لە نێوان هەردووکیاندا نی‌یە (...دەزانم چەند تاوانبا
رم دەرحەق بەرێزت بەلاٚم بروا بکە گوناهبار نیم...) کەوابیٚ لەشکری
بە هەموو شتێکیدەزانی خەمیشیٚ هەر رێزو ولٚداریيەکەی خۆیەتیو دوو ق
ۆلٚی قوتابییانەی لەشکرییو خانزادێکیتر دەروازەیەکی زۆر ساردی هەلٚکش
انی هێلٚی سەرەکیی درامابوو روو بەروو بوونەکە مەوادی بەرەو دوندی گر
یٚ سەرەکیی گەرم نەکرد ووت‌ووێژی لەشکری بە بسك کردنەوەو خەلٚك ت
تاوانبارکردن و خۆشەویستیی خانزادێکیتر داوای لیٚ بوردنیدەکرد. هێرشی
خانزادێکیترو کشانەوەی کارەکتەری لەشکریی بیٚ باوەر زیاتر خزمەتی لای
ەنی تۆلٚە سەندنی ووت‌ووێژە بەیەك نەچووکانی خادزادێکیتریکردو
مەسەلەی ژەهر دەخواردان زەقتربوو (ناساندن) بەکارو بە هۆ)، کەچی
دەبوایە کیی دراماییگشت لایەنە بەیەك نەچووەکانی ووت‌ووێژی خانزادێ
کیترو لەشکری بە تەواوی بەرجەستەبکرێت و، نزیك بوونەوەش رووبدات

بە تایبەتی کە لەشکری لەسەر کورسی دادەنیشیٚ، یاکە خانزادێکیٚ
تر بە خەندەیەکی سەرکەوتن و دلٚ پر لە ئارەزوو دەلیٚت: (تا ئەوادەیە من
ت خۆش دەوی؟! ، باسی جوانیو شۆخیو دلٚدارێمبە.

با رابردوو بنێژین، کای کۆن بەبا نەکەین (ناساندنی دەروون) جا وەق
عی هەردوو حالٚەتی دوورکەوتنەوەو نزیك بوونەوە بە هۆی یەکتری دەهات
ەکایەوەو، وەلاٚم و وەلاٚمدانەوەش– Retortes – بە تێنتر دەبووو، چۆنێتی
بینای ووت‌ووێژ بە دەردەکەوت و، دۆخی دەروونیی کارەکتەرانیش
دەناسێندراو، دەروازەی تاقیگەری و تاقگەری‌وکە یەك تەخت بەرچاوی
بینەری نەدەگرت، بە داخەوە بیٚ باوەری کارەکتەری لەشکری هەر لە
سەرەتاوە ئەو پێویستە دراماییانەی هەلوەشاندبوو ووت‌ووێژە
نەهوشیارەکەشی یاریدەدەری بوو (من ئێستا لە مەیدانی جوامێری دلٚداری
تۆدا بێگومان دۆراوێکی کۆسکەوتووم (ناساندنی تاکەکەسی و نموونەیی)
من لە پێناو گرەو بردنەوەی نێرگزی لاویەتیم تەنیا تاکە هیوایەکەم ماوە)
ئەویش تاقیکردنەوەی چوارەمە، بۆ ئەو مەبەستەش دەبوایە بینەران
رابهێنرێن و تاقیگەری بێتەکایەوەو بە رێگای لەشکریی‌تروخانزادێکی‌تر
بینەران بەسیٚ تاقیکردنەوە تێپەرن (شانۆ بۆ بینەرە) تا گونجاندنی
ئەرستۆتالیزمی بێتەدی، بۆیە لەشکری بەو گوریسە بەستراوە کە بە
شێوەیەکی سەیر لەسەر دەرگا هەلٚواسرابوو، دەشیٚ سەیری هەلٚواسین
لەبەر ئەوە بووبیٚ، تا بینەر بە پێش بەستنەوەکە نەکەوێت و لەشکریش بە
ناشارەزاو بیٚ ئاگا تێبگات و لە بایەخی بەستنەوەکەش کەم نەبێتەوە،
ئەگەرچی لەشکری بۆ هەموو شتێکی خانزادێکی‌تر ئامادە بو ، شەش
ئاگریش هۆیەکی بەتێنتر بوو لەسەرنج راکێشاندا، چونکە هەموو شتیٚ
باس کرابووو زۆر بلێی گێرانەوەو، بەستنەوەو، هەرەشەی کوشتن و شەش

ئەگەر لە سەرچاوو سنگ‌و دڵ دانان هەمووی بۆ تەنگاوکردنی بینەران بوو تا بەزەیی بە لەشکریی بێت‌و، بە چاوێکی سەلبی بیر لە لایەنی مێژوویی هەردوو لەشکریی نەکاتەوە ؛ بەڵام وا دیار بوو مەسەلەکە لەو جۆرە بۆچوونانە گەورەتر بوو، چونکە هەردوو لەشکریی بە هەموو شتێکیان دەزانی، لەشکریی هاوچەرخیش برای خانزادێکی‌تری هوشیار نەکردەوەو سێ جاریش بەڵێنی شکاندو، تا بەڵێنی خۆدانەدەستی وەرنەگرت لە جاری چوارەمیندا ئامادە نەبوو، سەرەرای ئەمەش خانزادێکی‌تر جەیی‌دا ئەگەرچی، دینامیکیەتی رووداوو رووداوی گشتی تاوانباری‌کرد، بۆیەش دیمەنەکە جامی‌کردو دۆخێکی مەیوی وەرگرت، کە بەزۆری لە کۆمیدایادا باوەو، لە پێناوی تاقیکردنەوەی چوارەمینیشدا میلۆدرامایانە پەنا بردرایە بەر ناکاوی (خوداوەند لە ئامێرەوە) لە پاش دەنگدانەوەدا، تا تەقینەوەی گرێی سەرەکی لە پەنای مێژوودا رەوای بدرێتێ، تارمایی خاتوو خانزادی سوارانی پەشیمان لەسەر ئامێرێکی بە پێچکە بەدەرکەوت، بەرگێکی کوردیی کراس زەردی زۆر تۆخی (هێمای راستی) لەبەر دابوو، جەوهەری دراماکەی بە رێگای ئامۆژگاری کردنی خانزادێکی‌تر بە بینەرانی راگەیاند:-

پێویستە بە خوێندنەوەی دووەمی مێژوو، چەوتی‌یەکانی مێژوو چاپکرێنەوەو، گوێ نەدرێتە رق‌و ناکۆکی یەکانی مێژووو، قسەی خەڵکی‌و هەندێ قسەی نەستەق‌و پەندی پێشینان باوی نەماوەو، مەرجیش نی‌یە قسەیەك بکەوێتە شازێك قسەکە راست بێت‌و، گەر یەکێك نەیتوانی بەرامبەر بەکارێکی ناهەموار بوەستێ، ناچارو بێ‌چارەو سزا نادرێ‌و، دەبێ چاو پۆشی لە هەندێ شت‌بکرێ، تا هەموو شتێك هەروەکو خۆی لێ‌بێتەوەو، دڵداری‌و ئارەزوو بپارێزرێ‌و تووشی شکستی نەبێت‌و ئافرەت‌و پیاویش بەبێ یەکتر ناژین. جا ئەو فەلسەفەیەی (خانزادێکی‌تر) لەشکریی بە گوناهبار دانەناو سزادانی لەشکریی سەرکردەش بە هەڵەیەکی مێژوویی داناو، پەیوەندی‌یەکانی بایۆلۆژی‌و سروشتی‌ی نێوان ئافرەت‌و پیاویش لەسەرووی گشت پەیوەندی‌یەکانی کۆمەڵ. (وەك من‌مەکە، وەك منت لێ‌دێ، سێ جار زیاتر دووبارەکرایەوە) یا (بوومە میر، بەڵام میرێکی بێ‌دڵ، میرێکی ناشاد، میرێکی بێ‌ئوجاغ، بە دەستی خۆم نێرگزی لاویەتیم هەڵوەراند، بە ئارەزووی خۆم ئوجاغی خۆم وێران کرد) جا خوداوەند لە ئامێرەوە فەرمانی کشانەوەی هونەریی‌دا پیلانی کۆری هەڤالانی لەشکریی (چیرۆکی باری بنچینە) پیشان دراو خەبەری کابراکە (یەکەی دژو هۆیەکی گرێ- رەت‌کرایەوەو بووە بوختان‌و بەزانیاری‌یە نوێ‌یەکانی تاقی‌گەریی ئامادەکردن - Civlizing-خانزادێکی‌تر شارەزایی‌یەکی نوێ‌ی بۆدۆزرایەوە (تەقینەوەی گرێ)و، ماوەی بیرکردنەوەی بۆبووو، لە ناخی دەروونیدا تووشی کودەتایەکی قول بووو گۆراو، دژی هەڵگەرانەوەی یەکەمی‌هەڵگەرایەوەو، چیرۆکی تۆڵە سەندن راونراو، چیرۆکی کۆنە دڵداری بووژایەوە (لێژی هێڵی دراما) لەشکریی تاکەیارو خانزادێکی‌تر لە جەرگەی گڵپەیەکی زەردی

سپی‌ی پاتی زەمین ئاڵی خوێنین، ئاشت‌بوونەوەو چیرۆکی خێزانێ دوو کەسی زۆر شاد پێك‌هات (چارەسەرو کۆتایی)و، بە خۆ ئەنجام Happy EnD - دراماکە دوایی‌هات. جالێرەدا هەر بە هۆ رووداو نەك بە هۆی رووداوی گشتی لە دیوی دەرو ژووری دراما تێگەیشتین کە چۆن یەکەکانی دژ باری بنچینە(خەبەری کابراکەو یەکە هەڵگەرانەوەی خانزادێکی‌ترو، بەستنەوەی لەشکریی) بەرامبەر یەکەکانی نادژ بەزی (بەدەرکەوتنی تارمایی خاتوو خانزادی سۆرا سەرگوزشتەی لەشکریی‌و دووەم هەڵگەرانەوەی خانزادێکی یەکەیەکی نادژی -Anti counter unit- باری بنچینە لە کۆتایی (ئاشت بوونەوەی هەر دوویارو پێك هێنانی خێزانێك) پەیدابووو خۆی بەدووا سەرئەنجام لە قەڵەم‌دا.

لێرەداش بەراووردکردن لە نێوان (خانزادێکی‌تر) و (ئۆدیب) سۆفۆکلیس، بێجگە لە بە یەك‌چوونی چوونێتی چنین چەند خاڵێکی هونەری‌و ئایدیۆلۆژیمان چەنگ دەکەوێت، هەر چەندە بینەری ئ چەرخە بە چاوی بینەری سێ هەزار ساڵ لە مەوبەر تەماشای قەدە رێکەوت‌و هەڵەو، سزادان‌و، سزانەدان‌و، بەهێزیی‌و، بێ‌هێز کارەکتەر ناکات، جا گەر قەدەرو، توورە بوونی خوداوەندەکان‌و، نەزانین (ئۆدیب) ی بەرەو هەڵەکانی هاندابێ، ئە کارەساتی نەفرەتی ئاسمان‌و رق‌و کینەی شەیتان‌و، ناهەمواری کەرو خۆشەویستی‌ی براو خەبەری کابراکەو قسەو قسەلۆکی شارو ئەوا کەلە ئەندێشەی میللی‌دا هەر وەك خۆی پارێزرابوو، هەردو لەشکریی‌ی کۆن‌و هاوچەرخی گوناهبارکردو، دڵی هەر دو خانزادیشی رەق کردو، لەشکریی سەرکردە بەغەدر کوژراو، لەشکر دووەمیش خەریك بوو بکوژرێت، بەڵام بیرکردنەوەو گۆڕ رووی‌داو، دڵی خانزادێکی‌تر نەرم بووەوە، لەگەڵ لەشکریی‌دا ئاشت بووەوە، کەواتە (ئۆدیب) ی سۆفۆکلیس بە خەبەری شوانە پیرەکە ناوەوە تووشی کودەتایەکی قوول‌بووو، خۆی سزاداو شاری (تیبە) ر رزگاری بوو، کەچی بەپێچەوانەوە، هەر چەندە هەڵەکانی‌لەشکریی نوێ لە هەڵەکانی (ئۆدیب) کەمتر نەبوو، سزا نەدرا، کەو هۆکارەکانی واقیع لە لای سۆفۆکلیسدا ئیجابین، بۆیە (ئۆدیب) پا هووشیار نەکرایەوەو، لەبەر لاساریی‌و هەڵەپاسی‌و زۆرداری‌و خو رێژی سزادراو، شار بەدەرکراو، بەڵام لە لای خانزادێکی‌تر هۆکارەکانی واقیعی بە سەلبی دانراو بەرپەرچ‌کراو، بە شێوازی ئارەزوو ئارەزووی خودی‌و، دڵداریی دووکەسی پەیرەوکرا، رەخنە لە هەڵسەنگاندندا بیر لە هەڵویستی پێشینی نووسین‌و کامل بوونی نووسیندا دەکاتەوە، گەر سۆفۆکلیس‌و خانزادێکی‌تر لە سەرەتاوە ئ جۆرە هەڵویستەیان نەبوایە ئەنجامی دراماکانیان وا نەدەبوو، کەوا ئۆدیب هەر لە سەرەتاوە لاوازو، بێ‌هێزە، لەشکریی‌و

خانزادێکی تریش بەتین‌و توانان (دوو شتەکەت هێناون ،بیدە ، راستدەکەی) شتەکەش دوو ئەنگوستیلە بوون ، کە لە سەرەتاوە ، لە گیرفانی لەشکریی‌دا بوونو ، بێجگە لەوەی کە بەڵگەی خۆدانەدەستە لە جاری چوارەمدا ، هەروەها بریاری پیشەکیی چنینە دەربارەی لەشکریی کە کارەکتەرێکی بەهێزو جێگای بروایە ، بۆیەش (خانزادێکی تر) دژ بەرومانسی‌یەت هەردوو دڵداری شادکردەوە . ئەگەرچی لە واقیع دوورکەوتەوەو جۆرە رومانسی‌یەتێکی نەرگسی‌یانەی بۆ رەخساندنو رەفتارو رێبازیش لە هەر جۆرە .درامایەکدا چۆنێتی کەسێتی‌و خووی خودیی کارەکتەرو چنین بەدیار دەخەن ..

**-خوداوەند لە ئامێرەوە–** خوداوەند لە ئامێرەوە زاراوێکی جیهانی‌یەو ، بەکارهێنانی مانای لاسایی‌کردنەوە نادات‌و ، بەشێوەیەك لە شێوەکاندا ، لە ئەدەب‌و ، هونەری ، کوردیدا ، لەباوە ، لە چیرۆك ، لە حیکایەت‌و ، ئەفسانەو ، داستانەکاندا لە (دێوی سپی‌و لاس‌و خەزاڵ‌و خەج‌و سیامەندو مەمی‌ئالان‌و گردی رەش‌و کوێخا سێوی‌دا ... هتد) ، لە لای هۆمیرۆسیش ، بە شێوەیەکی‌تر ، لەباو بوو ، لە «ئەلیادە» دا هەڵگرتنی (هێلین) بە رووداوێکی دەرەکیی نائاسایی دێتە بەرچاو ، کەچی هۆمیرۆس بە تاکە هۆی داناوە ، تا رەوایی بداتەداگیرکردنی وولاتەکەی خۆی ، یا دەبینین بە نارەوایی لە پاڵەوانێتی (هکتور) کەم دەکاتەوە ، کە بەرگری لە زەویی بەرماڵی خۆی دەکا لە جەنگی (ترواده) دا ، بەلام هۆمیرۆسی ئەزمیری بە هەنجەتی خوداوەندەکان (هکتور) ی مەزن بە دەستی (ئەخیل)ی سادیی درندە بەکوشتن دەدات ، بە جۆرێکی وا درندایەتی ئورۆستوکراتی‌یەتی یونانی‌یە شەرفرۆشەکانی لێ دیارەو ، چەند برگەیەکی «ئەلیادە» بە زمانی خیتی‌و هوری دۆزراوەتەوە کە پێنج سەد ساڵ بەر لە هۆمیرۆس نووسراوەتەوە ، هیچ دوور نی‌یە دۆزراوەکانی نوێ زۆر لە بەیت‌و بالۆرەکانی هۆمیرۆس‌و بیستراتۆس ئاشکرا بکات ..

لە شانۆیی ئەسیناشدا بۆکردنەدەی گرێ فێڵی خوداوەند لە ئامێرەوە ، تەنیا شێوەیەکی هونەری نەبوو ، بەڵکو جۆرە فەلسەفەیەکی میتافیزیقی‌و ئایدیالیستی‌ی لە پاڵدا بووە ، گەربێت‌و خوداوەندەکان چارەنووسی میللەتیان بەدەستەوە بێت ، ئەوە هەر ئەوانیش دەتوانن گرێ کوێرەکان بکەنەوە ، ئینجا هەر چۆنی‌بیکەنەوە بینەر مافی سی‌و دووی بۆنی‌یەو ، لە ماوەی بەشی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ناتۆرالیزمی‌یەکانیش هەلس‌وکەوتی ئادەمیزادیان بە هۆکارەکانی بایۆلۆژی‌و وویراسەت دەبەستەوەو روویان دەکردە داهێنانە نموونەیی‌و نائاسایی‌یەکان دوور لەهۆکارەکانی واقیع‌و ، تەنیا پشتیان بە جەبری چاوەدیری‌و ئەزموونگەری‌و شارەزایی دوور لە ناوەندو دەوروبەر دەبەست‌و باشەو خەرابەیان بە یەك دەزانی‌و بۆئەو مەبەستەش چەشنێکی خوداوەند لە ئامێرەوەو قەدەریان دەنواند هەروەکو چاخگیریی نوێ کە لە چەند بەرگێکی ئارەزووی خودی‌و تاکەکەسی‌و تەوژمی هۆش‌و رێکەوت‌و غەریزەی جۆراو جۆرو بێزاری ژیانی رۆژانەو پەراوێزی ژیان پیشاندەدراو ، کارەساتی سەرەتا گەرم‌و بنەتا سارد لە دراماکانیاندا دەبیندراو ، بەکت‌وپری‌و لە ناکاویدا چارەسەر دەکراو ، زۆر بلێیی‌و شەرە قسەو دووبارەکردنەوەوەی برگەکانی ووت‌وو یژو ، خۆدوواندنی دوورو درێژو برگەی بروسکەیی‌و جووینەوەی ووشەیەك‌و چەند ووشەو ناساندنی لاوەکی‌و خودی لە داهێنانەکانیاندا بینەرانیان خەریك‌دەکردو خۆیان لە چارەسەرکردنی باری گشتی‌ی دیاری دراما نەدەداو گەشەکردنی رووداو‌و رووداو لە پێناوی پاراستنی باری بنچینەدا لەگەڵ ئاستی رێکی بینای ناوەوەیان نەدەگونجا(٢٣)

## باری خۆناساندن

باری خۆناساندن —Initial situaton— ئەو بارەیە کە نووسەر لە چنیـ
ی بەرهەمەکەیدا دەستی پێکردووە (پێشەکی بەرایی - سەرەتا - خستنەر
وو - دەروازە)و، بەشێکی ئۆردووگانیی زۆر گرنگی جەستەی چنینەو، ک
رۆکی هۆو مەبەست‌و دژو نادژو، رەفتاری کارەکتەران‌و مەرجەکانی بزووتنە
وەیان دەناسێنی‌و، ئاشناستی‌و، کی تەواو لەگەڵ بینەران دەبەستی‌و،
یەکەو سەریش نایاندوێنی، کەواتە باری خۆناساندن یەکەیەکی سەربەخ
ۆ نییەو لە واقیعی باری گشتیی دیاری دراما جیاناکرێتەوەو بەبێ ژیاری‌و گێ
انی هەمان واقیع نایەتەدی‌و، هەر جۆرە ر ووداوێکیش باری خۆناساند
نی بەخۆوەیە، ئەگینا پەیوەندی‌یەکانی کۆمەلایەتی‌و، ژیانی تێکرایی ئادەمیـ
زادو، بوونی کۆمەل نەدەهاتەدی ! ! بۆیە باری خۆناساندن بە وەستایی پ
ەردە لە رووی بنەمای تێکرایی بەرهەم لادەدا، بەبێ ئەوەی هەموو شتی
بە جارێك بەدەستەوە بدات، هەروەکو ژدان ئاسایی ئادەمیزاد لە ژیان دەگ
ات‌و ناگات‌و بە هەول کۆشش هەموو لایەنێکی دیکەی لا ئاشکرا دەبێ
، دراماش هەر وا باری خۆناساندن دەیناسێنێ و، هەر یەکەیەکی دراماک
ەش خۆناساندنی Anitlaalباردایە، چونکە هەر یەکەیەکیش مەودای
تایبەتیی خۆی هەیەو، گشت توخمەکانی بینای دراماو بنچینەکانی سەر بە
یاساکانی دەرهێنان‌و، نواندن‌و، رۆناکیو، دیکۆرو، مۆسیقاو
ئەکسسوارو، ووت‌وویژەو رەفتاری کارەکتەران‌و ناساندنەکانی‌ئاسایی‌و
چۆنێتی چنین باری خۆناساندن دروست‌دەکەن‌و، مەرجیش نی‌یە،
یەکەوسەر لە پاش باری خۆناساندن دراماکە بەرەو دوند بڕوات، یا
نەڕوات، یا لە دوندەوە دەست پێ‌نەکات ، ئەوە ئارەزووی نووسەرە،

یا چۆنێتی ڕووداوی گشتی ؛ بەلاَم دەبێ زۆر ناسك‌و یوختەو سەرنج ڕاکێش‌و تێرو تەسەل‌و پرمانا بێت‌و نووسەر بتوانێ گشت پێویستیەکانی سەلی‌وئیجابی دراماکە بە تەواوی ئامادەبکات‌و، هێلی دراماکەش بەرەو هەلّکشان هان‌بدات، ئینجا سەرهەلّدانی باری خۆناساندن توندو تیژ (محمد سێوێ) دەبێ، یا بە ئەسپایی (خانزادێکی‌تر) یا بە نواندنی پانتۆمایم (گوندەکەم بەجێ ناهێلم) یا بە خۆدوواندن (مەمی ئالاَن‌و دلّداری‌و پەیمان پەروەری) یا سامناك (مانگی ئاوابوو)ی هونەرمەنر جلیل زەنگەنە یا بەلاَم نابێ هەر سۆو، تامەزرویی داگیرساندن‌و حەپەسانی بینەران تاکە مەبەست بێ، بەلّکو دەبێ شێوەو ناوەڕۆك پێکەوە بناغەی دراما نجەنە ڕوو، جا لە دراما چنین ئاسایی‌یەکاند باری خۆناساندن لەگەلّ باری بنچینە دەگونجێ وەك (مەلیك‌و محمدو سێوی و مانگی ئاوابوو، جەنابی جەناوەرەو لاس‌و خەزال) کەچی لە مەمی ئالاَن‌و محاوەرەی ئیقتصادی‌و دلّداری‌و پەیمان پەروەری‌دا باری بنچینە بەپاش دەکەوێت، کەوابێ باری خۆناساندن لەو جۆرە درامانەدا مەودایەکی باری بنچینە دەگرێتەوە، کەچی لە دراما لێکدراوەکاندا حالّەتێکی باری گشتیی سەر بە باری بنچینە دەگرێتەوە، جا حالّەتی گرفتێك بێت یا گرێیەکی ناسەرەکی، یا سەرەکی (خانزادێکی‌تر) یا لە گرفتێکی دووا حالّەتی تەقینەوەی گرێیەکی سەرەکی بێت (هاوارێکی تاساو) یا گرێیەکی ناسەرەکی، یا لە سەرئەنجامی ئەنجامەوە دەست پێدەکات ئەم حالّەتەش بە زۆری لە درامای سینەمایی‌دا دەبینرێن ئەوەی لێرەدا بۆمان ڕوون بێۆوەوە کە باری خۆناساندن دۆخێکی سروشتیی هەر جۆرە بەرهەمێکەو لەگەلّ کارامەیو پسپۆری چنین‌دا بەخۆی دادەرژێ‌و خۆناساندن Anitlal هەر لە پێشەکی‌دا نابێ، بەلّکو «خوێناساندنی بەردەوام» لەگەلّ بەردەوامی درامادایە، گەرهاتوو هەر بەرهەمێك خۆناساندنی لەباردا نەبێ، بەرهەمێکی داخراوی سەربەخۆیەو ئەمەش مانای ئەوە ناگەیێنێ کە دەبێ یە به جۆرێکی وا کراوە بێت هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێك بەدەستەوە بدات‌و هیچ شتێکیش بە زۆری بەدووا ناخرێ لەهەریەکەیەکدا، تا بینەرئاگای لە یەکێتیی گشتنی دراماکە هەبێت‌و، سەرەتاو ناوەڕاستی لە یاد نەچێ‌و، لە سەرئەنجام بگات:- بۆ نموونە:- کە -فیکرەت- دەرکرا، توفیق بەگ لە دیوەخاندا کردی بە هەراو زۆر کەیفی هات‌و بینەر زانی کە فیکرەت بە خۆشی بەرێ‌ناکرێ ؛ بەلاَم توفیق بەگ پلانی بەردە باران‌و تەنەکە لێدانی ئاشکرا نەکرد، هەروەها لە (خانزادێکی‌تر )دا کە خانزادێکی‌تر دەلّێت:-

دووشتەکەت هێناوە، بیدە، ڕاست دەکەی) بینەر دەزانێ لە هەلّویستی داهاتوودا لەشکری‌و خانزادێکی‌تر ئاشت دەبنەوە، زۆریش ڕاست‌بوو دوو ئەنگوستیلەکە لە سەرەتاوە پیشان‌نەدرا، ئەگەرچی هەر لە گیرفانی لەشکریی تاکەیار بوون، بینەریش بەو کردەوەیەی نەدەزانی. وابزانم لێرەدا لە مەبەستی چۆنێتی خۆدانەدەست‌و خۆ نەدانەدەستی چنین‌و چونێتی بە دووا خستن‌و شاردنەوەی زانیاری لە یە کە کاندا دەگەین‌و کاریش ناکاتە سەر خۆناساندن -Initial بەلّکو بەتێنتری دەکات..

لە جیهانی درامادا «خۆناساندنی سەربەخۆش هەیە، کە نووسەر جەند برگەیەکی زۆر ناسك لە تێکرایی دراما دەگرێ‌و لە بەرایی دیمەنی یەکەمدا هەروەك دیمەنێك دەنووسرێتەوەو، دەرهێنەرەکانیش دەتوانن ئەم جۆرە خۆناساندنە لە دەقەکاندا هەلّێنجن‌و، پاش جەنگی جیهانی یەکەم‌و بەرەو سەرووترئەو جۆرە خۆناساندن، لەسەر شانۆی کوردیدا لەباو بووەوەو: لە تاقیکردنەوە خۆمالّی‌یەکان‌و دەقە کانی جیهانیدا پەیرەو کراوە بۆنموونە:- لە شانۆیی «سەلاحەدینی‌ئەیوبی »ی سالّی ۱۹۲۱و سالّی ۱۹۳۰)و لەو شانۆگەرییانەی کە دانیال قەساب دەریهێناون‌و جل‌و بەرگ‌و ماکیاجی بۆ کردوون، لەوئۆتێللۆی سالّی ۱۹۲۹و سالّی ۱۹۳۳و سالّی ۱۹۳۸ لە هەولێرا، هەروەها شانۆیی «بەزەیی تاوانبار»ی سالّی ۱۹۳۳ کە بە ناوی قۆتابخانەی شەوان پێش‌کەش‌کرا(۲٤) هەروەها شانۆیی «بازرگانی ڤینیسیا»ی شکسبیر لە سالّی ۱۹۳٤دا بە ناوی قوتابخانەی ناوەندیی کوڕانی هەولێر نوێنراو، یا لە شانۆیی «سەلاحەدین ئەیوبی»ی (۲۵ * سالّی ۱۹۳۹ دا کە لەگەلّ شانۆیی «ڕۆمێوو جولێیت»ی شکسپیر لە سالّی ۱۹٤۰ دا بە ناوی قوتابخانەی سانەوی‌ی کوڕان پیشان‌دراو، یەکەمیان محمد نافع ڕۆستەمی شاعیرو، دووەمیان نەمر عبدالرحمان کیو موکریانی وەریان گێڕایە، سەر زمانی کوردی،) بێجگە لەو شانۆگەری‌یانە لە شانۆیی (شەهرەزاد)ی توفیق‌الحکیم‌دا خۆناساندن‌نەراهێنرا، کە محمد شکر خلیفە وەری‌گێڕاوەتە سەر زامانی کوردی‌و لە سالّی ۱۹۵۷دا لە هەولێر دەریهێناوەو، خۆشم ڕۆلّی کارەکتەری جەلادم تێدا بینیوەو ئینجا لەگەلّ دەست‌پێ‌کردنی پیشاندان کارەکتەران هەموو یەك لە دووای یەك بەجل‌و بەرگی نواندن دەهاتین‌و بە نواندن برگەیەکی گرنگی گفت‌و گوکانمان دەگۆتەوەو، دەرۆیشتین، بەم کردەوەیەش دراماکەمان بەبینەران دەناساندو، لە نوێشکەکەی تێدەگەیشتن‌و باری بنچینەو تەوەری ململانێی یەکەکانیان دەناسی، هەروەکو شانۆیی «خاتوو خانزادی)ی حسام الدین الشعب کە لە سالّی ۱۹۵۹دا لە شاری کۆیێدا نوێنراوەو، دەست خەتەکەی لای من پارێزراوە دەبینین خۆناساندنی سەربەخۆ لە شێوەدا لە باری بنچینەو یەکەکانی دژو نادژ هەلّبژێردراوە (والی تورك دێت‌و دەلّێت:- واللە ئەگەر وابێ ئەبێ کەلەشی بچێتەوە حریر، پاسەوانی والی دێت‌و دەلّێت:- جەنابی والی میر سلێمان

ئەیەوێ بتبینێ. میر سلێمان دێت:- بەڵێ خاتوو خانزاد لەشکرێ بە تەمای عەیشێ براژنتە کە مارەی بکا، لەشکری دەڵێت:- میر سلێمان سوپایەکی زۆری کۆکردۆتەوە. بۆ ئەوەی بەسەر ناوچەکانی تۆدا بدات و داگیریان بکات. قاوەچی دێت و دەڵێت:- سەرچاو حەز ئەکەی یەك حوقەژەهری بۆ تێ ئەکەم، خاتوو خانزاد بە دەردەکەوێت:- ئەگەر نەمرم تۆڵەی برایەکەم ئەکەمەوە تف لەلەشکرێ. یەکێ لە دانیشتوانی دیوەخان:- وا بارگەی لەشکرێ گەیشتە جێ، پیاوێکی خاتوو خانزاد:- ئەم گوریسە بەشە بۆ خنکاندنی لەشکرێ. لێرەدا بینەر چەند زانیاریەکی گرنگی لا پەیدا دەبێ و لەمەوداکانی (زەمەن + جیگا + کردە) تێدەگات و تەوەرو هێزو چۆنێتی ململانێ و سەرئەنجامیشی بۆ دەناسێنرێت و. بە ئەمەزرۆیی یەوە چاوەرێی ئەو ڕووداوانە ناسکانە دەکات و. بە ئاسانی تێ دەگات.

بێجگە لەو شێوە خۆناساندنانە «خۆناساندنی ئامادەکراو» یش هەیە. کە تا ڕادەیەك لە ئاستی خۆناساندنی سەر بەخۆیەو. تەنیا ئەکتەرێك. یا حیکایەتخوان. یا کۆرس بە پێشەکی یەکی زۆر خەست نوێشکی ڕووداوی گشتی بە نواندن پیشکەش بە بینەران دەکات هەروەك «لە پێنج یەکی سەدەی بیستەم ئەمە ڕوودەدات»ی محی الدین زەنگەنە کە بەڕێوەبەری شانۆ ڕایدەگەیێنێ. یا لە «راپورت»دا بە شیعر کۆرسی پێنج کەسی بە چەند ووشەو دێڕێك گەرێت و دووبارە کردنەوەی دووپات کردنی لێدەرکەین زاخی «راپۆرت»مان لا ڕوون دەبێتەوە.

ئەم جۆرە خۆناساندنە لە درامای رامیاری و فیکری و فێرکردەو ڕاگەیاندندا سەرکەوتنی بۆهەیەو. لە هەمان چەشنیشدا «خۆناساندنی نەتا»ش هەیە لە شێوەی ئامادەکراودا ئینجا بە هەر شێوازێك بێت هەروەکو «راپورت» کە بە شیعر کۆرسی یەکەم نوێشکی فەلسەفەی بیرۆکەی سەرەکی و بزوینەرو مەودای سەرئەنجامی (راپۆرت)مان بۆ کورت دەکاتەوەو. ئەوەی شایانی باسیشە ناوی کارەکتەرو ناونیشانی دراما هەندێ جار بەڵکو هەردەم ڕۆڵی خۆناساندن دەگێڕێ. هەروەك «محاوەرەی ئیقتصادی»و دڵداری و پەیمان پەروەری»و «لە پێناوی ئەوین» دای زەکی أحمد هەناری و «جەنابی جانەوەر»و پێکەنین بە پێی یاسا»ی چیرۆك نووس حسین عارف و (گوندەکەم بەجێ ناهێڵم) کە تا ڕادەیەك پێویستیو هێزو فەلسەفەی بیرۆکەی سەرەکی و بزوینەرو. ڕەفتارو هەڵویستی دراماکان دەناسێنێو یارمەتی بینەرو خوێندەوار دەدا..

لە درامادا بە گشتی چەند پێداویستێکی گرنگ مەرجە نووسەر پەیڕەوی بکات لەوانە:- پێویستی درامایی یا «پێویستی شانۆیی» کە دەبینرێ یا نابێزێ بۆ نموونە:- مەمۆی پەروەردەکراوی باوەشی دایکێکی وەك (چاورەش) دەبوایە ئەم هەڵویستە مرۆڤایەتی یەی ئاهەبێ «شێرو» ش تۆڵەی خۆی بستێنێو، ناسکە لە ڕەجەب مارە بکرێت یا «کوێر ئوغلی»ی شفیق محمد ئاوا بەم سوپارمانێتی یە ئەسپی «قیرات» بهێنێتەوە، یا خانزادێکی تر لە دەرەوە چەند جار لەشکرێ ببینێ و یا «رزگار» لە «گوندەکەم بەجێ ناهێڵم»دا بگەڕیتەوە، ئەگینا ئەو درامانا ئاوا نەدەنوسران و لە دراماشدا «پێویستی لاوەکی» هەیەو. هەر نووسەرێکیش بە تێرامانی خۆی سەیری مەسەلەکان دەکات و لایەنی سەرەکی و ناسەرەکی دەستنیشان دەکات و ڕەخنەش بە دەوری خۆی لەگەڵ تێرامانەکە دەگونجێ یا ناگونجێ. بەلام گرنگی هەڵبژاردن لەوەدایە کە نە مەسەلەیەکی لاوەکی دا مەسەلەیەکی نوێتر و گەورەتر پەیرابکرێت لێرەدا زۆر درامای خۆماڵی لەم دواییەدا کەوتوونەتە هەڵە، گوایە داستان و چیرۆکەکانی کۆنی کورد بەیەکتر دەچن. بۆیە (دراماکان) هەموویان وەك یەکن!!: کەچی وانی یە، گەر وا بوایە هەموویان بەخۆوە نەدەدی، یا بەناوی ئەزموونگەری دەقە جیهانی یەکان دەخرێنە ژێر ناونیشانێکی خوماڵی و، تاقی کردنەوە، نەخۆماڵی یەکانیش لێرەو لەوێدا دەبینرێن و هەروەك خۆیان دووبارەدەکرێنەوە یا بەیەکتر پینە دەکرێن و، پلانی دەرهێنانیش ئاڵ و گۆڕ دەکرێ و. دەباشە گەر ئەزموونگەری هەر شێوە بازی بێت؟!! دەبێ شێوەکان بەیەکتر نەچن. سەربەستی ی نووسەرو دەرهێنەریش لە کۆپی کردن و مونتاج کردندا نی یە.  یا لە کەرەستەو شێوەبازیدا. بەڵکو داهێنانی هاوکێشەی نێوان واقیع و درامایە، بۆ نموونە:- لە (راپۆرت)دا کە لە ساڵی ۱۹۷۷دا نووسراوەو لە ساڵی ۱۹۸۰دا احمد سالاری هونەرمەند دەریهێناوە. مەسەلەی صوفی کلاش خوار گەرێت و حسێبی هێماگیری یەکەیشی بۆ بکەین لە بیستەکاندا هیچی بەسەرەوە نەبووەو. لە دراماکەشدا مەبەست هەڵخستنی جلی شۆراوی تەوەرەکانی دیکەیەو لە کوردەواریشدا باوە گەر یەکێك کوڕەکەی مرد یا کوژرا. لەبەر چەند هۆیەکی ئابووری و کۆمەلایەتی هەوڵی ئەوە دەدات بووکەکەی لە کوڕێکی دیکەی خۆی مارە بکات. گەرچی کوڕەکەی صوفی نەماوەبەلام دراما نووس فؤاد مجید (۲٦) میسری خەبەری مان و دیتنی کوڕەکەی بۆ دەهێنێ و صوفی لە ئازاری بڕبڕەی پشتی کێچی دەکەوێتە کەوڵ و سەرباری لە بارەکەی گرانتر دەبێت و. لە لایەك زۆری پێخۆشە کوڕەکەی مابێت. تا پێی شادبێتەوەو. لە لایەکی دیکەشدا بیر لەوە دەکاتەوە گەر هاتوو کوڕەکەی گەڕایەوە چی پێ بڵێت. وا ژنەکەی لە باوەشی «عزیز»ی براکەیەتی و. وەلامی خەڵکیش چۆن بداتەوە. بۆیە

مەم صوفی دەبێتە تەوەری سەرەکیی بیری بزوینەرو عەودالی دەستگیرکردنی چارەنووسی کورەکەی دەبێتو، بە دڵێکی خاوێنو گەش‌بینی‌یەوە بە دووای حەقیقەتدا گەراو مێژوویکی نوی‌ی بیستەکانمانی بۆ دەهۆنێتەوە، ئەمەش گرنگترین خاڵی شانۆی داستانی‌یە کە لە شانۆی چاخگیریدا نابینرێ.

هەروەها لە درامادا «پیشاندانی پێویست هەیە، کە کارە هەرە گرنگەکانی هێڵی سەرەکی‌یەو دەنوێنرێو دەبینرێ ؛ بەڵام «پیشاندانی لاوەکی» هەموی یا لایەنێکی پیشان‌نادرێ بۆ نموونە:-

تۆڵەسەندنی شێرۆو کوشتنی سێوێ پێویستییەکی شانۆیی‌یە، بە کردەی دەرەکی Out Actionیا کاری نادیار رادەگەیێنرێ بەلام گەرهاتو پیشان‌درا حسێبێکی زۆر ووردی بۆ دەکرێ تا قەناعەتی بینەر فراوانترو بەتینتربێت بۆ نموونە:- شکایەت‌کردن لە «فیکرەت» کە بووە (فیکرەت) لاوەکییە، چونکە لە پاش هەڵکشانی ململانێی نێوان هەردوو جەمسەری (فیکرەت)و توفیق بەگ کە زۆر بە ماقوولی دەهاتنە لای فیکرەتو داوای رێدانە بلاوبوونەوەی لەرزوتایان دەکردو زەبرو زەنگی توفیق بەگك دیتراو هەڵویستی بەرێوەبەری کۆن، کە زۆر بە زیرەکی رۆڵی رۆنکەرەوەی دەدیو جیهانی داپیرە گەورەو جەمالو حەمە عەلیی کۆپال پر لە قیژەی نارەزایی، بینەریان گەیاندە ئەو قەناعەتە کە جەمسەری توفیق بەگ (فیکرەت) وەك مووچە خۆرێك بە دەرکردن دەدا، جا احمد سالاری هونەرمەند وەك دەرهێنەرێکی وەستا لە پێناوی هەمان قەناعەت جیهانەفراوانەکەی توفیق بەگو یاسا تایبەتی‌یەکانی زیاتر گوناهبارکردو بەڵکو ئەوەشی سەلماند کە ئادەمیزاد لە بوونێکی کۆمەلایەتیدا بڕواو بریارەو، لە دووا چڤانۆکی «لانەوەزان»ی تراجیکۆمیدیاشدا (رفیق) رادەگرێو خوتبەیەکی رەوای بۆ دەخوێنێتەوەو بە جەوهەری دراماکە فێرە شتمان دەکاتو، لە «چەخماخە»شدا دۆمینە دەداتە دەست ئەفەندی‌یە زار دراوەکەی چاێخانەو بە هەپی بەیازی دادەنیو لە «جەنابی مفتش» دا بە بەردانەوەیەکی پانتۆل زۆر ماقوولیی دەستەیەك لە ماقوولانی سەلماند..

## راستی‌یە مەزنەکان

راستی‌یە مەزنەکانو راستی‌یە لاوەکی‌یەکان ، لە چنین‌دا ، وەك بێخو ریشەی یەکترینو سەرئەنجامی واقیعو مێژوونو لە دوو ئاستی سەلبیو ئیجابی‌دا دەبینرێن بۆ نموونە :- رەفتاری کەسێتی‌ی زوحاكو بەکروکەو بەکری مەرگەوەرو ، تەقینەوەی قەڵای دمدم کە نابێتە روخاندنو ، خولەی خوێن ڕێژو ، فارس ئاغای (کچی کوردستانو) لەشکرییو مشیر ئاغاو ، باوکی سورمی خان ، هێمای سەلبینو پێچەوانەکانیشیان ئیجابین . بگرە لە رەفتارو کەسێتی‌ی کاوەی ئاسنگەرو مەمۆو چاورەشو شێرۆو . مەمو زینو ، پیرۆزو لاوی کوردی کچی کوردستانو صوفیو فیکرەتو رزگار .... هتد ، گەرهاتوو دەستکاریی ئەم جۆرەراستیانەکرا دەبێ لە ئاستی رێچکەی خۆیان لانەدرێنو ، لەبەر رۆشنایی ئەم راستیانەشدا تەکنیكو ، پەیوەندیی شانۆو هونەرەکانی‌دیکەو ، چۆنێتی دەقو پیشاندان تەنیا شانۆش پەروەردەی هونەرەکانی‌تری نەکردووە ، بەڵکو هونەرەکانی دیکەش پایەو پلەی شانۆیان گەورەترکردووە ، ئەم هاوکێشەیەش لە قۆناغەکانی مێژوودا دانەبڕاوەو ، لەگەڵ رووداوەکانی‌دا رەوتی کردووەو ، لە کێشەو ململانێ‌دا بووە ..

٢١- الدکتور عبد العزيز حمودة- البناء الدرامی- ص٢٤٧ ٤٦و...

٢٢- هەمان سەرچاوە لاپەرە ٤٦و...

٢٣- م. س. گورکینیان -الدراما - نظرية الأدب- ص ٨١٠، ٨١٣و و...

٢٤- جێگای قوتابخانەی شەوان لە خواروی ئەجزاخانەی باکوور بوو، لە شەقامی مظفریەداو (شفقه الشریر) تا رادەیەك بە (لولا المحامی) دەچێتو دڵداری غازی‌و لیلێ لە چوارچیوەیەکی کۆمەڵایەتیدا پیشان دەد او برادەرێکی غازی ناوی خلیل دەبێ تاوانێك بە ناوی غازی دەکا تا لیلی بۆ خۆی بمێنێتەوەو، غازی دەگیرێو دەدرێتە دادگاو، پارێزەرەکەی زۆر هەوڵێ بۆ دەداو لە دووا تابلۆدا خلیل بەزەیی بە غازی دێتەوەو دان بە تاوانی خۆی دەنێو غازی بەردەبێتو یەکێ لە بینەران ناوی محمود کاکە خان دەبێ دەست دەکاتە پارانەوەو دەڵێت:- نەخشەی لە علیی کورم بێ ئاوا لە بەندیخانە بەر بدرێ، ئەو بەرێزانەش ئەکتەرە سەرەکییەکان بوون:- عبدالقادر احمد سامی، دانیال قصاب، وهبی اگوب، شیت مصطفی، بشیر مصطفی، حکیم القاضی، یوسف شیخ یحی،

٢٥- تا پەنجاکان جلو بەرگو دیکۆرو ئەکسسواری ئەو درامانە مابوونو ماموستای نەمر جواد رسول ناجی لە دەرهێنانی ئۆتیلۆی ساڵی ١٩٥٤دا سوودێکی زۆری لێ وەرگرتن هەروەها محمد شکر خلیفە لە ساڵی ١٩٥٧دا کە شانۆیی «شەهرەزاد»ی لە هۆڵی سانەویی کورانی سەر رێگای موصل پێشکەش‌کرد. بەکاری هێنـان

٢٦- فؤاد مجید میسری:- داستانی خەجو سیامەندو رۆمانی (تەنەکە)ی یەشارکەمالی کردۆتە شانۆییو بۆ ئامادە کردنی درامای راپۆرت یا راپۆرتێك بۆ مامۆستای مێژوو سوودی لە ١٢ سەرچاوەی مێژووییو ئەدەبی وەرگرتووەو لە واقیعی بیستەکانی ئەم سەدەیەی کوردستان دەدویو حەڤدە کارەکتەرو، دوو کوڕسی پێنج کەسیو پێنج کەسی روون کەرەوەی هەیەو بیرە سەرەکی یەکەی (راپۆرت) لە چیرۆکێکی نووسەری جەزائری «الطاهر وطار» وەرگیراوە کە لەگەڵ چەند چیرۆکێکی‌دیکە بە ناونیشانی (الشهداء یعودون هذا الأسبوع) لە ساڵی ١٩٧٤دا بڵاوکراوەتەوەو پیشاندانی راپۆرت لە شاری سلێمانیدا (٢٠) بیست رۆژی خایاندووە،

لە ئاسۆی هونەری جیهانیدا

# لاتـــوور

نووسینی مێژوونووسی سۆڤیەتی :

ت .پ . کاپتێریڤا وەرگێڕانو ئامادەکردنی

لە ڕووسییەوە : محمد عارف



( سیباستیان ) ، ١٦٤٠ ـ ١٦٥٠ مووزەخانەی بەرلین .

نیگارکێشی فەرەنسی مەزن : (جۆرج دیْ لاتوور، ١٥٩٣ – ١٦٥٢) یەکێکە لە هونەرمەندە بەناوبانگەکانی زەمانی خۆی ، کەڕێبازو قوتابخانەیەکی تایبەتیو دووبارە نەکراوی لە هونەردا هەبوە ، بەڵام پاش کۆچی دوایی ، بەداخەوە ، بەجاریْ لە بیرکراوەو ناوو ناوبانگی نەماودو لە یاددا ڕەش‌کراوەتەوە ، تا لەم ساڵانەی داوییدا سەرلەنویْ «دۆزراوەتەوە»و ئەستێرەی هونەری لە ئاسمانی هونەری نیگارکێشانی جیهانی‌دا درەوشاوەتەوە .

ژیانو بەرهەمی لاتوور ، تاکو ئەمڕۆش بە پەردەیەکی تەمو مژاوی داپۆشراوەو زۆر نهێنی لە قۆناغەکانی ژیانیدا ڕۆن نەبوەتەوەو ئاشکرا نەبوەو ئەم زانیارییانەی دەربارەی ئەم هونەرمەندە کۆکراونەتەوە ، جیاجیاو بەش بەشن .

لاتوور ، لە شاری (لۆتارینگ، نزیك‌نانسی) لە دایك‌بوەو لە پاشان چووەتە شاری (لیونیڤیل)و هەموو ژیانی خۆی لەم شارەدا بردوەتە سەر .

بەشێك لەمێژوو نووسەکانی هونەری فەرەنسی ، پەنجەیان بۆ ئەوە درێژکردوە ، کە هونەرمەند لە هەرەتی لاویدا ، گەشتێکی لە ئیتالیا کردوە ، بەمەبەسی خوێندنو شارەزا بوونی هونەری ئەم وولاتە . ئەمەش ئەو نهێنی‌یەمان بۆ ئاشکرا دەکات ، کە هونەرمەند لە سەرەتادا لەژێر کارتێکردنێکی بەهێزی قوتابخانەی نیگارکێشانی (کاراڤادجۆ) ئیشی‌کردوە . بەڵام هونەرمەندی ژیر ، کاروانی هونەری لەم سنوورە دوورتر لێخوڕیوە .

زۆربەی هەرە زۆری نیگارەکانی لاتوور دەربڕینی ناوەڕۆکی ئاینین ، هەروەها ژیانی دێهاتو لادیْ بووەتە کانی سروش بۆ بەشێکی تری بەرهەمەکانی ، ئەمەش لە ئۆبرەزی پاڵەوانەکانی هونەرمەند دیاردەیەکی بەرچاوە ، کە سیمای شاعیریو دڵ پاکیو ساکاریو مرۆڤایەتیو دەوڵەمەندی دەروونی‌یان پێوە دیارە .

نیگاری : (لە دایك بوون) ، لە تابلۆ هەرە شاعیری‌یەکانی نیگارکێشە ، ئەم نیگارە مۆرکێکی سادەو ساکاری هەڵگرتوە ، هێزی ئەم بەرهەمەش لەم سادەو ساکاری‌یە دایە . . . دایکێکی لاو . منداڵە تازە لە دایك‌بوەکەی . لەکاتی بیرکردنەوەیەکی پڕ هەستو ماناوە لە باوەش‌کردوە ، بەرامبەریان پیرەژنێك ، تا بتوانێ خۆی لە شەوقی ڕۆناکی مۆمەکەی ناوەندیان (کە سەرچاوەی ڕۆناکی زۆربەی هەرە زۆری



(لەدایك بوون) ، سالەکانی ١٦٤٠ ،
مووزەخانەی رێن

ـگـ ـەکـنی هونەرمەندە) رزگاربکاتو بە ووردی سەیری سیمای منداڵە
کـات . بە دەستی ڕاستی روناکییەکی گرتوە تا لە چاوی نەدات . . .
ـەکرهێنانی زەمینەی شەوو تاریکیو بەکارهێنانی ڕۆناکی موم ، هەستی
ژـنی لادێو هێمنی زەمینەی سادەو ساکارو ژیانی جوتیارو ئەرکێشو
هەژارەکان ، زیاتر بەرجەستە دەکات . . .بەڕاستی لاتوور لەم جۆرە
هونەرە تەنكو ڕۆمانیتکییەدا شۆرەسواری زەمانی خۆی بووە .

نیگارە ئاینییەکانی لاتوور ، زۆربەی زۆریان بە : (گیانیو یژەنیو گێرانەوەی ڕووداوو مۆرکی ئەدەبی) دروست کراون . لێرەدا بە شێوەیەکی تایبەتی ناوی نیگاری : (یوسفی دارتاش . مووزەخانەی لووڤری پاریس)و نیگاری : (فریشتەیەك خۆیپیشانی حەزرەتی یوسف دەدات) دەهێنین .

هەستی گیانی پاكو زەمینەی ئاینی پیرۆز لەم نیگارەی دوایی‌دا دیاردەیەکی چەسپاوو سەرنج ڕاکێشە . هونەرمەند هەمان سەرچاوەی ڕۆناکی بەکارهێناوەو وەستایانە کێشەی هونەری چارەسەرکردوە .

دەربڕینی زەمنیەی تراژیدیو کوشتنو بڕین لە نیگاری : (سیباستیان)ی شەهید . بەرچاو دەکەوێ . زەمینەی شەوو تاریکیو وجەستەی تیرباران کراوی شەهید . . شینو گریانو فیغانی ئافرەتە جەرگ سووتاوەکان . هێنی ئەو شەوە زەنگەیان ڕاو ناوە . . . هونەرمەند وەستایانە توانیویەتی نەوەك تەنیا هەستی خەمگینی گشتی کە (هەموو لایەکی لەژێر باڵی رەشی کۆکردوەتەوە) دەربڕێ . بەڵکو لە هەمان کاتدا هەستی کارەساتی جەرگبڕو ئازاری ناوەوەو برینداری دەروونی هەریەکێك لەم لێ قەوماوانەش بەرجەستە بکات .

هونەرمەند . زەمینەی تراژیدی لە ڕێگای - جوولانەوەی شانۆییو - هەڵپەرکێی مەرگ - ەوە دروست ناکات ، بەڵکو بەهۆی جوولانەوەی سرووشتی : جەستە ، دەستو پەنجە ، هێڵی دەرەوەی فیگوور بەرجەستە دەکاتو بەم جۆرە هەستێکی قوولتر بەکارەسات دەبەخشێتە بینەرکە پاش - دۆزینەوەو هەستپێکردنی - بۆ ماوەیەکی زۆر لە یادیدەمێنێو لە بیری ناچێتەوە .





(فریشتەیەك خۆی پیشانی حەزرەتی یوسف دەدات )
سالەکانی ١٤٦٠ ، مووزەخانەی هونەرە جوانەکانی (نانت )



# شێوەکانی لە تابلۆ ڕامان

نووسینی: سوزان وودفۆرد       وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

لە تابلۆ ڕامان شتێکی بەلەزەتە.. مایەی سەرسامیو هەڵچوونە، کارێکی پڕ لە خرۆشانو باڵابوونە، هەندێ لە تابلۆکان هەر لە یەکەم ڕامانو بگرە لە یەکەم نیگاوە شی دەکرێنەوە، بەڵام هەندێکی دیکەیان پێوستی بە لێدوانو ڕوونکردنەوەو پەراوێزو شیکردنەوەی ڕەمزو هێماکان هەیە.. جا ئەم جۆرەشیان مەبەستی سەرەکی ئێمەیەو ئەوە دەهێنێ خۆمانی پێوە هیلاك بکەین.. بۆ نمونە زۆر لایەن هەن کە شایەنی ئەوەن لێیان بدوێین.. لەوانەش: ناوەرۆك.. ناوەرۆك لە زۆر تابلۆداو بەشێوەی جیاجیا خۆی دەردەخا.. ئەوە جگە لە فۆرمو بناغەو دارشتنی جۆراوجۆر بەپێی ڕێبازی هونەریو سەردەمو چاخەکان، جگە لە وردبوونەوەیەکی مێژوویيو گەڕان بەدوای گەوهەری فەلسەفیو ئیستاتیکیو هونەری.. ئەمانە هەمووی هەستو هۆشی.. خەیاڵی بینەر دەوروژێنێو لە ئەنجامدا ڕوانینو ئاسۆی تێگەیشتنمان فراوانتر دەبێو لەویێوەش زەوقو سەلیقەی هونەرپەرستمان جێگیرتر دەبێ.

**کەواتە سەیرکردنو وردبوونەوەو لەتابلۆڕامان چەندەها شێوەو تەرزی هەیە. با لەم بەشەدا سەیری چوار تابلۆی زۆر جیاواز بکەین... جیاواز بەپێی سەردەمو شێوازو ڕێبازی هونەرمەندەکان، با لە چەندەها لایەنو ڕووی جیاوازیشەوە لێیان ورد بینەوە.**

**دەتوانین بۆ یەکەمجار ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین: ئایا ئەم تابلۆیە چ مەبەستێکی گەیاندووە..؟ وێنەی ئەم کەڵەگا سەرسوڕهێنەرو زیندووە**



(**تابلۆی ژماره** – 1–) بۆ پازده هەزار «١٥٠٠٠» ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوەو لەسەر دیواری ئەشکەوتێکی ئیسپانیا ڕەسم کراوەو تەنها هەنگاوێك لەزارکی ئەشکەوتەکەوە دوورەو لەنێو ئەو تاریکی‌یەدا ماوەتەوەو بەرەنگاری زەمەن بۆتەوە. لەوانەیە بەسەرسامی‌یەوە بپرسین: ئایا ئەم وێنە دڵگیرو زیندووە بۆ چ مەبەستێك کراوەو چ ئاکامێکی پێکاوە..؟ هەندێك لەو باوەڕەدان کە ئەم وێنەیە بۆ مەبەستێکی جادووگەری‌یانە – سیحری – لەسەر دیواری ئەشکەوتەکە کراوە، گوایە بۆ ئەوە وێنەی کێشاوە تا هونەرمەندەکە کە مرۆڤێکی کێوی‌و سەرەتایی بووە، خۆی یان خێڵەکەی، بتوانن ئەو گیانلەبەرە ڕاو بکەن.. یان ئەوەتا بیکوژن، بەواتا: وێنەکێشانی کەڵەگایەکە دەبێ بەو هۆیەی کە بەڕاستی ڕاو بکرێ‌و ئەم بڕوایەش پەیوەندی بە بۆچوونێکی جادووگەری‌یانەوە هەیە. حاڵەتێکی وا لەنێو میللەتانی ئەفریقیاش هەیە.. بەتایبەتی ئەوانەی کە باوەڕیان بە سیحرو جادوو هەیە، بۆ نمونە: بووکەشووشەیەك لەسەر شێوەی ئەو کەسە دروست دەکەن کە ڕقیان لێ‌یەتی.. پاشان دێن‌و ئەو بووکەشووشەیە دەرزی‌ئاژن دەکەن‌و لەو بڕوایەدان کە ئەو کەسە بەڕاستی ئازاری پێ دەگاو بریندار دەبێ. هونەرمەندەکەی نێو ئەشکەوتەکە وای بۆ چووە گەر بتوانێ دەست بەسەر کەڵەگای سەر دیواری ئەشکەوتەکەدا بگرێ: ئەوە بێ‌شك ڕێ‌ی بۆ خۆش دەبێ ڕاوی کەڵەگایەکەی دەرەوەش بکا.

وێنەی دووەم (ژمارە – 2 –) زۆر جیاوازە. کەرەستەی تابلۆکە – مۆزاییك – ەو بۆ سەردەمێکی زووی جیهانی نێو کەڵیسای عیساپەرستەکان دەگەڕێتەوە. بابەتەکەشی ئاشکرایە.. مەسەلەی‌زیندووکردنەوەی – لازارۆس – ە، دۆزینەوەی ئەم ڕاستی‌یە ئەوەندە گران نی‌یە.. چوار ڕۆژ بەسەر مەرگی «لازارۆس» تێپەڕیوەو عیسا دەگاتە سەر مەزارەکەی، بە موعجیزە داوا لە گۆڕەکە دەکاو بە قودرەتی قادر دەکرێتەوە، بەپێی ئینجیلی «سەینت جۆن» نووسراوە: ئەم واتا عیسا: –

«چاوەکانی بۆ ئاسمان هەڵبڕی‌و فەرمووی: – «باوکە.. من لەپێناو ئەو خەڵکەی دەوریان داوم موعجیزەی خۆم دەسەلمێنم تا باوەڕم پێ‌بکەن کە تۆ منت ناردووەتە ناویان.»

**پاشان بە دەنگێکی بەرز هاواری‌کرد – «لازارۆس.. وەرە دەرێ.»**

**کابرایەکی مردوو، بە دەست‌و پێ‌ی لە کفن پێچراوەوە، لەنێو گۆڕەکەیدا هەستایەوە سەر پێ.**

ئەم تابلۆیە، بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا، ئەم چیرۆکە سەیرەمان بۆ دەگێڕێتەوە. ئێمە لازارۆس دەبینین – دەست‌و پێ‌ی لە کفن پێچراوە – لەنێو ئەو مەزارەی ڕاکشابوو دێتە دەرێ. عیساش دەبینین: جل‌و بەرگێکی ڕەنگ ئەرخەوانی شاهانەی لەبەرە، بەتەواویش دیارە کە بە ئیشارەت بە – لازارۆس – دەڵێ بێتە دەرێ. لەتەنیشت عیساشەوە یەکێ لەو خەڵکە عەوام‌و ڕەمەکی‌یە وەستاوە، ئەو خەڵکەی کە عیسا لەپێناو ئەوان، موعجیزەکەی خۆی نیشان داوە تا باوەڕی پێ بکەن لەلایەن خواوە هاتووە، کابرای ڕەمەکیش بەسەرسامی‌یەوە دەستێکی بەرز کردۆتەوە. وێنەکەش، زۆر بەسادەیی، لەسەر یەك پانتایی ڕەسمی کراوە. زەمینەی تابلۆکە زەرکەفتی‌یە کەسەکان بەئاشکرا دەبینین. هەرچەندە بەقەد



1 Prehistoric cave painting of a bison, Altamira, Spain. 15,000–10,000 BC

کەلە گایەکی نێو ئەشکەوتێکی ئەسپانیا دە تا پازدە هەزار سال بەر لە زایین

وێنەی سەر دیواری ئەشکەوتەکە زیندوو نی‌یە، بەلأم ئەو هێزەی تێدایە کە دەست‌بەجێ وا لەو کەسانە بکا کە سەیری دەکەن ئەم چیرۆکەیان بێتەوە یاد.. بەتایبەتی ئەو کەسانەی ئاگایان لە موعجیزەکەی عیساو زیندووکردنەوەی لازارۆس – ە.

باشە.. بێجگە لە مەسەلەی دیکۆرو جوانکردنی دارو دیواری کەلیسایەك.. ئایا ئەم تابلۆیە هیچ مەبەستێکی دیکەی گەیاندووە..؟ بەلێ.. لەو سەردەمەی ئەم وێنەیە بە – مۆزاییك – کراوە. لەسەدەی شەشەمدا، خەلکێکی زۆر کەم خوێندەوار بوون، وێڕای ئەوەش.. کەلیسا زۆر حەزی دەکرد چیرۆك‌و نمایشت‌و فەرمانە پیرۆزەکانی ئینجیل بەو خەلکە خوێندەوارو نەخوێندەوارە ڕابگەیەنێ. هەروەك پاپا – گریگۆری مەزن – ڕوونی کردۆتەوەو وتوویەتی – «وێنەو تابلوکان بۆ کەسانی نەخوێندەوار وەکو دەفتەرو کتێب وان بۆ خوێندەواران.» واتا لەڕێگەی ئەم جۆرە وێنەو تابلۆیانە کەسانی سادە بەئاسانی لە فەرمایشت‌و چیرۆکە پیرۆزەکانی ئینجیل تێ دەگەن.

ئێستاش سەیری تابلۆیەکی زەیتی – ڕۆنی – ڕەنگین‌و بەبەهاو ئالۆزو تێکچرژاو بکە کە بەدەستی هونەرمەندێکی سەدەی شانزەم کراوەو ناوی «برۆنزینۆ»یەو ئیتالی‌یە. لەم تابلۆیەدا (ژمارە – 3) خواوەندی خۆشەویستی‌و ئەڤین – ڤینۆس – دەبینین‌و کوڕە باڵدارو گەنجەکەشی – کیوپید – بەشێوەیەکی زۆر سێکسی‌ی‌و هەوەسبازانە باسکی تێوە ئالأندووە. لەلای ڕاستەوە منالێکی بچکۆلەو دلخۆش دەبینین.. بەپێی قسەی پسپۆڕانی هونەر ئەم منالە هێماو ڕەمزی «خۆشی‌و کامەرانی‌یە»، لەپشت منالەکەشەوە کچێکی جوان‌و کراس سەوز سەیرمان دەکاو گەر پتر لی‌ی ورد بینەوە سەرسام دەبین چونکە لەژێرەوە لەشی کچە لوول‌وپێچی مارێکی پەپکەخواردووە. هەلبەتە ئەم کچەش دەبێ بە ڕەمزی درۆودەلەسەو فروفێل.. بابەتێکی ناشیرین‌و دلتەزێن – بەرووکەش زۆر نازدارە، کەچی لەژێرەوە زۆر پیس‌و ناشیرینە – کورد واتەنی: سەرقۆزی بن‌ئالۆز.. ئەم حالەتە دووفاقی‌یەش زۆرجار بەخۆشەویستی‌یەوە پابەست بووە. گەر بڕوانینە لای چەپی ئەم تابلۆ جەنجالە پیرەژنێکی تووڕەو ناشیرین دەبینین کە خەریکە بە هەردوو چنگ سەروپرچی خۆی لە بن‌وبێخەوە دەربێنێ. ئەم پیرەژنەش دەبێ بە ڕەمزی غیرەو بەخالەت.. یان هێمای غیرەو بەخالەت‌و بێ‌ئومێدی‌یەکی تێکەل.. ئەم حالەتانەش قەت لە خۆشەویستی جیا نەبوونەتەوە.. لەهەر کوێ خۆشەویستی هەبووبێ غیرەش هەبووە، ترس‌و دلەڕاوکێ‌و بەخالەت. جگە لەوانە.. لەسەرووی تابلۆکەوە دوو کەس دیارن‌و ئاشکراشە کە بە هەردووکیان پەردەیەکیان ڕاگرتووەو دەیانەوێ هەموو دیمەنەکەی پێ بشارنەوە. پیاوەکە دەبێ بە ڕەمزی کات، باوکی هەموو شتەکان.. کابرا باڵداریشە.. واتا [زەمەن] باڵدارە.. ئەی ئەوە نی‌یە دەلێن: کات دەفڕێ.... گەر زیاتر لی‌ی ورد بینەوە سەعاتێکی «ڕەملی» لەسەر شانی کابرا بەدی دەکەین. کەواتە تەنها – زەمەن – یان بلێین کات دەتوانێ پەردە لەسەر حالەتە ئالۆزو دزێوو تێکچرژاوەکانی ئەوینێکی پڕ لە شەهوەت‌و هەوەسبازانە لابداو هەموو نهێنی‌یەکان بخاتە بەرچاو. ژنەکەی بەرامبەر کابراش، کە کەوتۆتە دەستەچەپ، دەبێ بە ڕەمزی ڕاستی‌و حەقیقەت، بەلأم ئەو ژنەی کە توند پەردەکەی گرتووەو دەیەوێ ئەو پەردەیە لابداو ڕووە ناشیرینەکەی خۆشەویستیمان پیشان بدا.



2 *The Raising of Lazarus.* Mosaic, sixth century. S. Apollinare Nuovo, Ravenna



دەیەوێ پەردە لەسەر خەلأتو بەخششەکانی (ڤینۆس – خواوەندی ئەوین) هەلبداتەوە.. کە جگە لە خۆشەویستیو لەزەتو خۆشی پڕە لە ترسو غیرەو رارایی.

کەواتە ئەم تابلۆیە حیکمەتو دەرسێکی ئەخلاقی گرتۆتە خۆی: دەیەوێ بلێ: هەرچەندە خۆشیوشادی بە ئەوینەوە پەیوەستەو لیێ جیا نابێتەوە.. بەلأم لە هەمان کاتیشدا ئەوین غیرەو بەخالەتو درۆو فروفێلیشی لێ دەکەوێ. بەلأم سەبارەت بەم تابلۆیە مەسەلەکە زۆر جیاوازە.

ئێمە دەبێ ئەوەندە زیرەك بین بتوانین ئەم رەمزانە شیبکەینەوە، چونکە حیکمەتە ئەخلاقییەکەی ئەم تابلۆیە بە سادەییو راستەوخۆ خۆی نادا بەدەستەوە.

ئەگەر بگەرێینەوە سەر تابلۆی ژمارە (2) کە چیرۆکی زیندووکردنەوەی لازارۆس – مان بۆ دەگێرێتەوە: هەست بەوە دەکەین تابلۆی لازاروس ئەوەندە ئالۆزو تێکەلّ نییە.تابلۆی (ژمارە – 3 –) پڕە لەرەمزو هێماو خوازە – ئیستیعارە – دەتوانین بلێین بە تەمومژو پڕ نهێنییە.. فیگەرو کەسەکانی نێو تابلۆکە گوزارشت لە هەندێ حالەتی ئادەمیزادانە دەکەن. ئەم وێنەیە بۆ ئەوە نەکراوە تا بەشێوەیەکی روونوئاشکرا چیرۆکێك بۆ نەخوێندەوارەکان بگێرێتەوە، بەلکو دەیەوێ سەرنجی خوێندەوارو بگرە خەلکە زۆر وریاو رۆشنبیرەکان رابکێشێ، دەیەوێ بجولێنێو بوروژێنێ، بگرە بەو هەموو هێماو رەمزەوە بەرەنگاریان دەبێتەوەو سووکە گالتەشیان پێ دەکا. ئەم تابلۆیەش بۆ «دۆقی گەورەی» – تۆسکانیا – کرابوو.. ئەمیش پێشکەشی «فرانسیس – ی یەکەم»ی کرد کە لەو سەردەمەدا پادشای فەرەنسا بوو. ئەم وێنەیە، ئەوسا، بۆ جوانیو خۆشیو وروژاندنی ئەو کەم کەسانە کراوە کە زۆر زیرەكو رۆشنبیر بوون.. واتا پتر هانی داون بیر لەو هەموو رەمزو هێمایانە بکەنەوە.

با بۆ دوا جار سەیری وێنەیەکی دیکە بکەین کە زادەی بیرو توانای هونەرمەندێکی ئەم سەردەمەیەو ناوی «جاکسن پۆلۆك»ەو ئەمریکییە. ئەم تابلۆیە (ژمارە – 4 –) کە ناوی «ئیقاعی پایزە» پەیوەندی بە هیچ شتێکی دیارو ئاشکرای ئەم جیهانەوە نییە نە کەلّەگا لە ئارادا هەیە تا راو بکرێ. نە بابەتێکی ئایینی تا وەك چیرۆکێك بۆمانی بگێرێتەوە، نە رەمزو هێماو خوازەی تێدایە کە پێویستی بەشیکردنەوە بێ. لە باتی ئەوە.. شێوازێکی سەیری هونەرمەندەکە بەدی دەکەین. دەتوانین بلێین هونەرمەندەکە هەر لەخۆیەوەو بەشێوەیەکی هەرەمەکیو شێتانە چەند رەنگێکی بەسەر پارچە قوماشێکدا «کانڤاس» پژاندووەو پەرتوبلاوی کردۆتەوە.. بەم چەشنە جۆرێکی سەرسورهێنەری «تەجریدی»و زیندووی پێشکەش کردووین.

باشە مەبەستو ئامانجی ئەم جۆرە هونەرە چییە..؟ ئامانجی ئەوەیە پەردە لەسەر چالاکییەکی داهێنەرانەو وزەو هێزێکی فیزیایی کابرای هونەرمەند لابدا، تەنها دەیەوێ بینەری تابلۆکە هەست بە وزەو چالاکیو کرداری جەستەو هەروەها نێو مێشکی کابرای هونەرمەند بکا.. بەلأم تەنها لەو کاتەی کە کارە هونەرییەکە ئەنجام دەداو بەس.

شێوەی دووەمی لە تابلۆرامان ئەوەیە: دەبێ ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین ئایا ئەم تابلۆیانە چ پەیوەندییەکیان بەو کەلتوورو شارستانییەتەوە هەیە کە تیاندا لە دایك بوون، واتا دەربارەی ئەو سەردەمو شارستانییەتە چیمان پێ دەلێنو چیمان بۆ دەگێرنەوە. بەم پێیە وێنەی ناو ئەشکەوتەکە (ژ – 1) بەشێوەیەکی تۆزێ ئالۆز.. بەلأم دلنیاین کە شتێکمان بۆ دەگێرێتەوە دەربارەی مرۆڤی کێویو سەرەتایی سەردەمێکی زۆر کۆن، لەو سەردەمەی کە مرۆڤ نەیدەتوانی لە یەك شوێندا بگیرسێتەوە.. بەلکو بەردەوام دەجولأیەوەو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە رەوی دەکرد، هەندێ جار لە ئەشکەوتێکدا دەگیرسایەوە. گیانلەبەری کێوی راو دەکردو قەتیش بیری لەوە نەدەکردەوە کوختێکی هەمیشەیی بۆ خۆی بنیات بنێ.. هێشتا فێری ئەوەش نەببوو هیچ بەروبوومێك بچێنێ.

تابلۆی (ژمارە 2 ) کە لە مۆزاییك دروست کراوە دەگەرێتەوە بۆ سەدەی شەشەمی سەرهەلدانی مەسیحییەتو رەنگدانەوەی رۆشنبیریو کەلتووری ئەو سەردەمەیە. ئەو سەردەمەی کەم کەسانێکی رۆشنبیرو زانا



خەڵکێکی زۆری نەخوێندەوارو هەم نەزانیا ، فێری شتی تازە دەکرد.. بیرو باوەرو دەرسی ئەخلاقو ئایینییان پێ دەبەخشین.. دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە کەلتوورە: کەلتوورێکی ڕابەرو باوکانەیە. ئەم تابلۆیە ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە لە سەردەمێکی زۆر زووی عیساپەرستیدا شتێکی گرنگو پێوست بووە چیرۆکە پیرۆزەکان، بەشێوەیەکی روونوئاشکرا، بخرێنە بەرچاوی خەڵکی تا بتوانن لەو چیرۆکانە تێبگەن بۆ ئەوەی بەتەواوی لە مەبەستو ئامانجەکانی ئەم ئایینە، بەناوتازەیە، حاڵی بن.

**تابلۆ ڕەمزییەکەی – برۆنزنیۆ – (ژمارە – 3) ڕاستییەکی زۆرو زەبەندمان دەخاتە بەرچاو دەربارەی ئەو کۆمەڵگا عیشقدۆستو ڕۆشنبیرو پڕەی کە حەزی بە مەتەڵو تەلیسمو ڕەمزو نهێنیدرکاندن کردووەو لەهەمانکاتیشدا هونەری کردووە بە خوانی گەمەی خۆشو ئاڵۆزو پڕ لە زەوقو ڕەمزییەت.**

تابلۆی سەدەی بیستەم (ژمارە – 4 –) شتێکمان پێ دەڵێ دەربارەی ئەو خەڵکانەی لە چەرخو سەردەمێکدا دەژین کە زۆر گرنگی بە ڕوانینی زاتی هونەرمەند دەدەن. نەك هەر ئەوەندەو بەس.. بەڵکو شانازی بە ڕوانگەو بۆچوونو شێوازی سەربەخۆی هونەرمەندێکەوە دەکا: واتا هەر هونەرمەندێكو ڕێبازی خۆیهەیە، لەوەش حاڵی دەبین کە سەدەی بیستەم سەردەمێکە هەموو بەهاو بۆچوونە تەقلیدیو باوەکانی هونەر ڕەت دەکاتەوە، ئەو بەها هونەرییانەی کەسانی خوایێداو بە ڕەواو جوانی دەزانن.. لەم سەردەمەدا هونەرمەندەکان بۆ ئەوە هان دەدرێن کە بەوپەڕی سەربەستیو ڕەسەنایەتییەوە گوزارشت – تەعبیر – لە بۆچوونو ڕوانینی خۆیان بکەن.

نووسەر بەتەنها مەبەستی ئەم تابلۆیە نییە، مەبەستی ڕێبازی تەجریدیش نییە.. بەڵکو مەبەستی سەرجەمی ئەو ڕێبازانەیە کە لە سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵداوە – وەرگێر.

شێوەی سێیەم بۆ لە وێنەو تابلۆ ڕامان ئەوەیە کە ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین: ئایا ئەم تابلۆیانە تا چ ڕادەیەك واقیعین..؟ واتا تا چ ڕادەیەك پەیوەندییان بەو دەوروبەرەوە هەیە کە تیایدا دەژین..؟ لاسایی‌کردنەوەو بابەت‌خواستن لە سروشتو دەوروبەر خەمێکی گەورەی هەموو هونەرمەندەکان بووە، هەمیشە بەلایانەوە گرنگ بووە جۆرە لێکچوونێك لەنێوان هونەرو سروشتدا بدۆزنەوەو هەم بیخوڵقێنن.. بەتایبەتی لە سەردەمێکی زۆر زوودا – (دەتوانین بڵێین شەش سەد «٦٠٠» ساڵ بەر لەدایك‌بوونی عیساو تا دەگاتە «٣٠٠» سێ سەد ساڵ دوای لەدایك‌بوونیشی) نەك هەر لەو ماوەیەدا.. بەڵکو لەسەردەمی بووژاندنەوەش (ڕێنیسانس) کە لە سەدەی پانزەمەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە سەرەتای سەدەی بیستەم.. کەواتە لەو ماوەیە دووروودرێژەدا سروشت بۆتە کانگای ئیلهامی زۆربەی هونەرمەندەکان.. هەمیشە هەوڵی ئەوەشیان داوە تابلۆکانیان واقیعی بنو کتومت بینە وێنەی خواستراوی ئەو دەوروبەرە.. هەر ئەوەش بۆتە هۆی سەرهەڵدانی چەندەها گرفتی سیحراویو دڵڕفێن، بەسەدەها لەو هونەرمەندانەش، وەچە بەدوای وەچەدا، بەوپەڕی خەیاڵەوەو بەردەوام کاریان کردووە تا بتوانن بەسەر ئەو گیروگرفتانەدا زاڵ بن. بەڵام ئەم خەمە تاکە خولیایەکی هونەرمەند نەبووە. شتێکی نادروستیشە لە ئاست بۆچوونو توانستی خۆمانەوە سەیری وێنەو تابلۆکان بکەین، چونکە هونەرمەند بە هەمان ئاستوپێوانە کاری نەکردووە.. واتا پێوانەی بۆچوونو زەوقی ئێمەو هونەرمەند لەیەکدی جیان. بۆ نموونە: ئەو هونەرمەندەی لە سەدەی شەشەمدا تابلۆی (ژمارە – 2 –)ی بە مۆزاییك کردووە ویستوویەتی زۆر بە زیندوویی چیرۆکێکی ناو – ئینجیل – مان بۆ بگێڕێتەوە – (چیرۆکی زیندووکردنەوەی لازارۆس)..



بسازێنێ. بۆ نموونە گەر لە تابلۆ ڕەمزییەکەی (ژمارە – 3 –)ی برۆنزینۆ ورد بینەوەو لەم ڕوانگەیەوە سەیری بکەین دەبینین کەسە سەرەکییەکانی نێو تابلۆکە کە «ڤینۆس و کیوپید»ن و بەو ڕەنگە روون و ئاچووغەوە لەسەر شێوەی پیتی «L»ی ئینگلیزی دەبن بە چوارچێوەی لای چەپی تابلۆکە. گەر بەلای ڕاست و سەرووی تابلۆکەدا بڕوانین دەبینین هونەرمەند توانیویەتی پارسەنگێك بۆ تابلۆکە بدۆزێتەوەو ئیقاعێکی بۆ بسازێنێ بەوەی بە چەند فیگەرێکی تر «L»ێکی هەڵگەڕاوەی یان سەربەرەو خواری کردووە بە چوارچێوەی لای ڕاستی تابلۆکە.. واتا بەم شێوەیە «٦». کەواتە بەم پێیە تابلۆکە پێل و تەرازووەکەی ڕێك دەبێتەوە، گەر لە فیگەرەکانیش ورد بینەوە: منداڵێکی بچکۆلەمان لێوە دیارە کە دەبێ بە ڕەمزی «خۆشی و کامەرانی». لە سەرەوەش لەگەڵ باسك و سەری پیرەمێردە ڕیش و گەچەڵەکە دەگەن بەیەك .. وەك وتمان ئەم پیرەمێردە ڕەمزی «زەمەن»ەو باوە گەورەی هەموو شتەکانە، بە هەردوولا.. واتا بە هەردوو شێوەی «L» ئێڵەکان (– L٦ –) لاکێشێك پێك دێنن و سەرجەمی وێنەو فیگەرەکانی نێو تابلۆکەش زۆر بەجوانی دەکەونە نێو ئەو چوارچێوەیە، بەم شێوەیە هەر فیگەرێك و لەنێو ئەو تابلۆ ئاڵۆزەدا جێگەی خۆی گرتووەو هەریەکەو ماناو مەبەستی خۆیشی دەبەخشێ.

ئێستاش لە هەندێ لایەنی دیکەی ئەم تابلۆیە ورد بەر ەوە.. دەبینیت کە بە پانتایی ڕووبەری تابلۆکە شوێنی سپی و بەتاڵی تیا نەماوەو سەرتاپای بە فیگەرو شتی بەرجەستە پڕ کراوەتەوە، سەیری هەر شوێنێك بکەیت دیمەنێك، بابەتێك، فیگەرێك، شتێك هەیە سەرنجت ڕابکێشێت، هەر ئەم جووڵەو بزافتنە چڕو پڕو بەردەوامەی فۆرمەکان (دیمەن و شێوەکان) دەنێو ئەو تابلۆیەدا پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بە ڕۆح و بابەتی کارە

[illegible] کانی نێو تابلۆکە ورد بینەوە دەبینین لە فیگەرو کەسانی نێو [illegible] (وێنە – 3 –) زۆر جیاوازن، بەڵێ.. فیگەرەکانی تابلۆی [illegible] – 3 –) پڕو کامڵ و سروشتی و پاك و تەمیزو زیندوو نین، بەڵام [illegible] عیسا و لازارۆس بەئاسانی دەناسرێنەوە.. چونکە دوو زاتی [illegible] مەبەستیەتی دەریان بخا، هەروەها ئیشارەتە پیرۆزەکەی [illegible] ناوەڕاستی تابلۆکەو دیاریشە کە دەستی ڕاستەی بەرز [illegible] لازارۆس دەڵێ – « وەرە دەرێ.! » واتا فەرمانی پێ دەکا [illegible] ڕاست بێتەوە، جگە لەوەش عیسا لە باکگراوندی تابلۆکە [illegible] وەك بڵێی لە دەرەوەی وێنەکە وەستابێ. لێرەدا ئاشکرایە [illegible] ویستویەتی شتەکان بێ پێچ و پەناو بەڕوونی بخاتە بەرچاو.. [illegible] یەك تۆز تەموومژی تێدا بێ، ویستوویەتی لە ئاڵۆزی و [illegible] شێوان بەدوور بێ، ئەگەرچی ئەم شتانە لای ئێمە [illegible] لە هونەردا دەبن بە دیاردەی سروشتی.. بەڵام لای [illegible] دەبێتە مایەی سەرسامی و شڵەژان و لەڕێلادان.

[illegible] بەم پێیە دەبینین ئەو هونەرمەندە هاوچەرخەی تابلۆی [illegible] – 4 –)ی کردووە ویستوویەتی بەو ڕەسمەو بەهێزو گوڕێکی زۆرەوە [illegible] بەخۆی دەربڕێ.. بەڵام ناکرێ بڵێین ئەم تابلۆیە [illegible] توندوتۆڵی بە سروشتەوە هەیە، دیارە ئەم هونەرمەندە نە بە [illegible] هیچ گرنگییەکی بە سروشت و جیهانی دەورووبەر نەداوە، [illegible] هەست و نەستێکی زاتی خۆی بگوێزێتەوە سەر تابلۆکەو [illegible] نەبووە شتە بەرجەستەو بەرچاوەکانی دونیای دەرەوەمان [illegible] بەکورتی و کرمانجی لێك دابڕانێکی تەواو لەنێوان سروشت و [illegible] هەیە.. هەرچەندە ئەم تابلۆیە ناویشی «ئیقاعی پایز –٥».

[illegible] هەرچەندە زۆربەی جار هەقی خۆمانە گەر بپرسین ئاخۆ [illegible] یان تابلۆیەکی تر بابی چەند لە واقیعەوە نزیکە.. بەڵام دەبێ [illegible] بزانین کەی ئەم پرسیارە دەکەین.. گەر هەستمان کرد [illegible] جێی خۆی نییەو هیچ پەیوەندییەکی بە بابەت و [illegible] تابلۆکەوە نییەو بەڵکو بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ واقیعدا یەکدی [illegible] وا باشترە قسەی خۆمان بە خەسار نەدەین و ئەم جۆرە [illegible] فەرامۆش بکەین.

[illegible] بۆ لەتابلۆڕامان ئەوەیە کە بیر لە چۆنیەتی دارشتنەکەی [illegible] – لەوە ورد بینەوە ئاخۆ هونەرمەندەکە لە چ ڕێگەیەکەوە [illegible] بەکارهێناوەو چۆن توانیویەتی نموونەو وێنەی نێو تابلۆکان

هونەری‌یەکەوە هەیە.. **هەر لەبەرئەوەشە** کە سەیری دەکەین تەواویّ **هەڵدەچین‌و** ناتوانین **لەسەر تەنها لایەنێکی** قەرار بگرین.. ئەوین، کامەرانی، غیرەو بەخالەت،* **فروفێڵ‌و** درۆودەلەسە هەر هەموویان **بەشێوەیەکی** عەقڵی‌و شێوەکارانە لەسەر رووبەری ئەو تابلۆیەدا وا تێکەڵ‌و تێکچرژاون کە بەڕاستی نمونەیەکی ئاڵۆزی کارێکی هونەریمان دەخاتە بەرچاو.

لەم تابلۆیەدا هێڵی دەرەوەی فیگەرەکان کاڵ‌و ساردودیارن.. بەڵام رووی ناوەوەی وێنەو فیگەرەکان نەرم‌ولووس‌و خڕو بازنەیین، کت‌ومتیش لەوە دەچیّ لە مەرمەڕ دروست کرابن. هەست‌کردنیش بە ساردی‌و گەرمی، یان ڕەنگی گەش‌و تۆخ، یان زەق‌و تۆکمەیی وێنەکان لە ڕێگەی ڕەنگ‌ڕشتنەکەوە هەستی پیّ دەکریّ‌و بەخەستی دەردەکەویّ: دیارە لە چەند ڕەنگێکیش تیّ‌ناپەڕیّ.. لەوانە شینی کاڵ.. واتا شینێکی ئاچووغ، سپی‌یەکی بەفر ئاسا، هەندیّ پەڵەی ئیرەوئەوەی سەوزو دەگەڵ شینێکی تاریکتر. (تەنها ڕەنگێکی گەرم لەم تابلۆیەدا ڕەنگی سووری ئەو سەرینەیە کە «کیوپید» ئەژنۆی لەسەر داداوەتەوە). ئەم هەموو ڕەنگە کاڵ‌و روون‌وساردانە لەگەڵ تۆکمەیی‌و زەق هێڵی دەرەوەی فیگەرەکان دەبن بە حاڵەتێکی دژو ڕووبەڕووی جووڵەو زیندوێتی هەستی ئێمە دەوەستیّ‌و تەواویّ دەمانخرۆشێنیّ‌و لەوانەیە جۆرە هەوەسێکیشمان لا بخوڵقێنیّ.. بەواتا ساردی‌و گەرمی، توندی‌و نەرمی بەرامبەر جووڵەی هەست‌بزوێنی ناوەڕاستی تابلۆکە دەوەستیّ‌و ئیقاعێك بە بابەتەکە دەدا. هەر لەڕێگەی ئەمانەوە دەگەینە ئەوەی لە ڕەمزی ئەوین یان هەوەسە سێکسی‌یەکە تیّ‌بگەین، جا چ ساردو چ گەرم.. ئەم ئەوین‌و هەوەسەش یان بە ناسکی خۆی دەنوێنیّ یان شێتانە.. وەلیّ لەم تابلۆیەدا وامان لیّ دەکا زۆر لەسەرخۆو بەهێمنی بیر لە ڕەمزەکانی بکەینەوە.. واتا لێرەدا مەبەست هەوەس‌بزواندن نی‌یە.. بەقەد ئەوەی شی‌کردنەوەی نهێنی‌یەکانی مرۆڤە.

لەلایەکەوە هەست بە جۆرە تورت‌بوونێك (توتر) دەکەین لەنێوان فۆرم‌و ڕەنگەکاندا، لەلایەکی دیکەوە لەنێوان ئەمانەو بابەتی تابلۆکەدا هەست بەو تورتی‌یە دەکەین.. پیّ‌بەپیّی ئەم تورتی‌یە هەست بە ماناومەبەستی ژێرەوەی تابلۆکە دەکەین.. ئەوەشیان لەڕێگەی شی‌کردنەوەی ڕەمزەکانەوە بەئەنجام دیّ... با ئەوەشمان لە بیر نەچیّ کە رامانێکی ئاسایی دیوی دەرەوەی تابلۆکە هەر ئەوەمان دەداتیّ کە لە فیگەرەکانەوە دیاری دەدا.. بەڵام لەژێرەوەو بەتەوسەوە نهێنی گەورەتر دەدرکێنیّ.

**لێدووانو شی‌کردنەوەی شێوەو داڕشتنی تابلۆکان یارمەتیمان دەدا پتر لە ماناو مەبەستەکانی بگەین‌و شارەزای ئەو کەرەستانەش بین کە هونەرمەندەکە بەکاری هێناون تا ئەو ئامانج‌و مەبەستانە بپێکیّ کە خۆی بەدوایاندا وێڵەو بەم شێوەیەش دەتوانیّ کار لە ئێمەمانان بکا.**

بەم پیّ‌یە دەتوانین لە چەندەها تابلۆ ورد بینەوە کە سەر بە قۆناغ‌و شوێنی جیاوازن. هەرچەندە لە هەنگاوی یەکەمدا بەشێوەیەکی سەرەکی لە روانگەی بابەت‌وناوەڕۆکەوە لە تابلۆکان دەڕوانین، پاشان بە خەستی لە لایەنەکانی فۆرم‌و بناغەی تابلۆکان ورد دەبینەوە.. هەڵبەتە بناغەو داڕشتن‌و فۆرمی هیچ تابلۆیەك ئەوەندە ئاسان نی‌یە کە لە یەکەم سەیرکردنەوە بێتە دەست.. پیّ‌بەپیّی شی‌کردنەوە ڕووبەڕووی ماناو مەبەست‌و بیرۆکەکان دەبینەوە – هەندیّ جار ماناو مەبەستەکان چاوەڕیّ نەکراوبشن – پیّ‌ئەوەی بەتەواوی بخرێنە خانەی «ناوەڕۆك» یان «فۆرم» بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ تێگەیشتن لە تابلۆکەو چێژوەرگرتن کارێکی زۆر پێوستەو نابیّ فەرامۆش بکریّ.

لێرەدا نامانەویّ لەو پەیوەندی‌یەی نێوان تابلۆکان‌و ئەو کۆمەڵگایە بدوێین کە ئەو بەرهەمانە دێنێتە کایەوە، ناشمانەویّ بەپیّی کات‌و سەردەمەکان ئەو تابلۆیانە شی بکەینەوە. زۆربەی کتێبە بەپێزو بەهاکانی مێژووی هونەر لە ڕوانگەیەکی مێژووی‌یەوە لە کارە هونەری‌یەکان نزیك دەبنەوەو ئەو دەوروبەرەش دەخەنە ڕوو کە هونەرەکەیان خوڵقاندووەو هەروەها هەنگاو بەهەنگاویش بەپیّی سەردەم‌و چاخەکان باس لە گەشەسەندن‌و پێش‌کەوتنی شێوازە هونەری‌یەکان دەکا.

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە بتوانین دەربارەی وێنەو تابلۆکان بدوێین.. نەك بەتەنها رامان‌و سەیرکردنێك واز بێنین، هەروەها کارێکی نابەجیّ‌یەو سەیرکردن لەپێناو سەیرکردن چێژێکی تەواومان پیّ نابەخشیّ. بەڵکو گەڕان بەدوای ئەو وشانەی وەسفی تابلۆکان دەکاو ماناومەبەستی وێنەکانمان بۆ شی دەکاتەوە دەبیّ بە تاکە پردو بەردەبازێك بۆ ئەوەی لە روانینێکی پیّ‌باکانەو ساردو سەلبی‌یانەوە بپەڕینەوە بەرەو رامان‌و وردبوونەوەیەکی زیرەکانەو کاریگەرانە تا لەوێوە بەوپەڕی هوشیاری‌و بە چاوێکی هونەرمەندانە لە گەوهەرو نهێنی‌یەکانی تابلۆکە تیّ‌بگەین.

**سەرچاوە:**


Looking at pictues
Susah Woodford
London

چاپی یەکەم (1983)_ 14).

# هەموو کچێك چی بزانێ

دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد

طاهر مەریوانی لە سی‌یەکان‌دا لەگەڵ خوالێ‌خۆش‌بوو مصطفی صائب (١٩٠٤ – ١٩٨٠) قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکداو دوانزدە کتێبی کوردی‌یان لەچاپ داو بلاوکردەوە، کە بە ئەرك‌و ئەمەکی «کوردی‌و مەریوانی» هاتبوونە بەرهەم[١]. ژمارە (٦)ی ئەم زنجیرەیە کتێبێکە کە بەناوی «هەمو کچیك چی بزانی»یە، یەکەم کتێبی پزیشکی‌یە کە بەزمانی کوردی دەربچێ، قەبارە چارەکە بەتاڵەو پەرە بۆرەو (٨٨) لاپەرەیەو لە ساڵی (١٩٣٣) زاینی‌دا لە چاپخانەی (کرخ)لە بەغدا چاپ دراوە.

**پێشەکی:**

نامیلکەکە پێش‌کەش کراوە بە (بەهەموو کچێکی تازەی کوردی ئەکەین، کە هیوای لەمەولا سەرکەوتن‌و پێگەیشتنی نەتەوەی مستقبل وابەستەی ئەوانە)[٢].

کتێبەکە لەم بەشانە پێك هاتووە (سەرەتا، دیباچە، کچیەتی (١، ٢)، پی‌گەیشتن (١، ٢)، محرکی جنسی (١، ٢)، نەوە(١، ٢)، هەندێ تأثیراتی سکوت‌و نادانی، گۆرانی ژین) لە (سەرەتا)دا ئەڵێ: «لەمەولا بیرمان وایە ناوبەناو ئەم چەشنە کتێبانەیش بلاوبکەینەوە. چونکە زۆر داماوی ئەم تەحرە نوسینانەین، وکچە کوردەکان کەوا تازە پی‌ئەگەن زۆر سرك‌و شەرمنی گەلی شت هەیە کە پێویستە بیزانن‌و فێرناکرێن، یالە ناسیاوێکی خراپەوە زۆر خراپ فێر ئەکرێن. بۆ ئەوەی هەمو کچە کوردێك خوی بناسێ‌و لە دایکیەتی‌و ژیان شارەزا بێ، ئەم کتێبەمان چاپ کرد، کە زۆر باش‌و بەکارە بۆیان. تکایش ئەکەین تەماشای کلمەو شتی وامان نەکرێ، چونکە ئەمە یەکەم کتێبە لەم بابەتەوە، لەزمانێکی علم‌و فنی غربەوە وەرگیراوەو کوردیش هێشتا کەم هێزەوێ لقوپۆیە لە ماوەی علم‌و فندا، لەبەر ئەوە اصطلاحەکان نەکرێ، تاپیان کرابی بە کوردی نوسیومانەو وامان نوسیوە کە هەمو کسێك تێی بگاو خیری لێ ببینی بیرمان وایەو حەز ئەکەین لە بابەت ئافرەت‌و ژنەوە چی باشەو پێویستە وەریگیرین‌و لە بەرەوە بلاوی بکەینەوە بۆ خزمەتی پێگەیشتن‌و سەرکەوتنی ئافرەتی کورد چونکە باوەڕمان هەیە کە تا ئافرەت نەخوێنێ، پی‌نەگا، و سەرنەکەوێ ملت پێش ناکەوێ، پێ ناگا.

**مانگی: خەرمانان 1933 کوردی مەریوانی**

سەراپا کتێبەکە بابەتێکی زانستی بەنرخە نەك هەر بۆ ئەوکاتە، بەڵکو بۆ ئەمرۆش، باسی پێگەیشتن‌و گەشەی بەردەوامی کچ‌و نیشانەکانی کچیەنی‌و هەرزەکاری‌و پێگەیشتن ئەکاو هەموو لادان‌و خواری‌یەکیان بۆ رۆشن ئەکاتەوە، باسی زۆر نەخۆشی‌مان بۆ ئەکات کە ئەشێ لەئەنجامی لادان‌و نەزانی‌یەوە تووشی ژن‌وپیاوبیێت، لە کۆتایی دا باسی لێ‌چوونەوەی ئافرەت‌و نیشانەو تەنگ‌و چەڵەمەکانیان بۆ ئەکات.

**نرخی نامیلکەکە:**

پاش خوێندنەوەی نامیلکەکە، چەند خاڵێك لە مێشکی خوێنەردا گەڵاڵە ئەبێ‌و کتێبەکە ئەنرخێنێ، بەلای منەوە چەند نرخێکی هەیە.

**یەکەم، نرخی مێژوویی:**

پاش ئەوەی چاوێك بە کتێبخانەی پزیشکی کوردیدا ئەگێری، ئەوکاتە بۆت دەرئەکەوێ کە ئەم کتێبە خۆی لەخۆیدا مێژوویەکی مەزنە، پزیشکێکی نامۆی دوورەولات (٥٥) ساڵ پێش ئێستا هەستێ‌و بەوزمانە شیرینە، یەکەم کتێبی پزیشکی مان بۆ بنوسێ، ئەمرۆ (٥٥)ساڵ پاش ئەو نامیلکەیە کتێبە زانستی‌یە کوردی‌یەکان نەك بەتایبەتی پزیشکی‌یەکان هێندە کەمن، بە پەنجەکانی هەردوو دەست بژمێردرێن.

**دووەم، نرخی زانستی:**

ئەم کتێبە بابەتێکی هێندە ناسکی خستۆتە ڕوو، کە تا ئەمرۆش

زۆربەمان ورەمان لی‌یە، لیٚ‌ی کەوین. جگە لەمە بنەما پزیشکی‌یەکانی کە باس کردووە دووسیٚ‌یەکی تائیٚستاش هەر جی‌گرن‌و بگرە گەر ئەمڕۆ ئەم نامیلکەیە وەکو خۆی لەچاپ بدریٚتەوە، هەمان سودو ڕۆل ئەدات کە ئەسالٚی (١٩٣٣) کوردی مەریوانی بۆی نوسیوە.

**سیٚ‌یەم، نرخی زمانەوانی:**

چەندان زاراوەی پزیشکی کوردی لە خۆی گرتووە، کە ئەتوانریٚ بەسەر چاوەیەکی زاراوەی زانستی‌و بگرە فەرهەنگۆکیٚك دابنریٚ، هەرلەم پیٚودانگەوە هەندیٚ لەو زاراوانەی ناویتان بۆ ئەخەمە ڕوو.

| | | |
|---|---|---|
| پی‌گەیشتن | بلوغ | Maturation |
| هیٚلکەدان | مبيض | Ovary |
| هیٚلکەبچکۆلە | بويضة | Ovules |
| منالٚدان | رحم | Uterus |
| پەردەی کچێنی | غشاء البكارة | Hymen |
| هیٚلکەهاویٚشتن | | Ovulation |
| نەوە | نسل | Offspring |
| سك‌پڕبوون | حمل | Conception |
| گۆشتی‌منال | المشيمة | Placenta |
| هیٚلنج | | Nausea |
| فەرەنگی | الزهرى | Sphilis |
| سوزەنەك | السيلان | Gonorrhea |

**پەراویٚزەکان**

١ - بڕوانە گۆڤاری (تەندروستی‌و کۆمەلٚ) نەریمان بابەلٚی (نوژدارانمان لەمەیدانی نوسیندا)

ژمارە (٣)

سالٚی ١٩٨٧

لاپەڕە (٢٠)

٢ - بڕوانە «هەمو کچیٚك چی‌بزانی» کوردی‌و مەریوانی

سالٚی ١٩٣٣

چاپخانەی کرخ

لاپەرە (A,B)

# کانزاکان لە لەشماندا

د. عادل حسين عبد الله

ئیٚمە لە خواردنی ڕۆژانەماندا گەلیٚك لە کانزاکان بەکاردیٚنین کە زور گرنگن بۆ تەندروستی‌و دریٚژەدان بە تەمەن، ئەم کانزایانەش هەر کە ڕیٚژەیان لە لەش‌دا کەم‌بوو یان زیادبوو ئەوا کاریٚکی گەورە ئەکەنە سەر تەندروستی، گۆڕان لە لەش‌دا بەگشتی ڕوو ئەدات.

ئەم کانزایانە زۆرن وەکو:- ئاسن -کالسیۆم ئایۆدین(یۆد) -کوپەر - کرۆم - فسفۆر - مەگنسیۆم - سۆدیۆم پۆتاسیوم - کادمیۆم - ڤانادیۆم - فلۆرو هی‌تریش.

تاقیگەیەك لە سەر یەکیٚك لە چیاکان‌دا هەیە لە ژیٚر چاودیٚری دکتۆر شرۆیدەر (Shroider) کە یەکیٚکە لە زانایەکانی تایبەت بە لیٚکۆلٚینەوەکانی نەخۆشی بەرزبوونەوەی تەووژمی خویٚن‌و گرنگی کانزا لە لەش‌دا. وە ئیٚستاش خەریکی لیٚکۆلٚینەوەیە لە بابەت پەیوەندی کانزا بە لەش‌و نەخۆشی. وە ئەم دکتۆرە ئەلٚیٚ: ئیٚمە هەر ڕۆژیٚك ڕیٚژەیەکی کەم لە کانزاکان بەکار ئەهیٚنین وە لە شی مرۆڤ چاك ئەزانیٚ کامەوە چۆن‌و چەند کانزای پیٚویستە وچۆن لە ڕیٚژەی زیادی کانزا لە لەش‌دا ڕزگاری‌بیٚت؟ بۆ



نموونە کانزای کۆپەر (Cupper) کە زۆر گرنگە بۆ پیکهێنانی خوێن. ئەگەر ڕێژەکەی لە لەش‌دا بگاتە (١/١٠)ی گرامێك ئەوا ژیان ئەکەوێتە مەترسی‌یەوەو ئەبێتە هۆی مردن ئەگەر لەم ڕێژەیە زیاتربوو، لەشی ساغ کانزای کۆپەری زیاد لە پێویستی خۆی بە ڕیگای میز ئەکاتە دەرەوە تاکو تووشی مەترسی زیادبوونی ڕێژەی ئەم کانزایە نەبێت لە لەش‌دا.

ئەمەش ڕاستە کە لەش پێویستی بە هەندێ کانزانی‌یە بۆ نموونە کانزای کادمیۆم (Cadmium) کە زۆر جار بە هۆی بۆری‌یەکانی ئاو خواردنەوە ئەچێتە ناو لەش. هەروەها کانزای قورقوشم (الرصاص) کە لەگەڵ دوکەڵی ئۆتۆمبیلەکانو هەندێ پیشەسازی پەیدائەبێت و ئەچێتە ناو لەش، بەڵام لە هەمان کات‌دا لەش توانای ئەوەی هەیە کە لەم کانزایانە کە پێویستی پێ نی‌یە ڕزگاری‌بێ. هەندێ جار ئەگەر هاتوو ڕێژەی ئەم کانزایانە لە لەش‌دا زیادبوو وە لەش نەیتوانی فڕیێان بداتە دەرەوە، ئەوا تووشی تەنگ‌و چەلەمە ئەبێت هەر وەکو سك‌ئێشان لە ئەو نەخشەکێشانەی قورقوشمی سپی بەکاردێنن بۆ نەخشەکێشانو ڕەسمەکانیان پاش کۆبوونەوەی بڕێکی کەم لەم کانزایە لە لەشیان‌دا.

دکتۆر شرۆیدەر گەیشتۆتە ئەوە کە ئەڵێ: هەندێ کانزا ڕەنگە گرنگتربن لە گرنگی ڤیتامینەکان بۆ لەش، چونکە لەش ئەتوانێ کەبێت ڤیتامین وەکو ڤیتامین (F) بۆ خۆی دروستی‌بکات لە کاتی پێویست بەڵام ناتوانێ کانزا بۆ پێویستی خۆی دروست بکات، نەك هەر ئەمەش بەڵکو زۆر جار ناتوانێ لە بڕی زیادی کانزا ڕزگاری‌بێت‌و لە ئەنجام‌دا تووشی نەخۆشی ئەبێت.

ئەم زانایە دیسان بەهۆی چەند تەکنیکێکی تایبەتی بۆ شی‌کردنەوەو پێوانی ماددە کیمیائی‌یە میکرۆسکۆبی‌یەکان تـوانیویەتی کە بە پێوانی بڕی یەکجار بچووك لەم کانزایانە لە ناو شانەکانی لەش‌دا هەڵسێ، وە ئێستاش بە هۆی ئامێرێکی ئاڵۆز کە پێ‌ی ئەووترێ سپێکترۆسکۆب (Spectroscope). بە تێنی ڕۆناکی ئەم ئامێرە بڕی زۆر بچووك وەکو (٥) لە ملیۆنێك بەش لە کانزای کرۆم لە شانەکانی جگەری مشك‌دا بدۆزێتەوە. چونکە لە پزیشکی‌دا بڕی ئاوا بچووکیش زۆر گرنگە بۆ لەش ئەگەر بزانرێ، بۆ نموونە: لە یەکێك لە باغەکانی خۆخ‌دا کەمی کانزای زینك (تۆتیا) بووە هۆی ووشك بوونەوەی درەختەکانی خۆخ‌و هیچی تر بەریان نەگرت، کەچی پاش ڕژاندنی کانزای زینك لەم باغەدا، دووبارە درەختەکان گەشەیان کردەوە. جا ئەبێ کاری کەم‌بوونەوەی بڕی بچووك

لەم کانزایە لەسەر لەش‌دا چی‌بێت؟ هەروەها لە ئوستراڵیادا گەلێك لە مەڕەکان لاواز ئەبوونو لەکۆتایی‌دا ئەمردن لە بەر کەمی کانزای کۆباڵت (Cobalt) لە لە شیان‌دا. مرۆڤیش هەمان پێویستی بە کانزا جۆر بەجۆرەکان هەیە تاکو ژیانی دوور بێ لە نەخۆشی. بۆ نموونە: کەم بوونەوەی ڕێژەی کانزای ئاسن لە لەش‌دا مرۆڤ تووشی کەم خوێنیو لە ئەنجام‌دا خنکان ئەکات، وەکەم بوونەوەی ڕێژەی گەلێ کانزای گرنگی تر بۆ لەش، مرۆڤ تووشی نەخۆشی جۆر بەجۆر ئەکات کە پاشان باسیان ئەکەین.

هەندێ کانزای وەکو ئەلەمنیۆمو ڤانادیۆم لە سی‌یەکاندا کۆ ئەبنەوەو کانزای کادمیۆم لە گورچیلەو کانزای قورقوشم لە جگەردا کۆئەبنەوە کە تائێستا هۆو گرنگی ئەم کارە دیارنی‌یە، بۆیە ئەوە نزیکەی ماوەی (١٠) ساڵە دکتۆر شرۆیدەرو (١١) زانای تر لە گەڵیا خەریکی لێکۆڵینەوەن لەم بابەتەدا.

**کادمیۆم (Cadmium)**

ئەم کانزایە لە زۆر بەشی لەش‌دا بەدی ئەکرێ. هەروەها لە لەشی پیرەکاندا بە زۆری کۆئەبێتەوە. چاووگی سەرەکی ئەم کانزایە بریتی‌یە لە ئاوی ناو بۆری‌کان کە بۆ خواردنەوە بەکاردێ وە هەندێ جۆرە رووەك.

لە ئەمریکادا تاقی کردنەوەیەك‌کرا لە سەر کۆمەڵێك مشك وە دانران لە ژێر رژێمێکی تایبەتی خواردن کە هیچ لە کانزای کادمیۆمی تیانەبوو. وە کۆمەڵێکی تر کانزای کادمیۆمیان ئەدرایێ لە گەڵ خواردن‌دا. لە ئەنجام‌دا (٩٠٪)ی لەوانەی خواردنی بێ کانزای کادمیۆمیان ئەخوارد تووشی بەرزبوونەوەی تەووژمی خوێن هاتنو زوو مردن. بەڵام ئەوانەی کانزای کادمیۆمیان ئەدرایێ لەگەڵ خواردن‌دا تووشی هیچ جۆرە نەخۆشی‌یەك نەبوون. لە مرۆڤدا بە پێ‌ی جوغرافیا ڕێژەی ئەم کانزایە لە لەش‌دا ئەگۆڕێ. بۆ نموونە لە لەشی مرۆڤی ئەمریکیو یابانی‌دا ڕێژەی ئەم کانزایە کەمە لە گورچیلەدا. کەچی لە لەشی مرۆڤی ئەفریقی‌دا ڕێژەی ئەم کانزایە زۆرە لە گورچیلەدا بۆیە زۆر بە دەگمەن نەخۆشی دڵو بەرزبوونەوەی تەووژمی خوێن بەدی ئەکرێ لە نێو ئەفریقی‌یەکاندا. لێرەدا دکتۆر شرۆیدەر نەیتوانیوە تائێستاش گرنگی ئەم کانزایە لە لەش‌دا دیاربکات بۆیە ئەڵێ: ئەم کانزایە جێ‌ی گومانە لە لەش‌دا!.

**کرۆمیۆم (Chromium)**

کانزای کرۆمیۆم (یان کرۆم) بە ڕێژەیەکی دیاری‌کراو لە شانەکانی لەش‌دا هەیە. بەڵام ئەم ڕێژەیە کەم ئەبێتەوە لە گەڵ پێشکەوتنی تەمەن. ڕێژەی کانزای کروم لە لەشی منداڵ لە سەرەتای ژیانی‌دا سێ‌جار زیاترە لە ڕێژەی ئەم کانزایە لە لەشی گەنجەکاندا ئایا گرنگی ڕێژەی کرۆم لە لەش‌دا چی‌یە؟

دکتۆر شرۆیدەرو تیپەکەی چەند تاقی‌کردنەوەیان کرد لەسەر کۆمەڵێك جورجو خواردنیان هیچی لە کانزای کرۆم تیانەبوو، پاش چەند مانگێك بینرا کە (٨٠٪)ی ئەم جورجانە تووشی نەخۆشی شەکربوون. لە مرۆڤدا ئەم کانزایە پەیوەندی‌یەکی زۆری هەیە لە گەڵ نەخۆشی شەکر، بۆ نموونە لە تایلاندا زۆر لە نەخۆشەکانی تووش‌بوو بە نەخۆشی شەکر مردن چونکە ڕێژەی کانزای کرۆم لە لەشیاندا زۆر کەم‌بوو، هەرچەندە مادەی ئینسۆلینیش (Insulin) لە لەشی ئەم نەخوشانەدا هەبوو کە گرنگە بۆ نەخۆشی شەکر، چونکە ئەم ڕاستی‌یە زانراوە کە مادەی ئینسۆلین بە باشی کارناکاتە سەر خانەکانی لەش ئەگەر ڕێژەیەکی بەس لە کانزای کرۆم لە گەڵیدا نەبێت، وە ئەم بابەتەش ئێستا زۆرتر لەژێر خوێندنو لێکۆڵینەوە – دایە لە نەخۆشخانەی وولتەر لە واشنتۆن‌دا وەوا بەدی ئەکرێ کە کانزای کرۆم بەم زووانە لە پزیشکی‌دا بەکار بهێنرێ.

**قورقوشم (الرصاص Lead)**

ئەم کانزایەش ئێستا لە ژێر لێکۆڵینەوەدایە چونکە هەر ساڵێك هەزاران تۆن لەم کانزایە بلاو ئەبێتەوە ناوهەواوەئەم بڕەش بەشێوەیەکی سەرەکی لە ئەنجامی – پیشەسازی بۆیەو لەحیمو پەترۆل پەیدا ئەبێت، ئایا ئەمەش مەترسی هەیە بۆ مرۆڤ یان‌نا؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، هەر دەستەیەکی پزیشکی بیروڕایەکی تایبەتی‌یان هەیە – دەربارەی ئەم کانزایە. هەندێکیان ئەڵێن: – ئەم زیادبوونە لە ڕێژەی قورقوشم لە هەوادا زیانی نی‌یە بۆ مرۆڤ، بەڵام دەستەیەکی‌تر ئەڵێ:– ئێمە لەم ساتەماندا تووشی تەنگ‌و چەڵەمەیەکی زۆری تەندروستی ئەبین لەم شوێنەوارەدا.

**ئاسن (Iron)**

کانزای ئاسن زۆر گرنگە بۆ منداڵو گەورە چونکە یەکێکە لە پێکهاتووە بنەڕەتی‌یەکانی مادەی هیمۆگلۆبین لە ناو خڕۆکە سوورەکانی خوێن‌دا کە زۆر گرنگە بۆ گواستنەوەی گازی ئۆکسجین بۆ خانەکانو فڕێدانی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە خانەکانەوە بۆ سی‌یەکانو لەوێش بۆ دەرەوە لە گەڵ هەناسەدانەوە.

ئاسن لە زۆر خواردەمەنی‌دا هەیە وەکو: گۆشت – هێلکە – جگەر – خاس کەرەووز – ماسی – هەندێك

سەوزە. وە کەم‌بوونی ڕێژەی ئاسن لە لەش‌دا ئەبێتە هۆی نەخۆشی کەم خوێنی (Anaemia)، وە لێکۆڵینەوە یەك دەری خستووە کە کەم بوونی ئاسن لە منداڵدا ئەبێتە هۆی کەم خوێنی‌و کورت‌بوونی پەلەکان لە پاشە ڕۆژدا زیادبوونی ڕێژەی ئاسن دیسان ئەبێتە هۆی نەخۆشی، وەکو کۆبوونەوەی ئاسن بە بڕێکی زۆر لە جگەردا کە پێی ئەووترێ (Siderosis) وە لە ئەنجامدا نەخۆشی مۆم‌بوونی جگەر (Liver Cirrhosis) ڕوو ئەدات کە هەندێك جار کوشندەیە، ئەم گیروگرفتەش زۆر بەدی ئەکرێ لەوانەی دەرزی کە کانزای ئاسنی زۆری تیایە زۆر بەکاردێنن بە بێ ئامۆژگاری پزیشك چونکە وائەزانن بەم جۆرە خوێنیان زیاد ئەکا، هەروەها لە ئەفریقیادا ئەم نەخۆشی‌یە زۆر بلاوە.

- کالسیۆم (Calcium)

نزیکەی (١٢٠٠) گرام لەم کانزایە لە لەش‌دا هەیە کە نزیکەی (٩٩٪)ی ئەم ڕێژەیە لە ئێسکەکان‌و ددانەکان‌دا هەیە. گرنگترین سەرچاوەی خواردەمەنی‌یەکانی کالسیۆم بریتین لە: شیر - پەنیر - هێلکە - گوێز - گۆشت - سەوزە - ماسی. کەم بوونی ڕێژەی کالسیۆم لە منداڵدا ئەبێتە هۆی نەخۆشی ئێسکەنەرمە (Rickets)و دواکەوتنی گەشە (Growth Retardation)، هەروەها لە گەورەدا ئەبێتە هۆی نەخۆشی خورانی ئێسکەکان (Osteomalacia). هەروەها کەمی ڕێژەی کالسیۆم لە لەش‌دا بە تایبەتی منداڵەکان ئەبێتە هۆی نەخۆشی تیتانی (Tetany) کە بریتی‌یە لە گرژبوونەوەی خۆنەویستی ماسولکە خۆویستەکان. پێویستی ڕۆژانەی کالسیۆم ئەگاتە (٥٠٠) ملیگرام. هەروەها زیادبوونی ڕێژەی کالسیۆم لە لەش‌دا ئەبێتە هۆی دروست‌بوونی بەردی گورچیلە (Renal Stone).

- فسفۆر (Phosphorus)

نزیکەی (٨٥٪)ی ڕێژەی فسفۆری لەش لە ئێسکەکاندا هەیە کە یەکی‌گرتووە لە گەڵ کالسیۆم. کانزای فسفۆر زۆر گرنگە بۆ میتابۆلیزمی لەش.

کەم‌بوونی ڕێژەی فسفۆر لە لەش‌دا ئەبێتە هۆی نەخۆشی ئێسقان‌و شێوانی کاری میتابۆلیزمی لەش. زیادبوونی ڕێژەی فسفۆر لە لەش‌دا بە تایبەتی لەو منداڵانەی شیری قوتو بەکار ئەهێنن ئەبێتە هۆی تەنگ‌و چەڵەمە لە میتابۆلیزمی لەش‌دا. هەروەها کەم بوونی ڕێژەی فسفۆری لەش ڕوو ئەدات لەو کەسانەی کە بە زۆری مادەی هایدرۆکسیدی ئەلەمنیۆم (Al(oh)3) بەکاردێنن بۆ کەم کردنەوەی ڕێژەی زیاد ترش‌بوونی گەدە (Hyperacidity)، وە چەند نیشانەیەك لە ئەنجامی کەم‌بوونی فسفۆر لە لەش‌دا ڕوو ئەدەن وەکو: بێ‌هێزبوونێکی گشتی - ئازار لە ئێسقان‌دا.

ئایۆدین (Iodine)

کانزای ئایۆدین (یۆد) بەڕێژەیەکی کەم لە ئاوو هەندێ درەختی دەریاو هەندێ جۆرە ماسی‌دا هەیە.

ئایۆدین زۆر گرنگە بۆ گلاندی ئایرۆید (Thyroid) وە کەم‌بوونەوەی ڕێژەی ئایۆدین لە لەش‌دا ئەبێتە هۆی ئاوسانی گلاندی ئایرۆید کە پێی ئەووترێ (Goitre) هەروەکو لە ناوچەی بادینان باوە چونکە ئاوی خواردنەوە کە ئاوێکی سووکە یان شیرینە کەمی لە ئایۆدین تێدایە. ئاوی دەریا ڕێژەیەکی باشی لەو کانزایە تیایە لەوەی کە لە ئاوی ڕووبارەکاندا هەیە.

پێویستی ڕۆژانەی ئایۆدین بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی ئاوسانی گلاندی ئایرۆید ئەگاتە (١٢٠) مایکرۆ - گرام.

- فلۆراید (Fluoride)

فلۆریدا (فلۆر) بە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە ئێسقان‌و ددانەکاندا هەیە. ئەم کانزایە زۆر گرنگە بۆ بەرهەڵستی ددانەکان دژی کلۆربوون (Dental Caries).

ئەم کانزایە بە ڕێژەی (١) بەش لە ملیۆن بەش لە ئاوی خواردنەوەدا هەیە کە ئەگاتە (١ - ٢) ملیگرام لە ئاوی خواردنەوەی ڕۆژێك‌دا، ئەم ڕێژەیەش زۆر کەم ئەبێتەوە لە ئاوی ڕووبارەکاندا لەوەی لە ئاوی دەریادا هەیە. هەروەها فلۆر لە ماسی دەریادا هەیە بە ڕێژەیەکی باش وە چا ڕێژەیەکی گونجاوی لە فلۆرایدا تێدایە. هەر لەبەر گرنگی فلۆراید بۆ ددانە کە کۆمپانیاکانی داروسازی جیهان ڕێژەیەکی باش لەم کانزایە ئەخەنە ناو (مەعجونی) ددان شووشتن.

زیادبوونی ڕێژەی فلۆرایدیش لە لەش‌دا دیسان ئەبێتە هۆی پێکەوە نووسانی ددانەکان (Mottling of Teeth)و وون‌بوونی بریقەی ددان‌و زبر بوونی ددان هەروەکو بەدی ئەکرێ لە وولاتەکانی ئەرجەنتین - هیندستان - چین - ڕۆژهەلات‌و باشووری ئەفریقیا.

-سۆدیۆم (Sodium)

کانزای سۆدیۆم زۆر گرنگە بۆ هاوسەنگی شلەی لەش. سۆدیۆم لە خوێدا بە شێوەی سۆدیۆم کلۆریدا (Na Cl) هەیە. کەمبوونی ڕێژەی سۆدیۆم لە لەشدا کە لە ئەنجامی گەلێك نەخۆشی ڕووئەدات وەکو: نەخۆشی ئەدیسۆن (Addisons Disease) – زیاد ئارەقە کردن (Hyperperspiration) – سكچوون (پەلەفیرە) – ڕشانەوە – سووتان – هەندێ جار هەوکردنی گورچیلە (Pyelonephrit is). کەمبوونی ڕێژەی سۆدیۆم لە لەشدا ئەبێتە هۆی شێوان لە هاوسەنگی شلەکانی لەش.

**پۆتاسیۆم (Potassium)**

کانزای پۆتاسیۆم گرنگە بۆ هاوسەنگی شلەکانی لەش هەروەکو سۆدیۆم. کەمبوونی ڕێژەی پۆتاسیۆم لە لەشدا ڕوو ئەدات لە هەندێك نەخۆشی وەکو: سكچوون – ڕشانەوە

نەخۆشی کوشنیگ (Cushing Syndrome)

– دەرمانی میز زیادکردن (Diuretics) کە بۆ چارەسەرکردنی بەرزبوونەوەی تەووژمی خوێن بە کاردێن، وە ئەم کەمبوونەش لە ڕێژەی پۆتاسیۆم لە لەشدا ئەبێتە هۆی پەیدابوونی چەند نیشانەیەك وەکو: بێهێزبوونی ماسولکەکان – شێوانی مێشك (Mental Confusion) – ئاوسانی سكو هەندێ جار ئاوسانی لەش بەگشتی – گۆڕان لە نەخشەی کارەبایی دڵ (ECG).

زیادبوونی ڕێژەی پۆتلسیۆم لە لەشدا ئەبێتە هۆی بێهێزبوونی ماسکوڵکەکانو ئاوسانی سكو گۆڕان لە (ECG) دڵ.

**– مەگنسیۆم (Magnessium)**

مەگنسیۆم بە ڕێژەیەکی باش لە خواردندا هەیە وە کەمبوونی ڕێژەی مەگنسیۆم هەروەکو ڕوو ئەدات لە نەخۆشی شەکر – سكچوون – ڕشانەوە – کەم خۆراکی (Malnutrition) – خواردنەوەی ئەلکهول بۆ ماوەیەکی زۆر ئەبێتە هۆی چەند نیشانەیەکی وەکو: دەست لەرزین (tremor) – شێوانی مێشك – خوگرتن (ف٢).

زیادبوونی ڕێژەی مەگنسیۆم لە لەش ڕوو ئەدات لە هەندێك نەخۆشی گورچیلەدا وە نیشانەکانی بریتین لە:– بێهێزبوونی گشتی – خورانی لەش (Itching) – تینووبوون – ڕشانەوە – کەمخوێنی.

**کانزاو درێژبوونی تەمەن**

لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر شرۆیدەرو تیپەکەی چەند ڕاستییەکی تریان دەرخستووە دەربارەی پەیوەندی کانزا بە تەندروستی، بۆ نموونە:– لە هەندێ ناوچەی یاباندا کە ئاوی ساف بەکاردێنن بۆ خواردنەوە زۆری مردووەکان بە هۆی لێدانی مێشك (Stroke)ەوە مردوون، لەبەر نیشتنی کانزای کالسیۆم لە دیواری ناوەوەی خوێنبەرەکانی مێشكدا، چونکە ئەم ئاوە ڕێژەیەکی کەمی لە کانزای کالسیۆم تێدایە، کەچی ئائێستا ئاوی قورس دا ئەنرا بە هۆیەکی گرنگی نیشتنی کالیسیوم لە دیواری ناوەوەی خوێنبەرەکان چونکە ئاوی قورس ڕێژەی کالسیۆمی زیاتر لە ئاوی شیرین (ساف) تێدایە. وە شی کردنەوەی ئەم ڕاستییەش بەمەیە کە ئاوی قورس چینێك لە کالسیۆمی نیشتوو پەیدا ئەکات لەناو دیواری بۆرییەکانی گواستنەوەی ئەم ئاوە بۆ خواردنەوەو پاشان ئەم ئاوە هەڵئەسێ بە گواستنەوەی گازی کاربۆن دایۆکسایدو ترشی ئەم ئاوە زیاد ئەبێتو یارمەتی توانەوەی کانزای کۆپەرو زینكو کادمیۆمو قورقوشم ئەدات لە ناو بۆرییەکانی ئاو گواستنەوە، بەم جۆرە ڕێژەی تووشبوون بە نەخۆشییەکانی خوێنبەری دڵو مێشك زیاد ئەکات. لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە کانزاکان لە لەشدا زۆر گرنگن وە پەیوەندییەکی زۆریان هەیە بە گەلێك نەخۆشی بۆیە وابەدی ئەکرێ کە تەمەنی تێکرایی مرۆڤ بگاتە (٩٠) یان (١٠٠)ساڵ پاش زانینی شتی نوێی تر لە بابەت کانزاکان وە ئەمەش بیروڕای چەند زانایەکە لە سەرەتادا دکتۆر شرۆیدەر.

**پەراوێزەکان**

پەلەکان: دەستو پێ (الاطراف)
ئێسکەنەرمە: (الکساح)
خۆنەویست: (لا ارادی) (Involuntary)
خۆویست: (ارادی) (Voluntary)
زبربوون: دڕبوون (تخشن)
هەوکردنە: (التهاب)
خوگرتن: ف (الصرع epilepsy)
ئاوی قورس: (الماء العسر)
ئاوی شیرین: ئاوی ساف (الماء العذب)
لێدانی مێشك: (جلطة دماغية)

**سەرچاوەکان**


1- Davidson.
2- Sweddish Nutrition Foundation 1971.
3- F A O Nutritional Studies No. 28.
4- H M S O British Food tables.
5- Brenner Sodium and Water Homeostasis 1978.
6- Robinson S.R. Acid Base Regulation 1975.

# لاوکێ عەمێ گۆزێ

محمد امين يوسف

• عەمێ گۆزێ پسمامەك هەبو ب ناڤێ حەسەنێ ئوسمان. عەمێ دلّمایێ بوو سەرا هندێ مالا خۆ بربو دوير ل زۆزانا رۆژەکێ هندەك موغلاجیکەر ل دەستێ بشارێ چەتۆ کو ئەو قایمقام بویە، رەڤینە چۆینە مالا حەسەنێ ئوسمان ل جیەکی دگۆتنێ کۆزێ کورانێ باخمبێ میرا.

هندی بشارێ چەتۆ پێڤەبوو کو حەسەن ئەو موغلاجیا تەسلیمبکەت، بەلێ حەسەنێ ئوسمان دگۆت: «ئەم چ جادا قاچاخو موغلاجیا نادەینە دەستێ دوژمنی، بەلایێ خۆ ژمە ڤەکە، چ فەقیرو ژارا نەدە کوشتنێ، هەکە تو مێری وەرە مەیدانی ئەزو تو بتنێ.

بشارێ چەتۆ گۆ باشە.

هەردووك تایێو چەپەرا خۆ دروست کردییە.

حەسەن دگۆتە بشاری با دۆرا تە بت جارا عەووەلیە بشارێ چەتۆ چاوێ خۆ لسەر دارێ تڤەنگێ شداندییە ب هەموو کەیفا دلێ خۆ نیشان ل حەسەنی گرتییە.

بشارێ چەتۆ گورمژن ل تڤەنگا خۆ هانییە.

ب رانێ حەسەنی کەفتیە، کار لێ کرییە.

ڤێجا حەسەن دگۆتە بشاری خۆ بگرە گەرا من هاتییە.

چار هەنگوست سەرێ خۆ بۆ من دیاربکە بدروستییە.

هندی بشار بوو مێرەکە کالە خۆ ب.فەندوفێل رزگارکرییە.

ل جیاتی سەرێ دیارکەت لسەر چەپەرا کلاوو دەسرۆکێ خۆ لسەر ستارێ دانیە.

حەسەن لگەل تەقێنا تڤەنگێ کلاوو دەسرۆك تێهلدانیە بەلێ بشار ب تیق‌تیقا کەنیێ خۆ دیارکرییە گۆت: حەسەنۆ تە بچویکی نەفامی هێشتا فەن‌وفێلێ مێرا نەزانییە پشتی هنگی حەسەن کاغەزەك ب خوینێ رانێ‌خو دنفیسیە دداتە ژنا خۆ شەمسیخانێ ببات بە هاوارییە بۆ پسمامێ وی عەمێ گۆزێ ل زۆزانا ژۆرییە.

ئەو سەرێ دوازدە سالّا ل عەشیرێ گران دلّمایییە. شەمسیخان سوێدێ زوی لەزکردو لەزاندییە خۆ ب زۆزانا ژۆرێرا گەهاندییە نەچۆیتە ئالیێ ژنا ل ئالیێ مێران ب ژۆرکەفتییە. دێتی عەمێ گۆزێ ل سینگێ دیوەخانێ رودنشیتیە وەختێ چاوێ وی ب شەمسیخانێ دکەتییە. ل‌حیرسا دلێ خۆ گەلەك عاجزو مەلویل بییە.

مویا لەشێ وی هەمی وەکی نشتەری ل جلکێ وی دەربییە. گۆت: «شەمسیخان خێرە تە چ خەبەر بۆ مە ئانییە؟ چ جارا ژنکا مە ل ئالیێ مێران، بژۆر نەکەفتییە بە دەعوایێ مالا بشارێ چەتۆ نەبت ئێدی چونییە.

مە هەمی عالەمو دونیاو خەلکی بێ‌منەتییە. شەمسیخان گۆتێ: پا دەعوایێ ملا بشارییە. دیێ عەمێ گۆزی ل مال گۆە ل گال‌گالێ وان دبییە.

لەزکردو لەزاندییە. خۆی ب ئالیێ مێران گەیاندییە.

گۆ: کورێ من عەمۆ من ل بنەمالێ بابێ تە کەسەك نەدیتییە.

هندی تە عومر بکەت. کەس لسەر جیێو بالنگا نەمردییە.

لدویماهیێ ئەز دهێمە سەر تەرمێ تە ب عەینییە.

هەگە برینێ تە ل سینگا بت تو ل بابێ خۆی ب تەمامییە هەگە ل پشتا بت تو نە لبابێ خۆی ل کورکێن خولامییە.

سپێدەکا زوی لگەل دووازدە پسماما لەزکردو لەزاندیە خۆیان ب کۆزێ کورانێ باخمسێ میرا گەهاندیە .

دبین مەلا یاسینێ لسەر حەسەنێ ئۆسمان وا دخوینیە .

بەردانەگری حەسەنێ سەرێ خۆ بلندکر چاڤ هەلاندیە .

دگۆ : هەوە نەگرن گرین شۆلا ژنکایە حەیفکرنەوە شۆلا مێرایە ، حەیفا منیش جەم بەشارێ چەتۆیە . عەمێ گۆزێ گەل دووازدە پسماما ل کۆزێ کورانێ تابیە لێدایە وەختێ لەشکرێ چەتۆی گۆە ل نەعرەتینی عەمێ گۆزی دبیە دەستێ وان لسەر دارێ تفەنگێ شلدبیە .

بشارێ چەتۆ دگۆ من نەزانم ئەوە جبرائیلە یان میکائیلە نە ئیمامی عەلییە بخودێ هەبی نەبی عەمێ گۆزێیە کورێ پیرێیە ،

بەرانێ مالا سیتۆیە . تۆرینێ مالا شەرۆیە .

ئەوە سەرێ دووازدە سالانە ل عەشرەتێ خۆ دلمایە .

بەختێ وان بەختەکا گەلەکوبارن ل زۆزانێ ژۆریە پشتی هنگی بشارێ چەتۆ گازی عەمێ گۆزێ دکردیە دگۆ : عەمێ وەرە رابێ ! کورێ گۆزێ وەرە رابێ . چەندی تە بڤێت ددەمە تە مالا دنیابێ .

عەمێ دگۆت :

نەخێر چێنابت مشکا مەیدان نەخواردیە .

ئەورۆ رۆژا منو تەیە رۆژێ مێرانیە .

هەردوو لا دەنگیان ل لەشکرێ خۆ دکردیە تابیو چەپەرا ل کۆزێ کورانێ تۆزو دومان دگرتیە .

بشارێ چەتۆ ل لەشکرێ خۆ دکاتە گازیو قێرییە .

ل سپێدەکا زوی هەتاکو رۆژ ل عاسمانا بزربیە ٣٦٦ سێسەدو شێستو شەش مێر ل مالا بشارێ تمامبیە شەش پسمامێ عەمێ کوژرانەو شەشێ دیژی رەڤیە .

عەمێ گۆزێ ب تاڤ تنێ ل مەیدانێ دسەکینیە .

بەلێ بشارێ چەتو باش مێرانیێ عەمێ گۆزێ دزانیە . لەوما چارەکا دیژی ب سێ دەنگان گازی عەمێ دکردیە دبێژتێ : عەمێ وەرە رابێ تە جەیفێ حەسەنێ ئۆسمان کردیە چەندی تە بڤێت مالا دنێ . عەشیرەتیش بنیڤیە .

دیسان عەمێ دگۆت :

«کورۆ بشارۆ قەت چێنایت ئەزێ بتنێ مایمە ل کۆزێ کورانێ شەش پسمامێ من هاتیە کوشتنو شەشێ دیژی ب حێلێ پیا رەڤیە » ئەوا منیش لنگا خۆ ل قەیدو مەربەدا گرێدایە .

کلیلا قەیدێ ل پیا من ئەز بخۆ هاڤێتیە .

بەلێ دوینێ هێوارێ قاچاغا دیارییەك بۆ من ئانیە .

دایکا من گۆزێ تڤەنگەك گەل وان بۆ من ناردیە .

قیمەتا وێ سەد زێری زەری عوسمانلییە .

سێ سوار ل دویر بۆ نك بشارێ چەتو دهاتیە .

ب سێ تەقان هەر سێ سوار ل عەردێ ئێخستیە .

وەختێ چەتۆ ب چاوێ سەرێ خۆ ئەڤکارە دیتیە . گۆ : « عەمۆ لۆ لاوۆ تە سەد جارا حەیفی حەسەنێ ئۆسمان کریە . ئەوان سواران ئێك برابێ منەو ئێك مامێ منە ، یێ دیژی پسمامێ منە هاتبوون ل بەینا منو تە بکەن سولحاتیە .

کورۆ عەمێ گۆزی تە ووجاخی مەکۆر کر ب ئێکجاریە بشارێ چەتۆ گەلەك ب فەندوفێل بوو نقەی ل خۆی بریە. عەمێ گۆزێ وە زانی ببشار نمایە خۆی ل ناو چەپەرێ دیارکریە بشارێ چەتۆ دەربەکێ گران ل عەمێ گۆزێ دایە. بەلێ عەمێ گۆزێ خەنجەر ل کێلانێ دەرئانیە هێرشەکێ ژبۆ سەر بشارێ چەتۆ دبردیە دایە بەر خەنجەرا بەلێ خەنجەر کار نەکردیە چونکی ئەوە سەرێ چەند رۆژانە عەمێ چ خارن نەخواردیە خولامێ بشارێ چەتو عەمێ گۆزێ دکوشتیە.

خەبەرێ کوشتنا عەمێ گۆزێ ب دێ وی گەهشتیە.

لەزکردو لەزاندیە خۆی ب مەیتا وی گەیاندیە.

دبینی برینا وی ل سنگێیە ل ناو چەپەرا نەرەڤیە.

گۆ «کورێ من شیرێ من حلالی تە بت، گەردەنی ئازاکردیە.

هندەك مێژن گۆزێ جلکەکا مێرانی لبەر خۆ دکردیە.

گازکردە بشارێ چەتۆ ئەوا هنگۆ کوشت عەمێ گۆزی نیە.

وەز عەمێ گۆزێ مە، کورێ پیرێ مە، بەرانێ مالا ستیۆمە تۆرینێ مالا شەرۆمە.

وەختێ گۆهێ وان ل وێ دەنگێ دبیە.

دەستێ وان لسەر دارێ تڤەنگێ دلەرزیە.

هەرتێکە ب حێلێ پیا مەیدان بجێهێشتیە.

لەشکرێ بشارێ چەتۆ رەڤیەو شکەستیە.

**من ئەڤ لاوکە ژ سلیمان قاسم خەلکێ گوندێ زمزموکە ل قەزا ئاکرێ وەرگرت.**

○

# قەولێ ئاشێ موحەبەتێ

○

بەدەلێ فەقیر حەجی

٢٠ /١٢/ ١٩٨٧

لالش



من پێخۆشە ل دوو زانینا خۆ بۆ خوندەڤانێ هێژاو بەرکەفتی بئاخڤم سەر ڤی شاعرێ ئێزدیو ڤێ هەلبەستا وی یاکو بەری هەشتسەد سالی بۆ ملەتێ مە ل لالشێ ڤەهوناندی.

هەر وەکی زانایە زمانو تۆرێ مە گەلەك تێرو دەولەمەندە. هنجی ڤەکۆلین دێ بەهاترو جوانتر بینین ژ هەموو کناراڤە. ڤێ جارێ ژکنارێ تۆرێ ئاینیڤە دێ رێ گرینو ڤێ هەلبەستا جوانو شرین ژ هەلبەستێن «پیر رەش»ێ خودێ پەرێس بزمانێ خۆ یێ زکماکی ڤەهوناندیو دێ کەینە دیاریو گەهینین بەر چاڤێن ئاشقێن پەیڤا کوردی.

ئەڤ هەلبەستە گەلەك رێکێن مرۆڤاتیێ یێن جوانو راست ژ ئێن چەپو خوار جودا دکەت بۆ مرۆڤێ دلفرە و خودێناسو جوامێر.

هەر دیسا ئەڤ قەولە دیاردکەت کو مرۆڤێ هەیو دەولەمەند ئەوە ئێ خودان ئیمانو دلراستو خودێناس ئانکو وەکی مەزنا گۆتی «نە عەسل تیتكو تەرێزن، عەسل ئرکانو رێزن ئەڤ قەولە بناڤ و نیشانن «ئاشێ موحبەتێ» ئێکە ژوان قەولێن وی بەلێ هەتا ئیرۆ نەهاتیە بەر چاڤێن خوندەڤانێ گەلێ مە یێ کورد. من نەڤێت دووررودرێژکەم چنکی بکرمانجیەکە رەندو جوانو زەلال یە نڤیسیە. خوندەڤانێ هێژا دلسۆژێ ئاخافتنا راست یە فەرە ئەم بدەین ناسین یێکو ئەڤ هەلبەستەو گەلەکی ددن پاراستی دناڤ رووپەلێن سینگێ خۆداو و یێ نڤیسی.

پشتی بزاڤەکە گەلەك برادەر «عادل حەجی» خەمخۆرو پێ سۆژێ تۆرێ کوردی کری. ئەڤ قەولە نڤیسی بوو ژ دەڤ «فەقیر حەجی کوڕێ فەقیر

شەمۆ، کو مامۆستایەکی زانایەو سنگێ وی شیلانا هەلبەستێن ئۆلا ئێزدیانە.

گەلەك قەولێن دی ژی ئامادەنە بێ گومان دێ ئێنە بەلاڤکرن بۆ خوندەڤانێن هێژاو بەرکەفتی.

ڤێجا قەولێ ئاشێ موحبەتێ ئێکە ژ وان ئیرۆ دێ پێشکێشکەین بۆ ئاشقێن تۆرێ کوردی.

هیڤیا منە لجهێ رەزەمەندیا واندا بت. ئەڤەژی دەقێ ڤی قەولیە.

بدەی هەزار دستێ شیلانێ
هەزار حدوود[1] عەسیل ژ مەیدانێ
هەموێ بکێشیە بەر دەرێ دیوانێ
بۆ مێری فایدە ناکەت غێر سەر ل ئیانێ...
بدەی هەزار میهێ زەری
هەزار حدوود عەسیل ژ بەری
بۆ مێری فایدەناکەت غێر ئیانە ل سەری..

بدەی هەزار میهێت صۆری گەردەن درێژ
هەزار حدوود عەسیل ژ مێژ
هەموێ بکێشیە بەر دەرێ نقێش
مێر بێ سەر ناچتە پێش..
بدەی چەند زێر ل مالا
قوماش سووکە ل دەستێ دەلالا
ژ بوونا حەقو تەعالا..

موحبێ مالێ دنیایێ نە سوونەتە
سوونەتخانە[2] ب رێیا حەقێ دهەرەتە
(ئینشا الله)دێ رۆژەکێ پەدشێ من
سوونەتخانێ ژگونها عافکەتە..
عاشقا بەر ب وێنە
دلێ وان شبهەتی چرێنە
سنگێو سەریا سەر تخوێنە..

ئوون خوانا[3] بینن
سنگێو سەریا لسەر دەینن
ل دیوانا سلتان شیخادی قەبوولەو شك تێ نینن..

دەروێش ی ب سلامەتە
هنجێ ب رێیا حەقێ دهەرەتە
پەدشێ من دێ وی ژگونها عاف کەتە

دبێژمە وە گەلی سونیا
دەستا بەر نەدەن ژ مالێت ئادیا[4]
هیڤیا وان زۆر هیڤی یا..
دەستا ژ تەریقەتێ بەر نەدەن
مەلك شێخ سن پێشیامێ[5] خۆ کەن
عەین ل بەیزا[6] قوبلەت کەن..
قوبلەتا مە عەین ل بێزا
مێر هاتن مەدەهـ ژێ ددا
ئەوە مکانێ پاشایێ من سلتان
- شێخادی بخۆ وێ تێدا

هەی کورۆ ی چار سپیە
تە های ژ مەعنیاخەرقێسلتان

شیخادی نیە
تو چما دبێژی خەرقێ سلتان شیخادی
چەنگەك زەرگووزە[8] و لەپەك هریە...

هەی کۆرۆ ی کۆرە
ما تو نزانی زەرگووز مۆرە
دەرەجا خەرقێ سلتان شیخادی
دەرەجەکە ل ژۆرە
ئەوە لباسێ ئێزیدێ منی صۆرە..

هەکە تو عەردەك بینی عەشارەتکە

هەكە توو مۆمنەك بینی عەبادەتكە
هەكە توو دارەك بینی زیارەتكە..

سەدقا مە خۆش سكانە
رێیا مە خۆش ئەركانە
مەعریفەتا مە خۆش نیشانە..

عاشقی تەریقەتم
رێبەری حەقیقەتم
ئەو دبێژم ئەزی ب دەولەتم..

سەد خۆزیا منە ب وی مێری
پەدشای خووندیە دێری
ئەو هەڤرانەكی ل ئاشی موحبەتی ب هێری..

ئەو بوو ئاشی موحبەتی
بەری وی ژ حەقیقەتی
ئاڤا ویە ژ مەعریفەتی..

ئەوە ئاشی هۆستا جەبار
تێ هەینە خەلكی ئەهل ل قریار
ئەو گەهی نا دەنە مرۆڤی خوار..

مەعنیا وی ئاشی یە مەزنە
قەراشی[9] وی مۆمنە
چی گاڤا بچم گەها منە..
یا سلتان ئێزی توو لبەر مە فەكە دەرێت بواب

مە قوبەە– دیتن هلێل ب مێراف
ئەم دا دەستا بەر دەین ژ شۆلێت خراب..

ئەم دا دەستا ژ شۆلێت خراب بەردەین
ئەم نەهاتینە ئیانا خۆ ل دەر دەین
ئەم هاتینە سەری خۆ ل حەرڤا سلتان ئێزی ل سەر دەین..

ئەم هاتینە سەری خۆ بدەین ل حەرڤی
هەی عەسیلی و عەسیلی صەرفی
بەحرە کوورە بنیان ژ تەرڤی..

تەرەڤی وان بەحرانا
سونەت بتعیاگرت بوو قەحرانا
دا وە ب بەنە جیی مێردارا..

هەکە وە دڤێت ئوون د مێردار بن
ل بۆری گژێری[10] سوار بن

دا ل ئاخرەتی ل مەزن مەیدانا مەلکادا
ئوون ب هەڤال بن..

ژ قەولی پیر رەشی حەیرانە
هنجی ب راستی‌و بەستی دەست – پاڤێتە دامانا یارو برانە
دایم مەرکەبا وی ل بەحرێت گران – یە مەلەڤانە...
ژ قەولی پیر رەشی ب جی‌دا
دبێژمە وە گەلی مریدا
مە دین شەرفەدین ئاتقاد سلتان – ئێزیدا...

پەراوێز
١ – حدوود: مەهینا کحێل
٢ – سوونەتخانە: ئێزیدخانە
٣ – خوانا: جەفنێت (صفرێت) خوارنی
٤ – مالێد ئادیا: ئانکو بنەمالێد شێخ‌و پیرێد –
– ئێزدیا کو ژ کەڤندا ئاکنجیێد ڤی – دەڤەری بوون.
٥ – پێشیام: رێبەری ئۆلی
٦ – عەین ل بەیزا: «کانیا سپی» کانیەکە – – پیرۆزە وا ل لالشی
٧ – خەرقە: کراسەکی پیرۆزە تا نهۆ تایەکی ئێزدیاد دێژنی «فەقیر» هلدگرن نیشان بۆ خەرقی شێخادی.
٨ – زەرگووز: دارەکە پیرۆزە. پەلگ‌و چکێت وی ب‌کار دئینن بۆ رەشکرنا خەرقەی
٩ – قەراش: ئاشەڤان.
١٠ – بۆری گژێری: زمان‌و کارێت قەنج‌و راست

شانۆگەری ی
ژمارە



# سروودێکی خۆشەویستی

نووسینی – جان‌کوکتو.

گەزیزە – لەعەرەبیەوە کردوویە بەکوردی.
– ئەکادیمی هونەرەجوانەکان لە بەغدا –

١

**دیمەن – قوژبنێکی ژووری نووستنی ژنێکە. ژوورەکە تاریکە. رووناکیەکی شینی تاریك بە ناو ژوورەکەدا کشاوە.. لای‌چەپەوە چەرپایەیەکی شێواو هەیە.. لای راستیشەوە دەرگایەکی کراوە دەڕوانێت بەسەر گەرماوێکی زۆر رووناکدا.. وێنەی خێزانێك بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە.. کورسیەکی نزم‌و مێزێکی بچووك لە ژوورەکەدایە. لەسەر مێزەکە چەند کتێبێك، تەلەفۆنێك، چرایەك دانراوە. چراکەش زۆر رووناك دەسووتیّ.**

کاتیّ کە پەردە لادەدرێت، وا دەردەکەوێت کە ژوورەکە تاوانێکی کوشتنی تێدا رووداوە... ئافرەتێك بەکراسێکی درێژی شەوەوە بەرانبەر چەرپایەکە لەسەر زەویەکە وەك کوژراوێك کەوتووە. ژنەکە راست‌دەبێتەوەو تاماوەیەکیش بەوشێوەیە بێ‌جووڵە دەمێنێتەوە. ئەنجا دووایی وادەردەکەویّ کە نیازی کارێکی هەیە، هەڵدەستیّ‌و پاڵتۆکەی سەر جێگاکە هەڵدەگریّ‌و. دوای کورتە تیّ‌رامانێك لای تەلەفۆنەکەوە. رووەو دەرگای دەرەوە دەڕوات. بەڵام پێش‌ئەوەی بگاتە دەرگاکە زەنگی تەلەفۆنەکە لیّ‌دەدات. خێرا پاڵتۆکەی لەدەست دەکەوێتە خواریّ‌و بەنووکی پیّ‌ی لەبەر پیّ‌ی خۆیدا فریّ‌ی دەداتە ئەولاوەو تەلەفۆنەکە هەڵ‌دەگریّ‌و دەست‌دەکات بەقسەکردن.

واجوانە کەشێوەی نواندنەکە هێمنی نیشان‌بدات‌و دووربێت لەهەڵچوونەوە. نووسەریش ئامۆژگاری ئەکتەرەکە وادەکات کە ئەو ژنە واخۆی نیشان بدات کە کەرامەتی ئیهانە نەکراوە، هەتا بشتوانێت خۆی بەخەفەتبار نیشان‌نەدا بەڵکو ئەم شەخسیەتە شەخسیەتی ژنێکی عاشق تینووەو دەیەوێت بەیەك فێلّ کاربکاتەسەر دڵدارەکەی، بەوەی کەدەرگای لیّ‌بووردنی بۆبخاتە سەرپشت تابەخۆیدا بچێتەوەو دان بەدرۆکانیدا بنێت.

بۆئەم مەبەستەش نووسەر داوا لە ئەکتەرەکە دەکات وەك مرۆڤێکی بریندارێ خوێن لەبەررۆیشتوو بێت، یان وەك ئاژەڵێکی سەربڕاو بەلەقەلەق بڕوات. لە کۆتایی شانۆیەکەشدا وابێتە خەیاڵمانەوە کە لەژوورێکی پڕخوێندا مەلەدەکات.

ژنەکە... ئەلو... ئەلو... نەخێرخانم... دەنگەدەنگێکی زۆر لەسەرخەتەکەیە تکات لیّ‌ئەکەم دائخەرەوە!!

ئەلو ئایا تۆش ئێستاقسەدەکەیت؟. بەڵام خانم تکایە تۆدائخەرەوە.

ئەلو... مەت‌مۆزێل... ئەلو... خەتەکە مەبڕە.

**نەخێر خانمەکەم، ئێرە عیادەی دکتۆرشمیدت نیە سفر، هەشت؟...**
**نەخێر سفر، حەوت... ئەلو چەند هیچوپووچە!!**
**(تەلەفۆنەکە دادەخاتەوەو، دوای کەمێك، زەنگی تەلەفۆنەکە لێدەداتەوەو خێرا هەڵیدەگرێتەوە).. ئەلو!**
**بەڵام خانمەکەم... تۆ دەتەوێ من چی بکەم؟**
**دەزانی تۆ زۆر بەدڕەوشتی!**
**چۆن من هەڵە بووم؟!**
**هەرگیز خانمەکەم... هەرگیز... ئەلو... مەتمۆزێل من ئێستا چاوەڕێی تەلەفۆنم، بەڵام چونکە خەتەکە قەڵەباڵغەناتوانم وەڵامبدەمەوە، بەو ئافرەتە بڵێ باجارێ دایخاتەوە.**
**(دیسانەوە تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە، بەڵام تەلەفۆنەکە لێدەداتەوەو هەڵی دەگرێتەوە)**

ئەلو... ئەوەتۆیت!؟ تۆیت؟
بەڵێ... باشگوێم لێت نی یە... زۆردووریت... زۆر... ئەلو... سەیرە.... دەنگەدەنگێکی زۆر لەسەرخەتەکەیە... جارێکی کەبۆم بکەرەوە.... ئەلو.... ئەڵێم جارێکی تر بۆم بکەرەوە.... تکایە خانمەکەم تۆ دایخەرەوە، نەخێر خانمەکەم پێم ووتی من دکتۆرشمیدت نیم... ئەلو (دای دەخاتەوەو بەڵام زەنگ لێدەداتەوە) ئاهەە... ئەمە تۆیت...!!

بەڵێ ئێستا چاك گوێم لێتە!... ئەلو... بەڵێ... ئای کە ناخۆش بوو نەمدەتوانی لەناو ئەو غەڵبەغەڵبەدا گوێم لێت بێ... بەڵێ... بەڵێ... نەخێر... بەختم هەبوو کەلێرەبووم... ماوەی دەدەقیقەیە کەهاتوومەتەوە... ئەی لەوەپێشتر تەلەفۆنت بۆنەکردم؟. ئاە. نەخێر. نەخێر... لەدەرەوە نانی ئێوارەم خوارد... لەگەڵ مارتەی هاوڕێمدا.... بێگومان ئێستاسەعات یانزەوچارەکە... لەماڵەوەیت؟ کەواتە سەیرێکی کاتژمێری سەردیوارەکەت بکە.

منیش هەروابیرم لێدەکردەوە... بەڵێ – بەڵێ خۆشەویستەکەم.... دوێنێ ئێوارە؟ دوێنێ ئێوارە دەستبەجێ لەسەر جێگاکەم ڕاکشام، بەڵام کە خەوم لێنەکەوت، حەبێکم خوارد نەخێر... یەكدانە.... لەسەعات نۆدا... سەرم دایەئێش، بەڵام خۆم ڕاگرت... ئیتر مارت هاتو پێکەوە نانمان خوارد، دوای ئەوە چوومەدەرەوەو هەندێ کاروباری خۆم ڕاپی کردو هەموو نامەکانم خستە جانتازەردەکەوە.... چی؟.... بەڵێ...

من ئازام، سوێندیشت بۆ دەخۆم کە زۆرئازام... پاشان؟... پاشان خۆم گۆڕی و مارتهات و چووینەدەرەوە... هەر ئەوەنە... لای ئەوەوە هاتمەوە.... بەراستی دەرکەوت کە هاوڕێیەکی بەوەفا دیارە، زۆر چاکیشە، نەخێرلەوانەیە جارجار ساردیەکی تێدابێت... بەڵام هەستناسك و دڵبەبەزەییە، بەڵێ تۆچاکت ناسی بوو... تۆ لەهەموو شتێکدا ڕاستیت... کراسەپەمەییەکەم لەبەرکردبوو فەرووەکەشم بەسەریا، لەگەڵ شەبقەرەشەکەدا بەڵێ (پێدەکەنێت ) تائێستاش هەرماومە... نەخێر. نەخێر، تۆ دڵنیایت کەئێستا هاتویتەوە بۆماڵەوە؟ ... مەسەلەی چی؟ ئا، بەڵێ زانیم... نابێت خۆتماندووکەیت... ئەلو... ئەلو... مەتموزێل خەتەکە مەبڕە، ئەلو خوشەویستەکەم.... ئەلو ئەگەر خەتەکەبچڕایەوە بەپەلە بۆمبکەرەوە... بێگومان.

ئەلو... نەخێر... هێشتا هەر لەوێیت؟ جانتاکە؟ نامەکانی تۆش و خۆشم لەناویا هەڵگرتووە، هەرکاتێك ویستت ئەتوانیت داوای بکەیت... بێگومان ئەمە ناخۆش بوو...

ئەوە ئەزانم... ئاە خۆشەویستەکەم.... داوای لێبووردن مەکە... ئاسایی یە، بەڵکو من هیچم (پێدەکەنێت)...

تۆ باشیت... تۆ چاکیت.... خۆشم باوەڕمنەدەکرد بەم ڕادەیە بەهێزبم، بۆسەیرە خۆشەویستەکەم... من واهەڵسوکەوت دەکەم ئەڵێی تووشی نەخۆشی خەوبووم، خۆم ئەگۆڕم و ئەڕۆمە دەرەوە. پاشان بەبێهۆشی دەگەڕێمەوە ماڵەوە... لەوانەیە سبەینێ ئازایەتیەکەشم نەمێنێ... تۆ؟ نەخێر. نەءخۆشەویستەکەم.... هیچ گلەیشت لێناکەم...

چۆن...؟ زۆرئاسایی یە.... بەپێچەوانەوە ئێمە وارێككەوتین کەلەگەڵ یەکتردا ڕاستبین... تاوانیش بوو کە وابەکتوپڕی لێم جیابیتەوە. ئەمە شتێکی سەختبوو، بەڵام ئیتر ئێستا ئەتوانم خۆم لەسەر ئەمجیابوونەوەیە ڕابهێنم... کام شانۆیی یە؟
ئەلو... کێ؟ وادەزانیت تەمسیلی شانۆیی یەك دەکەم؟
من؟ نەخێر. نەخێر. تۆچاك دەمناسیت، ئەوەی لەدڵمایە هەر ئەوەت پێ دەڵێم... هەرگیز... هەرگیز... بەڵکو من زۆر هێمنم.... دەشزانیت کەوام... دەڵێم دەبوایە هەر یەكسەر بتزانیایە... مەبەستم ئەوەیە کە دەنگم لەدەنگی ئافرەتێك ناچێت کە نهێنی بشارێتەوە... نەخێر... من بڕیارم داوە کە ئازابم و ئازایش دەبم... ببوورە، ئاخر لەوەش ناچێت.

لەوانەیە.... بەڵام ئینسان هەرچەند کە چاوەڕیی ڕوودانی کارەساتێك بێت، بەڵام کە ڕووشیدا دەیکوتێ بەزەویدا.... زۆری پیوەمەنیێ... ئەوەندە کاتی ئەوەم دەبیێ کە خۆم لەسەر ئەم لیقەومانە ڕابهێنم تۆش خۆت، ئەمەت هەر بۆدانابووم.

زۆرشت هەبوو کە ڕێگای خۆشەویستی لیدەگرتین، بەڵام من لەپێناوی ئەو پێنج‌ساڵ بەختیاریەدا بەرگەی ئەو هەموو شتانەم گرت.... هەرگیز بیرم لەوەنەدەکردەوە کە ژیان لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێت، من ئێستاش نرخی ئەو بەختیاریە دەدەم کە هەرگیز نابژێرڕێت، ئەلو! ! کە هەرگیز نابژێرڕێت... پەشیماننیم... پەشیمانی هیچیش نیم... هیچ شتیێ...

هیچ شتیێ.

تۆ... تۆ هەڵەیت.... من... ئەلو... ئەوەی شایانی بووم دەستم‌کەوت.

من ئەموویست بەختەوەریەکی مەحاڵم دەستکەوێت

... خۆشەویستەکەم... گوێم لیڕابگرە... ئەلو.... خۆشەویستەکەم

.... ڕێگەم‌بدە... ئەلو... ڕێگەم‌بدە قسەبکەم... خۆت تاوانبارمەکە.

ئەمە هەمووی تاوانی من‌بوو... بەڵکو بەڵیێ، بەڵیێ... ڕۆژی یەكشەممەت لەبیرە کە بۆسەردانیێ کۆشکی فرسای دامان نابوو، برووسکەکەت ناردوو داوای لیبووردنت کرد لەبەر نەهاتنت.. ئاە... چی؟... من بووم کە دەمویست بچین، من بووم کەدەم گرتیت‌و نەم‌هێشت قسەبکەیت... من بووم کەپێم‌ووتیت ئیتر هیچ شتێکم بەلاوە گرنگ نی‌یە... نەخێر. نەخێر.

تۆ لەمەدا ڕاست نەبوویت. من بووم کە لەپێشدا تەلەفۆنم بۆ کردیت.

نەخێر... ڕۆژی سیشەممە... سیشەممە... من دڵنیام لەوە، سیشەممە بیست‌وحەوت. بروسکەکەت ئێوارەی دووشەممە بیست‌وشەش گەیشت... چاك بیربکەرەوە، من ئەو مێژووانەم چاكلەبەرە... دایکت؟... بۆچی؟... باوەڕناکەم ئەوە هیچ سوودێکی هەبێت... نازانم... بەڵیێ... لەوانەیە. ئاە، نەخێر بێگومان ئێستا نەء، ئەی تۆ؟...

سبەینیێ... ؟ سبەینیێ ژن دەهێنی؟ باوەڕم نەدەکرد کارەکە هەر وابەم پەلەیە کۆتایی بێت... دەکەواتە چاوەڕیبکە... ئەوە زۆرئاسانە... سبەینیێ بەیانی جانتای نامەکانت ئەگاتە لای دەرگاوانەکە... باجۆزیفی خزمەت‌کارت وەریان‌بگرێت. یان من... لەوانەیە چەند ڕۆژێك لەلای مارت‌ی هاوڕێم بمێنمەوە، کی؟ سەگەکەت، لولو...؟ ئەوەتا لێرەیە ئەلیی نەخۆشە ئەناڵێنیێ... بەدرێژایی ڕۆژگاری دوێنیێ دەهات‌ودەچوو تیدەڕوانیم، جاروبارەش گوێچکەکانی هەڵدەخست تابەچاکی گویڕابگرێ، لەهەموو سوچێکی ماڵەکەدا بۆت‌دەگەڕا... لەوەدەچوو گلەیم لیبکات کەبۆچی لەگەڵیدا بۆت ناگەڕێم... چاکتر وایە بیبەیتەوە لای‌خۆت... لەوەباشترە ئاوا ئەم حەیوانە بە دڵشکستیەوە بژی.. من پێویستم پیی‌نی‌یە.

نەخێر. نەخێر... ئەوەندە گویی نادەمیێ، ئەوەندەش نای‌بەم بۆگەڕان... چاکترە لەلای خۆت بمێنێتەوە... زوو منی بیردەچێتەوە... بابزانین... بابزانین... دەی ئەمە گرنگ نی‌یە... ئەتوانی بڵێیت ئەمە سەگی هاوڕییەکمە

... جۆزێفی خزمەت‌کارتی زۆر خۆش‌دەویێ، باجۆزێف بێت بیباتەوە... قایشە سوورەکەش دەکەمەوە ملی... بابزانین، بەڵیێ. بەڵی‌خۆشەویستەکەم... ڕێکەوتین... بێگومان خۆشەویستەکەم... کام دەست‌کێشانە؟ ئەوانەی ناوەکەی فەرووە؟

... کە لەکاتی لیخوڕینی ئوتومبێلەکەدا بەکارت‌دەهێنا؟ نازانم... هیچم نەدیوە... لەوانەیە... بۆی دەگەڕێم... یەكدەقیقە چاوەڕیبکە، ووریابە خەتەکە نەبڕن.

(دەست‌کێشە ناوفەرووەکان کە لەپشت چراکەوە دانراون، هەڵیان دەگرێت‌و بە دڵداریەکی گەرمەوە ماچیان دەکاو، تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێتەوەو دەست‌دەکاتەوە بەقسەکردن‌و دەست‌کێشەکانیش دەهێنیێ بە ڕوومەتی‌دا)

ئەلو.. ئەلو... نەخێر، هەموو شوێنێکی بوگەڕام، ناو دۆڵابەکە، سەرکورسی‌یەکە... نەم‌دۆزیەوە... گویبگرە، جارێکی تر بۆی دەگەڕێم، بەڵام دڵنیابە، ئەگەر بەرێکەوت دۆزیمەوە لەگەڵ نامەکاندا ئەویشت بۆدەخەمە جانتاکەوە.. خۆشەویستەکەم؟... نامەکان، بەڵیێ... بۆت هەیە کە بیان‌دڕێنی، داوایەکم هەیە لەوانەشە زۆر هیچ‌بێت بەلاتەوە..

نەخێر... ئەمویست پێت‌بڵێم... ئەگەر نامەکانت سووتاند حەزئەکەم خۆڵەمێشەکەی لەو قوتوە جگەرەیەدا هەڵبگریت کەپێشکەشم کردی. کە... ئەلو... نەخێر، من هیچم... بمبەخشە... من زۆر ئازابووم (ئەگری) گویمەدەریێ... تازە تەواو من پەرێشانم، من دڵشاد دەبم ئەگەر ئەو خۆڵەشم دەست‌کەویێ ئیتر ئەمە هەموو شتەکەیە... چەن دڵت باشە!... ئاە بەڵام بەنیسبەت کاغەزەکانی خوشکەکەتەوە، هەموویم لە ئاگردانەکەدا سووتاند. لەپێشدا بیرم لەوەدەکردەوە کە بیان‌کەمەوەو ئەو وێنەیە دەربێنم کە بۆت باس‌کردم... بەڵام لەبەر ئەوەی کە داوات لیکردم بیسووتێنم، هەموویم سووتاند... ئاە... باشە... بەڵیێ... بەڕاست ڕۆبەدی‌شامبیرەکەت لەبەردایە؟ لەسەر جێگاکەت ڕاکشاوی؟ هەق نی‌یە تۆ ئاوا ئەم درەنگانە خۆت بەئیشەوە ماندووکەیت. جالەبەرئەوەی بەیانی زوو هەڵدەستی، چاك وایە ئێستا بنوویت... ئەلو... ئەلو چی دەنگم بەرزکەمەوە؟ بەڵام دەنگم زۆربەرزە... ئەی ئێستا گوێت‌لیە؟... سەیرە من زۆرچاك گوێم لەتۆیە هەروەك لەم ژوورەدا لەگەڵمابیت... ئەلو... ئەلو... ئەلو سەیرە

.... دەمنیش ئێستا بەچاکی گوێم لەتۆنیە، بەڵی گوێم‌لێتە، بەڵام دەنگت زۆر دوور دیارە... تۆ گوێت لێمە؟ کەواتە کەسمان بەتەواوی گوێمان لەیەکتر نی‌یە... نەء. دایمەخەرەوە... ئەلو خانمەکەم من قسەئەکەم.

ئاهە، ئێستا گوێم‌لێتە... چاك گوێم‌لێتە... بەڵیێ زۆر سامناك بوو لەوەدەچوو کەتۆ کت‌وپڕ مردبی... مرۆڤیێ گویی لە خەڵك بێ‌و بەڵام نەش‌توانیێ دەنگی خۆی

خەجەی بەوانی تر، نەخێر ئێستا چاکم گوێ لێتە.... سەیرە کە دەهێڵن ئەم هەموو ماوە درێژەش قسەبکەین، عادەتا دوای سێ دەقیقە خەتەکە دەبڕن... بەڵێ... ئێستا چاکتر گوێم لێتە...

... دەنگەدەنگەدا لەوە دەچێ کە تەلەفۆنەکەی خۆت نەبێ..
... ئەتبینم... ئایا دەزانی؟... دەتەوێ هەڵی بێنم ئێستا چیت لەبەردایە؟... کام ... سیجە؟... ملپێچە سوورەکە... ئا... دەتبینم... قۆڵەکانت هەڵکردووە، بەدەستی چەپت تەلەفۆنەکەت هەڵگرتووەو... دەستی ڕاستیش پاندانەکەت پێیەو لەسەر ... عەزیکی بەردەستت خەریکی وێنەکێشانی چەن روخسارێك و چەند دڵێك و چەند ... ستێرەیەکی، پێ دەکەنی؟ من ئێستا لەجیاتی گوێ هەرچاوم چاو (ڕووی خۆی دادەپۆشێ)ئاه. نا خۆشەویستەکەم سەیرم مەکە، ئەترسم؟ نەخێر. من ناترسم بەڵام مەسەلەکە لەوە خراپترە... من ڕانەهاتووم بەتەنیا بنووم...
... بەڵێ... بەڵێ... بەڵێ... ئەم بەڵێنەت دەدەمێ من... من
... بەڵێنت دەدەمێ... بەڵێن... تۆ باشیت... نازانم. نامەوێت بڕوانمە روخساری خۆم... تەنانەت پرکێشی داگیرساندنی چرای خۆڕازاندنەوەکەشم نیە... دوێنێ کە لە ... تۆوێنەکەدا سەیری خۆم کرد، روخسارم وەك روخساری پیرێژنێك هاتەبەرچاو...
... نەخێر... نەء... پیرێکی لاوازی سەرسپی، دەموچاو چرچ... تۆ زۆرباشیت ... بەڵام خۆشەویستەکەم روخساری جوان هەموو شتێك نی یە.... ئەوساش من دڵم ... بەوەخۆش بوو کە پێت دەووتم (سەیری ئەم دەمووچاو ناشیرینە بچکۆلەیە بکەن)...
... بەڵێ گەورەی بەڕێزم... من بەوە دڵخۆش دەبووم... تۆ گەمژەیت... بەختیشم یاربوو کە تۆ بەو ئەحمەقیەوە خوشتدەویستم! ئەگەر تۆ خۆشتنەوویستمایەو... وە زۆر زیرەك بوویتایە تەلەفۆنەکەی دەستت دەکرد بە چەکێکی سامناکی کوشندە کە بەبێ دەنگی کاری خۆی بکردایە...

من شەڕانیم؟... ئەلو... ئەلو... ئەلو خۆشەویستەکەم (ماوەیەك چاوەڕێ دەکات) ئەلو... ئوتێل سفر چوار حەوت؟... ئاه... بەڵێ... جۆزیف تۆیت؟.. من خانمم... خەتەکەی نێوان من و مسیۆ بچڕا... بۆچی لەماڵ نی یە؟... ئاه... بەڵێ... بەڵێ... ئەمشەو نایەتەوە؟ بەڕاست من چەن گەمژە بووم!! خۆ ئێستا لەچێشخانەیەکەوە تەلەفۆنی بۆ ئەکردم. خەتەکە بچڕا، کەچی ئێستا تەلەفۆنم بۆماڵەوەی کردەوە... بمبوورە، جۆزێف سوپاس...
سوپاس... بۆنسوارجۆزێف...
(تەلەفۆنەکە دائەخاتەوە لەوەدەچێت نەخۆش بکەوێت، زەنگی تەلەفۆن ... دەداتەوە)ئەلو... ئاه خۆشەویستەکەم؟ ئەوە تۆیت؟ خەتەکە بچڕا، نەخێر نەخێر!... چاوەڕێم دەکرد، دەنگی تەلەفۆنەکە لێی داو هەڵمگرتەوە بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە... بێگومان بەڵێ دڵنیام...
چی یە خەوت دێ؟... تۆ زۆر باشیت... چونکە تەلەفۆنت بۆکردم... ئەوپەڕی باشی (دەگری) (ماوەیەك بێ دەنگی) نەخێر...

لێرەم... ئەوپەڕی باشی (دەگری) (ماوەیەك بێ دەنگ) نەخێر...
لێرەم... چی؟ بمبوورە... شتێکی بێ مانایە... هیچ نی یە...
هیچی تیابەستە نی یە... سوێندت بۆدەخۆم کە هیچ نی یە... هەرهیچ نی یە... تۆ هەڵەیت... من هەروەك خۆم... بەڵام ئەوە بزانە مرۆڤ بێ بیرکردنەوەش قسەدەکات... کاتێکیش دێ کە بێ دەنگ دەبێت و تەلەفۆنەکە دائەخاتەوە ئەنجا لەتاریکیدابە ناو بۆشاییدا هەنگاوبنێت (دەگری)... گوێم لێ ڕاگرە ئەی ئەوینم... من هەرگیز درۆم لەگەڵ نەکردویت... بەڵێ ئەزانم... ئەزانم... باوەڕت پێ دەکەم... باوەڕم بەوەش هەیە کەدەیڵێیت...

نەخێر، ئاخر وانی یە کە تۆ بۆی دەچیت... چونکە من ئێستا درۆم لەگەڵ کردیت... لێرەوە... لەم تەلەفۆنەوە... چارەکە سەعاتێکە من درۆ ئەکەم... دڵنیاشم کە هیچ هیوایەکم نەماوە... بەڵام درۆ نابێتە هۆی بەختەوەری... جگە لەوەش من حەزناکەم درۆت لەگەڵ بکەم... ناتوانم... بەڵکو نامەوێت درۆت لەگەڵ بکەم... هەتا ئەگەر لە بەرژەوەندی تۆش بێت... ئاه! هیچ مەترسی یەك نی یە... مەترسە خۆشەویستەکەم... بەڵام من درۆم لەگەڵ دەکردی کەپێم وتی خۆم گوڕی و لەگەڵ مارتی هاوڕێمدا چووینە دەرەوە... لەڕاستیدا نە تامی خواردنم کردووەو نە جلی پەمەییشم لەبەرکردووە.. بەڵکو پاڵتۆکەم داوە بەشانمدا، چونکە چاوەڕێی تەلەفۆنەکەی تۆ بووم و چاووم لێ نەدەترووکاند... هەڵدەستام و دادەنیشتم و دەهاتم و دەچوومە دەرەوە ئۆتۆمبێلێك بگرم تابگەمە بەرماڵەکەت و لەبەر پەنجەرەکەتدا چاوەڕێت بکەم... نازانم... چاوەڕوانی نازانم هی چی... تۆ هەقتە... بەڵێ.... گوێم لێ ڕاگرتووی...

ئاقڵ دەبم... گوێم لێتە... سوێندت بۆ دەخۆم کەوەڵامی هەموو پرسیارەکانت بدەمەوە... بەڵێ... هیچم نەخواردووە... نەم توانی زۆر نەخۆش بووم... دوێنێ ئێوارە ویستم حەبێك بخۆم تاخەوم لێ بکەوێت، ووتم گەر دوو دانە بخۆم زۆرتر دەنووم... خۆئەگە، ئاکەتە حەبەکە هەمووی بخۆم، ئەوا نووستنێکی ئەبەدی بێ خەون دەنووم. بەڵێ هەڵ... وە... (دەگری)نووستنی مەرگ! دوانزە حەبم لەنەختێ ئاوی گەرمدا تواندەوەو خواردم... دوای ئەوە کەوتم... خەونێکم دی... خەونێکم بەم واقعە نالەبارەی ئێستامانەوە... پاشان لەپڕێکا خەبەرم بوەوە.... بەڵام هەر بەو هیوایە بووم کە ئەوەی دیبومە تەنیا هەر خەون بووە... بەڵام گورج بیرم کەوتەوە کە هەمووی واقیع وراستی یە ومنیش لەم جیهانەدا تاك و تەنیاو بێ کەسم، ئیتر لەمڕۆ بەدواوە من سەرناکەمە سەر سنگت... ئیتر لەوکاتەوە هەستم کرد کە تواناى ژیانم نەماوە ... لاواز لاوازو ساردو سڕ... دڵیشم وەك جاران لێ نادا
.... تەنانەت مەرگیش یاریدەم نادات، ناچاریش بووم کە تەلەفۆن بۆ مارت بکەم، چونکە ئەوەندەش خۆم بە ئازا نەدەزانی کە بەتەنیا بمرم... خۆشەویستەکەم... خۆشەویستەکەم نزیکەی سەعات چواربوو کە مارت هات و پزیشکێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە لەماڵەکەیا لەگەڵیا دەژی، کە سەیری کردم گەرمای لەشم گەیشتبووە

٤٠پله زیاتر. دیاره کارێکی گرانه کەمروڤ خۆی زەهرخوارد بکاتو هەتا لەوەشدا هەڵدەکات کە چەندی پێویستە... پزیشك ڕاچێتەیەکی بۆ نووسیمو مارتیش تا ئەم ئێوارەیە لەلام مایەوە، ئیتر تکاملیکرد کە بڕواتەوە، چونکە لەسەر بەڵێنەکەی خۆت چاوەڕیێی دوا تەلەفۆنتم دەکرد، لەوەش دەترسام کە مارت ڕێگام نەدا قسەت لەگەڵ بکەم.... زۆرچاکە... هەرگیز... نەء نەء. بەڕاستیمە، کەمێك تام هەیە
... لەسەرو ٣٨پلەوە... حاڵەتێکی توورەبوون بووو بەسەر چوو
... بێزارمەبە... بەڵام چەند گەمژەبووم!! هەوڵمدا کەنەیە هۆی دڵتەنگیت تاهەر بەدڵنیایەوە بمێنیتەوەو پێشت بڵێم تابەیەك گەیشتنەوەیەکی تر، وەك بڵێیت سبەینێ یەکتردەبینینەوە
... چەند بێعەقڵ بووم!!... بەڵام دەترسم یەکێکمان خەتەکە ببڕێتو ئیتر بەیەکجاری لەیەك دابڕێینو منیش بەتەنیا بکەومە ناو تاریکستانەوە. (دەگری).
ئەلو... وامزانی خەتەکەت داخستەوە... خۆشەویستەکەم چەندە باشی. . ئەو خۆشەویستەبەسەزمانەی کەمن دڵی دەشکێنم
... قسەبکە... قسەبکە... چیت دەوێ بیڵێ.

بەڵێ ئەوەندە ئازارم هەبوو ئەوەندە ئازارم هەبوو لەسەر زەویەکە دەتلامەوە... بەڵام هەر کەگوێم لەدەنگی تۆبوو هەموو شتێ گۆڕاو هەستم بە پشوویەکی تەواو کرد... لە بەختیاریدا چاوەکانم نایەسەر یەك... زۆرجار کەلەگەڵت دەنووستمو سەرم دەکردە سەرسنگتو خۆم بەلەشە گەرمەکەتەوە دەنووساندو تۆش قسەت بۆدەکردم، منیش چۆن ئەوسا گوێملێڕادەگرتی ئێستاش هەر بەهەمان شێوە... تۆ ترسنۆکیت؟ نەخێر خۆشەویستەکەم بەڵکو من ترسنۆکم
... بەڵێنم بەخۆمدا... چی؟... تۆ؟!... جگەلەتۆ هیچکەسێکی تر بەختەوەرم ناکات؟؟...
بەڵام خۆشەویستەکەم دووبارە ئەیڵێمەوە، ئەمە ڕاستنییە..
من لەپێشدا دەمزانی کەرۆژێك دێ لەیەکتر دادەبڕێین...
بەپێچەوانەی ئەو ئافرەتانەوە کە وادەزانن درێژای هەموو تەمەنیان لەگەڵ خۆشەویستەکانیاندا دەبەنەسەرو، کەچی بەبێ بیرکردنەوەش کتوپڕ لێك دادەبڕێن... من هەر دەمزانی... هەتا ڕۆژێکیان وێنەی ژنە نوێیەکەتم لەدوکانی بەرگدروویەك بینی...
لەگۆڤاری سەرمێزەکەدا بوو کە کرابووەوە. نەشمدایە رووت...
چیت دەوێ؟... ئەمەش سۆزێکی مرۆڤانەیە.یان ڕاستر سۆزێکی ئافرەتانەیە...
چونکە من نەم دەویست کە ڕۆژانی کۆتاییمان تاڵ بکەم...
دێتو دەچیو دەست بەنکەنك دەکات)
بمبەخشە... دەزانم کەبەرگەی ئەم سکاڵایەش ناگریت....
تۆش زۆر لەگەڵمابە ئارامبوویت... بەڵام هەوڵ بدە لێمتێبگەیت
... من ئەناڵێنم... ئەناڵێنم... ئێستا تەنیا هەر ئەم تەلەفۆنە ماوە کە بەیەکمان دەگەیەنێ... پیری؟... خەوتم، خەوتمو تەلەفۆنەکەش لەباوەشمابوو. نەخێر. نەخێر. لەسەر جێگاکەم. دەزانم من زۆرهیچم

... بەڵام چیبکەم؟... تەنها هەر ئەم تەلەفۆنە بەتۆوەم دەبەستێ.
... منیش هەر بەو بەڵێنەی تۆوە دەژیام کەبە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ دەکەی.
لەبەرئەوە باوەڕبکە چەندان خەونیشم بینی... خەونێکم بینی کە ئەم تەلەفۆنەی ئێستا جەزرەیەیەکی کوشندە دەبێتو دەمدا بەزەویداو دەمکوژێ.
خەونەکانی تریش ئەوەندە بەئازاربوون بۆگێڕانەوە دەستنادەن، بەڵام ئەمە هەر بەدەم، کەچی لەخەونەدا ڕاستبوون.
چونکە قسەم لەگەڵ دەکەی... ئەوەتا پێنج ساڵە بەتۆوە دەژیم
... تۆ ئەو هەوایەی کەسییەکانم هەڵیدەمژن، پێنج ساڵی تەمەنم بە چاوەڕیکردنی تۆوە بردەسەر... تۆش واتدەزانی ئەگەر دوابکەوتیتایە من دەمردم... پێنج ساڵە هەمووجارێ من دەمرم کەبیرلەوە دەکەمەوە تۆوادەزانی من بەدواکەوتنت دەمرم، وەدەژیمەوە کەخۆت دەکەی بەماڵدا... کاتێکیش کە بەتەنیشتمەوە دەتبینم لەترسی ئەوەی بەجێمبیەڵیت هەردەمرم... من ئێستا زیندووم چونکە تۆ لەگەڵمدا دەدوێیت... خۆ ئەگەر ئەم دواندنەش بچڕا ئەوە ئەو دەزووەش دەبچڕێ کەبەژیانەوە بەستوومی...

نەخێر، ئەوەی دەیڵێم وڕێنەنییە... بەڵکو هەمووشتێ بەڕوونی دەبینم... من دەمزانی کە هەڵوێستەکانمان بێچارەن، لەبەرئەوە هەر دەبوایە ئازابوومایە، تا درۆت لەگەڵبکەم... هەتا ئەگەر بشمتوانیایە بنووم... خەونم دەدیوئەنجا خەبەرم دەبووەوەو ئەنجا نانمدەخواردو، ئەنجا هەڵدەسامو، ئەنجا خۆم دەشووشت، لەدوایدا دەچوومەدەرەوە... تا بۆکوێ بچم؟... بەڵام خۆشەویستەکەم من لەتۆ بەولاوە بەهیچی ترەوە خەریك نەبووم، بمبوورە... چۆن هەروەك ماسی لەدەرەوەی ئاو ناژی منیش بەبێبیرکردنەوە لەتۆ نەدەژیام...

دیسان پێت دەڵێمەوە پێویستم بەهیچ کەسێ نییە... ئامۆژگاریم دەکەی کە دڵخۆشیخۆم بدەمەوەو ڕابوێرم؟ دەمنیش ئێستا وابە ڕاستیدانی پێدادەنێم، لە شەوی یەك شەممەوە تەنیا یەکجار نەبێ ئیتر بیرم لەم دارانەی خۆمان نەکردۆتەوە... ئەوڕۆژەی کە پزیشك دانەکەی بۆکێشام... من تەنیام... تەنیام خۆشەویستەکەم، بەڵام نازانم لەوانەیە من بێعەقڵی زۆرمکردبێت... باوەڕنەکەی بێئەوەی ئاگام لەخۆمبێ هەموو وێنەکانتم بەجارێك دڕاند.... ئەمەشتێکی ئاسان نییە.... تەنانەت بەلای پیاوانیشەوە... وێنەی پسوولەی لێخووڕینیش....؟ چی؟ نەخێر. چونکە ئیتر پێویستم پێینەبوو... ئەمەش زیانێکی گەورە نییە، چونکە وێنەکەی منکە تێیدابوو زۆرناشرین بوو.... هەرگیز.... بەختیشم هەبوو کە لەکاتی سەفەرەکەشمدا بەرێکەوت تووشت بووم.... بەڵام ئێستاش ئەگەر سەفەربکەمەوە بێبەختیمە دیسان ڕێکەوتت بکەمەوە... زۆرم لێمەکە... وازلەوەبێنە... ئەلو... ئەلو... خانمەکەم لاچۆ... کێ لەسەر خەتە؟.... ئێمە هێشتا هەر قسەدەکەین، ئەلو.... نەخێر خانمەکەم... خۆ ئێمە بە قسەوە کات بەسەرنابەین، تۆ دائخەرەوە... ئەگەر دەزانی ئێمەهیچین ئەی بۆ دایناخەیتەوەو کاتیخۆت بەفیڕۆ ئەدەی... ئای

خۆشەویستەکەم... خۆشەویستەکەم تووڕەمەبە بەفیڕۆ ئەدەی... ئای خۆشەویستەکەم.... خۆشەویستەکەم تووڕەمەبە.... لەکۆتاییدا... نەخێرنەخێر ئەم جۆرەیان من قسەدەکەم.

وا ئەو خانمە جنێوی خۆیداو دای‌خستەوە، ئەلو!!! ئەڵێی وورببوویت، با، ووڕبوویت... هەر بە دەنگتا دیارە... من بەدەنگتا ئەزانم... من.... بەڵام خۆشەویستەکەم بێت‌ونەبێ ئەو ژنە لە بێ‌ئابڕووەکانەو تۆ ناناسێت، وادەزانێ تۆش وەك هەموو پیاوێکی‌تر وایت... نەء. نەء خۆشەویستەکەم هەمووی وەك‌یەك‌نی‌یە... جی سەرزەنشتی ویژدانت‌دەکا؟... ئەلو.... دەی وازبێنە، بیر لەوشتە بێ‌نرخانە مەکەرەوە... تازە بەسەرچوو... ئای کە ساویلکەیت!! کێ؟... هەرکەسێك بێت... چی تیابەستەیە... دوێنێ ئەوکەسەم بینی کەیەکەم پێی ناوەکەی‌سینە... مەشەقامی هنری‌مارتان، پرسیاری لی‌کردم کە ئایا تۆ برات هەیە بەم زووانە نیازی ژن‌هێنانی هەبێ، جۆرە خەمێکیش بەرووخساریەوە دیاربوو... دڵنیاش بە کە زۆر لەگەڵیا رانەوەستام، بەبەڵگەی ئەوەی کەگوایە لەماڵەوە چاوەروانم دەکەن.... هەوڵمەدە بزانی ئەو کەسەکێ‌یە... خەڵکی رق‌لەوکەسانە هەڵدەگرن‌کە پەیوەندیان لەگەڵ دادەبڕن، من لەپێناوی تۆدا هەمووکەسم لەخۆم‌کرد، توانای ئەوەم نەبوو کەیەك دەقیقە بەزایە بەم، نەخێر... هەرگیز ئەوەم بەلاوە گرنگ‌نی‌یە... باراست‌بین... هەڵوێستمان بۆخەڵکی روون‌نی‌یە... خەڵکی تەنیا یەك شت تێ‌دەگەن... یان یەکترمان خۆش‌دەوێ، یان رقمان لەیەکترە... پەیوەندی‌بچڕاندن واتە تەمانی‌خۆشەویستی... خەڵکی رووکەشیان هەیە، ناتوانیت تێیان‌بگەیت... تۆ هەرگیز تێیان‌ناگەیت... جالەم حاڵەتەدا چاکترین شت ئەوەیە کەوەك من بکەیت‌و گاڵتە بەقسەکانیان بکەیت.... (هاواری ئازارێك دەکات) ئۆی!!.... هیچ نی‌یە... هەر وەك جاران قسەم‌دەکرد کەچی لەپڕێکا... چەند شتێکی راستم بیرکەوتەوە... (فرمێسك)...

لێکدانەوە سوودی چی‌یە؟.... بەڵێ.... بەڵێ... نەخێر!! ئەوە بەسەرچوو کەیەکترمان دەبینی، مستەحیلە کەپەیمانەکانمان لەبیرخۆمان بەرینەوە، ئەوکەسانەش کەخۆشمان دەوێن‌بە دەست‌لەمل‌کردن ئەمەیان بۆدەردەخەین... یەك‌سەیرکردن دەتوانێ هەموو شتێ بگۆڕێ، بەڵام ئێستا لەرێگەی ئەم تەلەفۆنەوە هیچ هەوڵدانێك سوودی‌نی‌یە... ئیتر ئەوەی لەنێوانمان‌دابوو بەتەواوی کۆتایی‌هات... دڵنیابە... مرۆڤ ناتوانێت دووجار خۆی‌بکوژێت، لەوانەیە هەوڵبدەم خۆم‌بکوژم بۆئەوەی خەوم لێ‌بکەوێت.... نازانم لەکوێ‌و چۆن دەمانچە دەکرێت؟... تۆلەو باوەڕەدای کە من دەمانچە بکڕم؟.... ئەی ئیتر دڵدارە بەسزمانەکەم چۆن بتوانم درۆودەلەسە هەڵبەستم...؟ ئیتر توانام نەماوە... دەبوایە ئەو توانایەم هەبوایە.... هێندێ جار درۆ کەڵکی‌هەیە.... تۆش ئەگەر درۆت لەگەڵ بکردمایە، ئازاری جیابوونەوەکەت سووکتردەبوو...

مەبەستم ئەوەنی‌یە کە تۆدرۆم لەگەڵ‌دەکەیت... بەڵام ئەڵێم... ئەگەر درۆت بکردایە، ئەوەش دەزانم..

نا، ناخۆشەویستەکەم... گوێم لێ‌راگرە... من باوەڕت‌پێ‌دەکەم.... مەبەستم ئەوەنی‌یە کەباوەڕت پێ‌ناکەم؟!... بۆچی تووڕە دەبیت؟!... بەڵام تۆ تووڕەیت... ئەوەتا شێوەی قسەکردنەکەت گۆڕاو بووبە تووڕەیی... زۆر بەساویلکەیی دەم‌ووت، گەر بەدڵپاکی خۆشتەوە هەڵت‌بخەڵەتاندمایە، هێشتا هەر خۆشم‌دەویستی... ئەلو (تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە)

خوایەگیان جارێکی‌تر بۆم‌بکاتەوە... دەی خوایەگیان... خوایە بۆم‌بکاتەوە!... (زەنگی تەلەفۆن لێ‌دەدات خێرا هەڵی دەگرێت) بەڵێ خۆشەویستەکەم... خەتەکەیان بڕی... دەم‌ووت هەتا ئەگەر درۆشت لەگەڵ بکردمایە، هێشتا هەر زیاترم خۆش‌دەویستی،... بەهەموو دڵنیاییەکەوە... تۆ شێتی.... ئەی‌ناکە ئەوینەکەم.... (وایەری تەلەفۆنەکە دەئاڵێنێ لەملی‌یەوە).

دەزانم هەردەبێ جیابینەوە، بەڵام شتێکی‌زۆر نابەجێ‌یە... ئەو ئازایەتی‌یە لەخۆمدا بەدی ناکەم، بەڵێ لەو باوەڕەدابووم کە ئێمە یەك‌گیان‌و یەك‌لەش بووین... کەچی لەپڕ لەیەکیان دابڕین‌و پردو دیواریان خستەنێوانمانەوە... من تۆم بیربچێتەوە؟... ئای خۆشەویستەکەم!! چۆن ئەم‌بیرکردنەوە ساردوسڕانە یەیاندا تێ‌دەپەڕی؟... من چاك دەزانم کەئازاری بیرچوونەوە لەلای تۆ گەلێك بەئێشترە لەهی‌من... نەخێر... نا، نەء.... دەچیت بۆ مرسیلیا؟... دە خۆشەویستەکەم گوێم لێ‌راگرە، مادام دووسبەی ئێوارە لەمرسیلیا دەبی... ئەوەی لەکۆتاییدا لەتۆم دەوێت، حەزئەکەم، حەزئەکەم لەو ئوتێلە دانەبەزیت کەجاران بەیەکەوە لێ‌ی‌دادەبەزین... خۆ پێت ناخۆش‌نی‌یە..؟ هیوادارم تووڕە نەبیت... چونکە ئەوشتانەی کەبیری لێ‌دەکەمەوەنین یان هەشن بەڵام لەجێگەیەکی دیاریدانین.... لەبەرئەوە هەر نین.... تێم گەیشتیت؟.... سوپاس.... سوپاس... چەندە باشی.... چەندیشم خۆش‌دەوێی...

(بەتەلەفۆنەکەوە هەڵ‌دەستێت‌و دەچێتە سەرجێگاکەی) کەواتە.... خەریك بوو پێت‌بڵێم، کەواتە تابەیەك گەیشتنەوەیەکی نزیك...

نەخێر... من گومانم لەوەزۆرە... کێ ئەزانێ.... ئۆی... ئێستا زۆرچاکم (رادەکشێ‌و باوەش بەجێگاکەی‌و تەلەفۆنەکەدا دەکا) خۆشەویستەکەم... خۆشەویستە جوانەکەم، من ئازام... خێراکە... خێرا دایخەرەوە... دایخەرەوە... خێراکە... دایخەرەوە... من خۆشم‌دەوێیت، خۆشم‌دەوێیت.

خۆشم‌دەوێیت، خۆشم دەوێیت. خۆشم‌دەوێیت.

(تەلەفۆنەکەی لەدەست دەکەوێتەخواری‌و بەگریانێکی بەکوڵ دەگری)

## سەرچاوە


١ - ست مسرحيات في الغرب - ترجمة فتوح نشاطي
٢ - مجلة اسفار العدد / ٦ / ٧.


• تێبینی

ئەم شانۆگەری‌یە لەوەرگێڕان‌و نواندن‌و دەرهێنانی «گەزیزە»یە، لەسلێمانی لەیەکەم فیستڤاڵی شانۆی ئەزموون گەریی کوردی‌دا پێشکەش کراوە، هەروەها لە هەولێرو بەغداش پێشکەش کراوە لە ساڵی ١٩٨٧دا.

# بەیانیەکــــی خۆرەتاو

نووسینی: جووتەبرا کەنتیرۆ
گۆڕینی: مستەفا صالح کەریم

ووشەیەك

لە ساڵی ١٨٩٧ بە دواوە (سیرافین کەنتیرۆ)و (یواکین کەنتیرۆ) بە جووتە گەلێك شانۆنامەی شاکاریان نووسی. ئەم شانۆنامەیەی ئێستا دەیخوێنینەوە لە هەموو ئەوروپاو ئەمەریکادا ناوبانگێکی تایبەتی هەیە، ٣٠ ساڵ لەمەوبەر «سمیر شێخانی» ئەم شانۆنامەیەی کردووە بە عەرەبیو لە تەك شازدە شانۆنامەی تردا لە کتێبێکدا بڵاوی کردنەوە.

هەروەها دکتۆر (ضیاء الدین حمودی) مامۆستا لە زانکۆی بەغداد جارێکی تر ئەم شانۆنامەیەی گۆڕیە سەر زمانی عەرەبیو دوای ئەوەی دکتۆر (فخری قصطندی) پێیدا چۆتەوە، ئەمجا لە ژمارە (یەکی) ساڵی پازدەی گۆڤاری (الاقلام) لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩ بڵاوکرایەوە.

پاش ئەوەی هەردوو وەرگێڕانەکەم بەراوردکرد گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەردوو وەرگێڕ زۆر شارەزایانەو کارامانە بەرهەمەکەیان وەرگێڕاوە چونکە ووشەو ڕستەو زمانی هاوبەشیان هەیە.

لەبەر ئەوەی وەك د. ضیاء دەڵێ: «قارەمانی ئەم شانۆنامەیە، ئافرەتە نەمرەکانی بەرناردشۆو شکسپیرمان بیر دەخاتەوە لە ئازایەتیو بەهێزیی شەخسیەتو شێوازی گاڵتەجاری‌دا» وە لەبەر ئەوەی کە لایەنێکی گرنگی ژیانی مرۆڤ پیشان دەدات، وام بە چاك زانی خوێنەری کوردیش لە چێژی ئەم شانۆنامەیە بێبەش نەبن.

**«مستەفا»**

## «بەیانیەکی خۆرەتاو»

کەسانی شانۆنامەکە:

دۆنالۆرا. — دۆن کۆنزالۆ

پیترا: کەنیزەکی لۆرایە — خوانیتۆ - یاوەری کۆنزالۆیە

دیمەنەکە: بەیانیەکی خۆرەتاوە، لە سووچێکی پەری باخچەیەکی گشتی شاری (مەدرید) لەلای ڕاستەوە کەرەویتەیەکی دانیشتن هەیە. دۆنالۆرا، پیرەژنێکی سەرسپییە، بەڵام جوانە، ڕێك پۆشە. تەمەنی خۆی لە حەفتا ساڵی ئەدا بەڵام چاوە پرشنگدارەکانیو سیماو روخساری ئەوە دەگەیەنن کە هێشتا بەو پیرییەش ژیرو کاملو بیر تیژە.

دێتە ناو باخچەکەوە دەستێکی خستۆتە سەر شانی (پیترا)ی کەنیزەکیو چەترێکیش بە دەستەکەی تریەوەیە کە کردوویەتیە داردەست.

لۆرا: زۆر بەختەوەرم کە ئیمرۆ هاتم، ئەترسام شوێنەکەم گیرابێ، چ بەیانیەکی جوانە!

پیترا: بەڵام خۆرەکەی زۆر بەتینە.

لۆرا: بەڵێ، چونکە تۆ هێشتا لە تەمەنی بیست ساڵیدایت.

(لەسەر کەرەویتەکە دائەنیشێ)، ئای، هەست بە ماندوویی دەکەم! (سرنج لە پیترادەدا کە بێ ئارامی پێوە دیارە) ئەگەر ئەتەوێ برۆ بەلای پاسەوانەکەتەوەو لەتەکیا بکەوەرە زۆر بلێ‌بێی..

پیترا: پاسەوانی من نیە، خانم.. پاسەوانی باخچەکەیە.

لۆرا: بەڵام ئەوەندەی بە تۆوە خەریکە، ئەوەندە بە باخچەکەوە خەریك نیە، برۆ بەلایەوە، بەڵام زۆر لێم دوور مەکەوەرەوە، ئەمەوێ گوێت لە دەنگم بێ کە بانگم کردی.

پیترا: چاوم لێیەتی ئارامی لێ هەڵگیراوە.

لۆرا: لەدە دەقیقە زیاتر لای مەمێنەرەوە.

پیترا: بەڵێ خانمەکەم (دەیەوێ بەلای ڕاستا بڕوات)

لۆرا: کەمێ ڕاوەستە

پیترا: بەڵێ، فەرمانتان بەچیە؟

لۆرا: وورده نانەکەم بدەرێ

پیترا: ئای.. نازانم بۆ وام لێ هاتوە؟ بۆ لە بیرم چوو؟

لۆرا: (بەزەردەخەنەیەکەوە) من دەزانم. بیرت لای دڵتەو ئەویش لای پاسەوانەکەیە.

پیترا: فەرموو خانم ئەوە توورەکەی وورده نانەکە (توورەکەکەی دەداتێو لەلای ڕاستەوە دەچێتە دەرەوە)

لۆرا: خوات لەگەڵ (چاو ئەبڕێتە درەختەکانی لای ڕاست) وامەلەکان بەرەولام هاتن... کاتی هاتنم دەزانن (بەسێ جار وورده نانەکەیان بۆ ڕۆدەکات.. خۆشی بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە سەیری کۆترەکان دەکات).

(دۆن کۆنزالۆو خوانیتۆی خزمەتکاری لەلای چەپەوە دێنە باخچەکەوە.
دۆن پیرەمێردێکی حەفتا ساڵەیە، وای لێ‌دەردەکەوێ کە تووڕەو کەم ئارامە خۆی داوە بە سەر شانی خوانیتۆدا، قاچەکانیشی بە دوای خۆیا کێش ئەکات).

دۆن کۆنزالۆ: ئای لە ئافرەت.... کاتی خۆیان بە فیڕۆ ئەدەن، لەکاتێکدا دەبوایە خۆیان بە نوێژەوە خەریك بکردایە!

خوانیتۆ: گەورەم دەتوانن لێرەدا دانیشن، تەنیا خانمێکی لێ‌یە (لۆرا سەری وەرئەگێڕێ‌و گوێ دەگرێ)

کۆنزالۆ: خوانیتۆ دانانیشم، کورسیەکی بەتاڵم بە تەنیا بۆ خۆم دەوێ.

خوانیتۆ: بەڵام کورسی بەتاڵ نیە.

کۆنزالۆ: ئەو کەرەویتەیەی ئەو پەڕ هی خۆمە.

خوانیتۆ: گەورەم سێ قەشە لە سەری دانیشتوون

کۆنزالۆ: دەریانکە... هێشتا نەڕۆیشتوون؟

خوانیتۆ: نەخێر، هەروا قسە ئەکەن.

کۆنزالۆ: ئەڵێ‌ی بە کەرەویتەکەوەلکاون، لەوە ناچێ وازوو بە جێ‌ی بهێڵن وەرە ئێرەوە (بەرەولای راست ڕووەو کۆترەکان دێن)

لۆرا: (بە ناقابلیەوە): ئاگاداربە.

کۆنزالۆ: لە گەڵ منتە خانم؟

لۆرا: بەڵێ، لەگەڵ تۆمە

کۆنزالۆ: چیت دەوێ؟

لۆرا: ئەو مەلانەت تۆقاند کە ووردەنانم بۆ ڕۆکردبوون.

کۆنزالۆ: جا من چیم لەو مەلانە داوە؟

لۆرا: ئاخر من مەبەستمن.

کۆنزالۆ: ئێرە باخچەیەکی گشتی‌یە.

لۆرا: ئەی کەوا دەزانی بۆسەرزەنشتی قەشەکان دەکەیت کە جێگەکەیان گرتووی.

کۆنزالۆ: خانم. من‌وتۆ یەکتر ناناسین، نازانم چۆن ڕێگا بەخۆت ئەدەی بەو جۆرە لە تەکما بدوێ‌ی، وەرە، خوانیتۆ
(لای ڕاستەوە دەچنە دەرێ).

لۆرا: چ پیرە مێردێکی کەللە رەقە، بۆچی زۆربەی خەڵکی کە دەچنە ساڵەوە ئاوا ڕەوشتیان ئاڵۆزدەبێ؟ (سەیری لای ڕاست دەکات). خوا شکور، وائەم شوێنەشی لە کیس خۆی‌دا، باشتر، شیاوی ئەوەیە. خۆ مەلەکانمی تۆقاند... توورەیە، ئاڵۆزە، دەی فەرموو ئەگەر ئازای شوێنێ بۆ خۆت پەیدابکە.. بەسزمان. عارەق دەرداوە، ئەوا هاتەوە، تەپوتۆزی زێرپێ‌ی لە تۆزو خۆڵی دوای گالێسکە دەچێ (کۆنزالۆو خوانیتۆ لە لای ڕاستەوە دێن‌و بەرەو لای چەپ دەڕۆن).

کۆنزالۆ – خوانیتۆ، قەشەکان هێشتا نەڕۆیشتوون؟

خوانیتۆ – نەخێر، گەورەم، هەر لەجێ‌ی خۆیانن.

کۆنزالۆ – دەبێ کار بەدەستان کەرەویتەکان زیادبکەن، بە تایبەتی بۆ ڕۆژانێکی واخۆرەتاو. چاکە، پێم وایە ناچارم لای ئەم پیرەژنەوە دانیشم (بە برتەو بۆڵەوە لە قەراخی کەرەوێتەکەی لۆراوە دائەنیشێ‌و بەخێسەوە تێ‌ی دەڕوانێ. شەپقەکەی دائەگرێ‌و سڵاوی لێ دەکات): بەیانیت باش

لۆرا: چیە، ئەوە هاتیتەوە؟

کۆنزالۆ: ئەم جارەش ئەیڵێمەوە ئێمە بە ناسینی یەکتری شاد نەبووین.

لۆرا: وەڵامی سڵاوەکەتم دایەوە.

کۆنزالۆ: (بەیانیت باش) بە (بەیانیت باش) وەڵام دەدرێتەوە.
تەنیا ئەوەندە دەتوانی لەوەڵامدا بڵێ‌ی

لۆرا: دەبوایە پرسم پێ‌بکەی ئەمجا دابنیشی، چونکە ئەمە شوێنی منە.

کۆنزالۆ: کورسیەکانی ئێرە هی‌گشت کەسن.

لۆرا: ئەی بۆ پێش تاوێ گوتت: قەشەکان شوێنەکەمیان گرتوە؟

کۆنزالۆ: چاکە، زور چاکە، هیچی ترم نیە بیڵێم (بە دەنگێکی نزم) چ پیرەژنێکە؟! دەبوایە لە ماڵەوە خوری چنی بکردایە، یان بەتەزبێحاتەوە خۆی خەریك بکردایە.

لۆرا: لەوە زیاتر لە سەری مەڕۆ، لەبەر دڵی تۆ شوێنەکەم بەجێ ناهێڵم.

کۆنزالۆ (بە دەستە سرەکەی تەپوتۆزی قۆندەرەکانی پاك دەکاتەوە) دەبوایە ئەم ناوە ئاوڕشێن بکرایە.

لۆرا: تۆ دەستە سڕ وەك فلچەی قۆندەرە بەکار دەهێنی؟

کۆنزالۆ: ئەی بۆ نا؟

لۆرا: ئاخۆ فلچەی قۆندەرەش دەکەی بە دەستەسڕ؟

کۆنزالۆ: بە چ مافێك تۆ ڕەخنە لە کرداری من دەگری؟

لۆرا: بە مافی دراوسێتی!

کۆنزالۆ: خوانیتۆ، کتێبەکەم بۆ بهێنە، نامەوێ چی تر گوێم لەم بەیت‌و بالۆرەیە بێ.

لۆرا: وادەردەکەوێ خاوەنی ڕەوشتێکی بالای.

کۆنزالۆ: ببەخشە، خانمەکەم، بەلام هەرگیز بۆت نیە خۆت لە شتێکەوە هەڵقوڵتێنی کە پێوەندی بەتۆوە نەبێ.

لۆرا: من هەمیشە ئەوە دەڵێم کە بە بیرمادێ.

کۆنزالۆ: چاکە، خوانیتۆ، کتێبەکە بهێنە.

خوانیتۆ: فەرموو ئەوە کتێبەکەتە گەورەم.

(کتێبەکەی دەداتێو لەلای ڕاستەوە دەچێتە دەرێ – کۆنزالۆ بە تووڕەیی‌یەوە دەڕوانێتە لۆرا، ئەمجا دووچاویلکەی گەورە دەکاتە چاوی، زەرەبینێکیش لە گیرفانی دەردەهێنێو دەیخاتە پێش چاویلکەکانو خۆی بۆ خوێندنەوە ئامادە دەکات).

لۆرا: وامزانی ئەمجا تیلیسکوپ بەکار دەهێنی.

کۆنزالۆ: ئەوە دیسان تۆی؟

لۆرا: دیارە چاوەکانت تیژن!

کۆنزالۆ: لە چاوی تۆ تیژترن.

لۆرا: وادیارە.

کۆنزالۆ: ئەگەر بڕوا ناکەی لە ڕاوچیەکان بپرسە.

لۆرا: ئا... بۆ جەنابتان ڕاویش دەکەن؟

کۆنزالۆ: جاران... تەنانەت ئەمرۆ..

لۆرا: (قسەی پێ‌ئەبڕێ) ئا، بەڵێ، وایە.

کۆنزالۆ: بەڵێ خانمەکەم، هەموو ڕۆژانی یەك شەممە تفەنگەکەم ئەخەمە سەرشانمو سەگەکەم دوای خۆم ئەخەمو ئەچمە سەر زدویو زارەکەم لە نزیك (ئەیاکا)وە. ئابەم جۆرە کات دەکوژم.

لۆرا: بەڵێ، بۆ کات کوشتن! هەر ئەوەندەت لەدەست دێ کات بکوژی.

کۆنزالۆ: تۆ لەو بڕوایەدای؟ ئەتوانم کەللەی وورچێکی دڕندەی مۆمیاکراوت لە هۆڵی کتێبخانەکەما، پیشان بدەم...

لۆرا: قوربان. منیش ئەتوانم پێستی پڵنگێکت لە ژووری نوستنەکەما پیشان بدەم. ئەمە نیشانەی چیە؟

کۆنزالۆ: باشە خانمەکەم... ڕێگام بدە بخوێنمەوە. بائیتر قسە بەس بێ.

لۆرا: چاکە. واهێمن بویتەوە.

کۆنزالۆ: ئەمجا پێویستە کەمێك برنووتی هەڵمژم (قوتوەکەی دەر ئەهێنێ) نەختێکت بدەمێ؟ (قوتوەکەی لێ نزیك دەخاتەوە)

لۆرا: ئەگەر لە باشەکان بێت.

کۆنزالۆ: باشترین جۆرە... بە دڵت دەبێ.

لۆرا: (کەمێك بۆنی دەکات): مێشکم ئەکاتەوە.

کۆنزالۆ: منیش هەروەها.

لۆرا: ئەپژمیت؟

کۆنزالۆ: بەڵێ. خانم. سێ جار ئەپژم.

لۆرا: ڕیکەوتێکی سەیرە. منیش هەروام. (دوای ئەوەی هەردوکیان دەکەونە بۆن‌کردنی بڕنوتیەکە، چاوەڕوانی پژمین دەکەن، **هەر یەکەیان سێ** جار دەپژمێ)

کۆنزالۆ: ئێستا هەست دەکەم دروستم.

لۆرا: منیش. (لەبەرخۆیەوە) ئەم بڕنوتیە ئاشتی خستە **نێوانمانەوە.**

کۆنزالۆ: ڕێگام دەدەی بە دەنگی بەرز بخوێنمەوە؟

لۆرا: بەڵێ، بە ئارەزووی خۆت دەنگی لێ‌بڵندکە، **هیچ پێم ناخۆش‌نیە.**

کۆنزالۆ: (دەخوینیتەوە).

خۆشەویستی هەمووی تاڵییە
بەلأم لە تەك ئەوتاڵیەشیدا
شیرین ترین شتی ئەم سەرزەمینەیە

(ئەمە شیعری (کامبوامۆر)ە.

لۆرا: ئاهـ...

کۆنزالۆ: (لەسەر خوێندنەوە بەردەوام دەبێ)

سەیرە، ڕۆژان دێنو دەڕۆن
ئەمرۆ بەسەرهاتی دوێنێ دەگێڕێتەوە.
جوانی ئەمرۆ لە کانیەکەی دوێنێ هەڵقولاوە
دایكو کچ شوێن پێم هەڵدەگرن
سلاو لە دوێنێو لەوەی بەدوایدا هاتوە.
– من وای بۆ دەچم ئەم شیعرانە بۆنی گاڵتەجاڕییان لێ‌دێ.

لۆرا: (بە پێکەنینەوە): منیش هەمان ڕام هەیە.

کۆنزالۆ: ئەم کتێبە شیعری زۆر جوانی تیایە. گوێ بگرە.

بیست ساڵ تێپەڕی
ئائەوەتا دەگەڕێتەوە

لۆرا: نازانی چەند دڵگرانم کە دەبینم بەم چاویلکانەوە دەخوێنیتەوە.

کۆنزالۆ: بۆچی تۆ دەتوانی بەبێ چاویلکە بخوێنیتەوە؟

لۆرا: بێ‌گومان

کۆنزالۆ: ئالەم تەمەنەی تۆدا؟ گومانم‌نیە کە گاڵتە ئەکەی.

لۆرا: کتێبەکەم بدەرێ (کتێبەکەی لێ وەردەگرێو بە دەنگی بەرز دەکەوێتە خوێندنەوە).

بیست ساڵ تێپەڕی
ئا ئەوەتا دەگەڕێتەوە
لە کاتێکدا چاوو پێلوو دەکەونە چرپە
هەزیەکەیان لە دڵی خۆیدا دەڵێ:

ئایا راستە من ئێستا چاوم بە بینینی خۆشەویستەکەم تێردەکەم؟

ئایا راستە ئەوە یارە دێرینەکەمە؟

(ئەمجا کتێبەکە دەداتەوە بە کۆنزالۆ)

کۆنزالۆ: ئەوی راستیبێ بەخیلیت پێ دەبەم بۆ ئەو چاوە تیژانەت.

لۆرا: (لابەلابێو لەبەر خۆیەوە): حەرام بێ دێرێکم لە کتێبەکەدا نەخوێندەوە، من قەسیدەکەم سەرانسەر لەبەرە.

کۆنزالۆ: من زۆر حەز لە شیعری چاك دەکەم، تەنانەت لە هەرەتی لاویما شیعریشم دائەنا.

لۆرا: شیعری چاكبوون؟

کۆنزالۆ: بەڵێ. هاوڕێی نزیکی شاعیرانی وەك اسبرو نشیداو زۆریللاو بیکیربووم، زۆریللام لە ئەمەریکا ناسی.

لۆرا: چووی بۆ ئەمەریکا؟

کۆنزالۆ: جارەها چوومەتە ئەمەریکا، یەکەم سەردانم تەمەنم شەش سالان‌بوو.

لۆرا: ئەشێ لە تەك کریستوف کولومبسابوویی لە گەشتەکەیدا!

کۆنزالۆ: (بەپێکەنینەوە) ئەوەندەش پیرنیم. دانی پیائەنێم پیرم ئەمە راستە، بەلام نە شافەردینانلو نە شاژن ایزابیلام ناسیوە (هەردوکیان پێ ئەکەن) هەروەها هاوڕێی (کامبوامور) بووم لە فالنسیا یەکترمان ناسی، چونکە من لەم شارە لەدایكبووم.

لۆرا: ئەوە بەراستە؟

کۆنزالۆ: بەڵێ، هەر لەوێش پێگەیشتمو سەرەتای لاوێتیم لەوێ بەسەربرد ئاخۆ سەردانی ئەم شارەتان کردووە؟

لۆرا: بەڵێ، لە نزیك فالنسیاوە کۆشکێکی قەشەنگی جوان هەبوو، ئەگەر ئاتیستا مابێ گەلێك یادگاری منی پاراستوە.

پێش چەندین سال لەمەوبەر، رۆژانێکی خۆشم تێدا بەسەربرد.
لە نزیك دەریاکەوەبوو، خۆی لە نێو درەختی لیمۆو پرتقالا شاردبووەوە، پێیان دەگوت... بابێتەوەبیرم، چییان پێدەگوت؟ ئا.. پێیان دەگوت... (ماریشیلا).

کۆنزالۆ: (بە شلەژاوی): ماریشیلا؟

لۆرا: بەڵێ، (ماریشیلا) ناوەکە لە لات نامۆنیە؟

کۆنزالۆ: نەخێر.. زۆر ناسراوەلام، ئەگەر بیرم سەرم لێتێك نەدا چونکە بە ناشکوری نەبێ ئێمە کە ئەکەوینە ساڵەوە زۆر شتمان بیر دەچێتەوە، لەو کۆشکەدا جوانێکی تیابوو تائێستا ئافرەتی واشۆخو شەنگم نەدیوە، بروات پێ ئافرەتی جوانم زۆر دیوە بەلام جوانی وەك ئەو هەر نەبوە.. بابێتەوە بیرم..
ئا.. ناوی لۆرابوو، لۆرا لۆرانتی.

لۆرا: (بەشلەژاوی) لۆرا لۆرانتی؟

کۆنزالۆ: بەڵێ (هەردوکیان بە شێوەیەکی پرماناوە چاو ئەبرنە یەکتری)

لۆرا: (دێتەوە سەر خۆی): هیچ! تۆ خۆشەویست ترین کچی هاوڕێی ئەو سەردەمەم بیردەخەیتەوە.

کۆنزالۆ: سەیرە!

لۆرا: راستە، پێیان دەگوت (کیژۆڵە زیوینەکە)، هەر بەو ناوەوە لە ناوچەکەدا دەناسرا. وائەزانم ئێستایە کە لە پشت پەنجەرەکەوە بە گوڵەباخە سوورەکانەوە رادەوەستا، ئەو پەنجەرەیەت دێتەوە بیر؟

لۆرا: لەبیرمە، ئەوە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیبوو.

کۆنزالۆ: زوربەی کاتی بەرۆژ هەر لەوێدا بەسەردەبرد. مەبەستم لەو سەردەمەی خۆمە.

لۆرا: (بە دەم هەناسە هەڵکێشانەوە) لە سەردەمی منیشدا هەروابوو.

کونزالۆ: سپی دەتگوت گوڵە خەزێمە، قژی رەش، جووتێ چاوی رەش‌و جوان، دلرفێن، لە هەر شوێنێ دەرکەوتایە ئەو ناوەی روناك دەکردەوە، زۆر جوانبوو، ئای خواوەندی گەورە چ جۆرە شێوەی جوان لەم گڵە دروست دەکەیت... رۆژانێ بوو ناگەرێنەوە، خەونبوو.

لۆرا: (لەبەر خۆیەوە) ئای، ئەگەر دەزانی ئەو خەونە ئێستا لە تەنیشتتەوەیە بۆت دەر ئەکەوت هەندێ خەون چۆن کۆتایی دێت.
(بە دەنگی بەرز) بێبەختبوو، خۆشەویستیەکەی چیرۆکێکی دلداری پڕ لە ناسۆربوو.

کۆنزالۆ: پرخەفەت. (سەیری یەکتری ئەکەن).

لۆرا: چیرۆکی ئەو دلداریەت بیستوە؟

کۆنزالۆ: بەڵێ.

لۆرا: خوا خۆی ئەزانێ کار بەرەو کوێ دەبات (لەبەر خۆیەوە): **کۆنزالۆ**

کۆنزالۆ: کورە لاوی گیرۆدەی ئەو خۆشەویستیە...

لۆرا: ئا...، بە شەرە شیر؟

کۆنزالۆ: بەڵێ، شەرە شیر، ئەولاوە دلدارە ئامۆزامبوو، زۆریشم **خۆش** دەویست.

لۆرا: ها.. ئامۆزاتبوو، کچەکەی هاوڕێم لە نامەیەکیدا **چیرۆکی ئەو** خۆشەویستیەی بۆ نوسیبووم، چیرۆکێکی زۆر جوانە. ئامۆزا **دلدارەکەت**،

هەموو بەیانیەك بە سواری ئەسپەکەی لە نزیك باخچەکەیانەوە بە ژێر پەنجەرەکەیدا تێدەپەڕی‌و چەپکێ گوڵێ بۆ هەڵ ئەدا.

کۆنزالۆ: پاش نیوەڕۆش، سوارەی شۆخ بە هەمان شوێنا دەگەڕایەوەو چەپکە گوڵی خۆشەویستەکەی دەقۆستەوە، وایە؟

لۆرا: بەڵێ، دەیانەویست شوو بە بازرگانێك بکات کە خۆشی نەدەویست‌و پیێ قایل نەبوو.

کۆنزالۆ: شەوێکیان، لە کاتێکدا ئامۆزاکەم لە ژێر پەنجەرەکەدا چاوەڕوانی ئەوەبوو گوێی لە ئاوازە خۆشەکەی بێ، لە ناکاوا زەلامێکی بۆ پەیدابوو.

لۆرا: کەوتە جنێودانی ئامۆزاکەت.

کۆنزالۆ: بووبە شەڕیان.

لۆرا: لە دواییشدا بەشەرە شیر شکایەوە.

کۆنزالۆ: بەڵێ، لە گەڵ یەکەم تیشکی زێرینێ خۆرا، لە ڕۆخی دەریاکە شیر ڕاوەشێنراو بازرگان زامدارکرا، زامەکەی کاریگەربوو کورەکەی مامم ناچاربوو چەند ڕۆژێ خۆی بشارێتەوە ئەمجا بۆ یەکجاری شارەکەی بەجێ هێشت.

لۆرا: وادیارە ڕووداوەکە بە باشی دەزانی.

کۆنزالۆ: تۆش چاکی لێ دەزانی

لۆرا: بۆم ڕوون کردیتەوە کە کچەکەی هاوڕێم پیێ ڕاگەیاندم

کۆنزالۆ: هەروەك چۆن ئامۆزاکەم بۆی گێڕامەوە (لەبەر خۆیەوە) ئەمە لۆرایە، خۆیەتی!

لۆرا: (لەلاوە) بۆچی پیێ بڵێم؟ بڕوا ناکەم گومانی وابکات. هەر بە لاشیا ناچێ.

کۆنزالۆ: (لەلاوە): چەند دڵپاکە!

لۆرا: توخوا پێم بڵێ: تۆ ئامۆژگاری ئامۆزاکەت کرد کە لۆرا لە بیر خۆی باتەوە؟

کۆنزالۆ: چی؟ ئەوە بەڕاستە، ئامۆزام هەرگیز لەبیری نەچوبووەوە.

لۆرا: ئەی ئەو ڕەفتارەی چۆن لێك دەدەیتەوە.

کۆنزالۆ: ڕاستی چۆنبوە ئاوا بۆت دەگێڕمەوە، ئەو لاوە دڵ بریندارە پاش ئەنجامی شەڕە شیرەکە هاتە لام، ترسی لە بنە ماڵەی کابرای بریندار هەبوو، پاشان چوو بۆ ئیشبیلیە، لەوێشەوە بۆ مەدرید. چەندین نامەی بۆلۆرا نووسی زۆریان شیعربوون، بەلام بێگومان کەوتبونە دەست کەس‌و کارەکەی، چونکە بە هیچ جۆرێ وەلامی پیێ نەگەیشت. ئەوسا لەو بارە دەروونیەیداو لەو دڵ شکاویەیدا وای بۆ چووکە خۆشەویستیەکەی کۆتایی هاتوە. چوە سوپاوەو نێررا بۆ ئەفەریقا، لەوێ لەسەنگەری شەرەفدا کۆتایی ژیانی هات لە کاتێکدا ئالای ئەسپانیای بە دەستەوەبوو، ناوی لۆرای خۆشەویستیشی بە سەرزاریەوەبوو.

لۆرا: (لابەلا) ئای لەو درۆگەورەیە!

کۆنزالۆ: (لابەلا) ئەی چۆن؟ نابێ خۆم بمرێنم بە جۆرێکی‌وا شەرەفمەندانە نەبێ؟

لۆرا: بێگومان ئەم بەسەرهاتە دڵتەزێنە هێزی لەبەر بریت.

کۆنزالۆ: بەڵێ، خانمەکەم، هەر وەك براوابووین، پێم وابێ ئیتر دوای ئەوە بەماوەیەك لۆراش خووی دایە پەپوولەگرتن لە باخچەکەیدا بێ ئەوەی مێشێکی میوان بێ.

لۆرا: نەخێر، بەڕێز، وانەبوە.

کۆنزالۆ: ئەوە پیشەی ژنانە!

لۆرا: تەنانەت ئەگەر پیشەی ژنانیش وابێ، کیژۆڵە زیوینەکە، لەو جۆرانە نەبوە، کچەکەی هاوڕێم ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی هەواڵێکی کرد لە لاوەکەوە پیێ بگات، بێ سوودبوو، پاش نیوەڕۆیەکی یەکشەممە یان ڕاستتر بڵێم: کاتی خۆر ئاوابوون، کە ئەستێرەکان لە ئاسمانا کەوتنە جریوە، کچە عاشقەکەی هاوڕێم بە خێرایی ماڵی بەجێ‌هێشت‌و ڕووی کردە قەراخی دەریاکە، لەو ڕۆخەی خۆشەویستەکەی گیانی خۆی لە پێناویا خستە مەترسیەوە، ناوی دڵدارەکەی لەسەر لمەکە نووسی، ئەمجا لەسەر تاوێرە بەردێك دانیشت‌و چاوی بڕیە ئاسۆی دوور.. شەپۆلەکانیش کەوتنە لێوە لەرەو لە تاوێرەکە نزیك‌بوونەوە، تا بە تەواوی ئاوە کە کچەی داپۆشی‌و شەپۆلەکان بۆ ناخی دەریا ڕایان کێشا.

کۆنزالۆ: ئەی هاوار بەماڵم!

لۆرا: ئەو ڕاوچیانەی هاتوچۆی ڕۆخی دەریاکە دەکەن، ئەم چیرۆکە جارەها دەگێڕنەوەو دەڵێن: ماوەیەکی زۆریش بە سەر ئەو ڕووداوەدا تێپەری هێشتا شەپۆلەکان نەیانتوانیبوو ناوی کورە لاو لەسەر لمەکە بکوژێننەوە (لەبەرخۆیەوە): بۆهەر تۆ ئەتوانی مەرگی وابۆخۆت دروست بکەی؟، هەرگیز ناتوانی کۆچی خۆت لە مەرگی من ڕازاوەتر بکەیت.

کۆنزالۆ: (لەبەر خۆیەوە): خۆلە من خراپتر درۆ هەڵدەبەستی

لۆرا: بە سزمان لۆرا!

کۆنزالۆ: بە سزمان کۆنزالۆ!

لۆرا: (لەبەر خۆیەوە): پیێ نالێم دوای دوو ساڵ شوومکرد.

کۆنزالۆ: (لەبەر خۆیەوە): پاش سێ مانگ لە گەڵ کچە سەماکەرێکی

بالیدا هەلاتم بۆ پاریس.

لۆرا: چارەنووس چەند سەیرە! ئاوا من‌و تۆ دوو مرۆڤی نە ناسیاو-بە رێکەوت پێك دەگەین‌و دەکەوینە گفتوگۆو باسی چیرۆکی دڵداری دوو هاورێیان کە ماوەیەکی دوورو درێژی بەسەردا تێپەریوە. بە جۆرێك دەدواین هەر وەك دوو هاوریی دێرین.

کۆنزالۆ: بەراستی سەیرە! بە تایبەتی ئەو سەرەتایەی کە دەستمان بەگفتوگۆ کردو بە یەکدا هەڵدەشاخاین.

لۆرا: تۆ مەلەکانمت ترساند.

کۆنزالۆ: ئەشێ بەدیم نەکردبن.

لۆرا: بەڵێ راستە (بە ناسکییەوە): سبەینێ دێیت؟

کۆنزالۆ: پێم وابێ دێم ئەگەرکەش خۆش بێ، مەلەکانیشت ناترسێنم ووردە نانیشیان لە تەك خۆما بۆ ئەهێنم.

لۆرا: زۆر سوپاس، مەلەکان چاکەیان لە یاد ناچێ. ئاخۆ کە نیزەکەکم لە کوێبێ؟ پیترا... (پەنجەی بۆ رادەکێشی)

کۆنزالۆ: (لەلاوە): (ئەروانێتە لورا کە پشتی تێ کردبوو):

نە، هەرگیز خۆم دەرناخەم، شێوەو روخساری ئێستام هی ئەوەنین، چاکتر وایە یادی ئەو سوارچاکەی لە لابمێنێ کە هەموو رۆژێ بەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیا تێدەپەری‌و چەپکە گوڵی بۆ هەڵ ئەدا.

لۆرا: ئەوا کارەکەرەکەم هات.

کۆنزالۆ: ئەی خوانیتۆ لە کوێیە؟ ئائەوەتا هەر بە دەورو پشتی کارەکەرو کەنیزەکەکانا دێ (دەستی بۆ لای راست رادەکێشی).

لۆرا: (لەلاوە ئەروانێتە کۆنزالۆ کە پشتی لییەتی).

نە، نابێ بمناسێتەوە، خۆمی لا ئاشکرا ناکەم، من ئێستا زۆر گۆراوم چاکتر وایە هەر بەو کیژۆڵە چاو رەشەی جارانم بزانێ کە چەپکە گوڵی تێ ئەگرت لە کاتێکدا بە نێو باخچەکەیدا تێدەپەری.

(خوانیتو لە لای راستەوەو پیترا لە لای چەپەوە بە چەپکێ گوڵە وەنەوشەوە دێنە ناوەوە).

لۆرا: هاپیترا هاتیتەوە

کۆنزالۆ: ها خوانیتۆ دواکەوتیت.

پیترا (بە خانمەکەی). خانم پاسەوانەکە ئەم چەپکە گوڵە وەنەوشەیەی بۆ ناردیت.

لۆرا: چەند ناسك‌و بەرێزە، لە بری من سوپاسی بکە، چەند بۆنیان خۆشە! (کە چەپکە گوڵەکە لە کارەکەرەکەی وەر دەگرێ چەند گوڵێکی لە دەست دەکەوێتە خوارێ کە باش چەپك نەکرابوون)

کۆنزالۆ: خانمەکەم، ئەم پێك گەیشتنەمان مایەی شانازی‌و شادمانیەکی گەورەبوو بۆ من.

لۆرا: منیش پیی شاد بووم.

کۆنزالۆ: بە هیوای پێکگەیشتنمان ٬سبەینێ.

لۆرا: بۆ سبەینێ.

کۆنزالۆ: ئەگەر خۆرەتاوبوو.

لۆرا: ئەگەر خۆرەتاوبوو دێیت‌و دەچیتە سەر کەرەویتەکەی جارانت؟

کۆنزالۆ: نە، ئەگەر قابل‌بیت دێمە لای تۆ.

لۆرا: کەرەوتیەکەم لە پێشکەشتابە.

کۆنزالۆ: ووردە نانی مەلەکانیشم لەبیر ناچێ.

لۆرا: کەواتە تاسبەنیێ بەخوات دەسپێرم

کۆنزالۆ: بەخوام سپاردی، بە هیوای سبەنیێ.

(لۆرا دەست ئەخاتە سەر شانی کارەکەرەکەی‌و بەرەولای راست دەرۆن کۆنزالۆ پێش ئەوەی لە گەڵێ خوانیتادا بجولێن، دەشڵەژێ، تەقەلایەکی زۆر ئەدا تا دائەنەوێ بۆکۆکردنەوەی ئەو گوڵانەی لە دەست لۆرا کەوتبونە خوارێ، لەوکاتەدا لۆرا ئاور ئەداتەوەو بەو کارەی کۆنزالۆ دەزانێ کەوا گوڵەکانی هەڵدەگرێتەوە).

خوانیتۆ: گەورەم، ئەوەچی ئەکەی؟

کۆنزالۆ: خوانیتۆ، چاوەروانکە.

لۆرا (لابەلا): خۆیەتی، گومانم نەما کە خۆیەتی!

کۆنزالۆ (لەبەر خۆیەوە): تەواو خۆیەتی! هیچ گومانم لەوە نیە.

(لۆراو کۆنزالۆ دوور بە دوور دەست بۆ یەکتر بەرز ئەکەنەوە)

لۆرا (بەدەنگێکی ناسکی پڕ سۆزەوە لەبەر خۆیەوە).

ئاخۆ راستە خۆیەتی!، ئەمە ئەوە!

ئاخۆ راستە من چاوم بە کلی بینینی ئەو دەرێژم؟

کۆنزالۆ: (بە هەستێکی شاعیرانەوە لە بەر خۆیەوە)

خوا هاوار، ئەمە خۆیەتی. ئەوە.

ئاخۆ بەراستی ئەوە ئەو شۆخە دڵرفێنەی جارانی منە؟

«بزەی شادمانی لە سەر لێوی هەردوکیان دەنەخشێ، هەروەکوا بزانن کە جاری جارانەو لۆرا لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەیەوە راوەستاوەو کۆنزالۆش لە باخچەکە دایەو نیگایان لە یەکترییە. بەرەبەرە لە چاو وون دەبن‌و هەریەکەیان دەستی خستۆتە سەرشانی پیتراو خوانیتا.

عەزیز رەشید حەریری

# ساڵێکی تریش لەگەڵ بەرهەمە چاپکراوو یارمەتی دراوەکانی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاواندا

بەشی دووەم وکۆتایی

لە ژمارە «٦٤» ی مانگی «ئاپاری» ئەمساڵدا بەشی یەکەمی ئەم ڕاپۆرتەمان پێشکەش کردن ؛ بەڵام ئەوسا کە ڕاپۆرتەکەمان ئامادەکرد هێشتا هەندێ کتێبی دیکە لە چاپخانەکاندا بەدەست تەگەرەی چاپو نەبوونی کاغەزەوە لە بینەو بەردەدا بوون ، جا بۆ ئەوەی ڕاپۆرتەکە قاڵبی تەواوی خۆی وەربگرێو ، خوێنەرو ڕۆشنبیرو ، ئەو مامۆستا بەڕێزانەی بە کاروباری سەرژمێرکردنو ، بیلیۆگرافیای کتێبە کوردییەکانەوە خەریکن ، ژمارەیەکی تەواوو ڕاستو دروستی ئەم چاپکراوانەیان لەبەر دەست بێ ، وا بەشی دووەمی ڕاپۆرتەکەمان بڵاودەکەینەوە ، کە بریتییە لەو کتێبانەی لەسەر ساڵی ١٩٨٧ حیساب کروان ؛ بەڵام ئەمساڵ ، واتە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ کەوتوونەتە کتێبخانەکانو چاپکردنیان تەواو بووە ، هیوادارین بەم کارەمان توانیبێتمان خزمەتێکی بچکۆلانە پێشکەش بە ئەرشیفو کتێبخانەی کوردی بکەینو ، بە کورتە ناساندنێکیش ڕۆشنبیرانی کوردمان لەو کتێبانە بە ئاگا هێنابێ کە ساڵی ١٩٨٧ بەیارمەتیو لەسەر ئەرکی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراون . ئیتر فەرموون لەگەڵ بەشی دووەمی کتێبەکانی ساڵی ١٩٨٧ . .

## أ : کتێبە چاپکراوەکان :

| ناوی کتێبەکە | دانەرەکەی | جۆری بابەتەکەی |
|---|---|---|
| ١٤- توێشەبەرەی هونەری مامڵێ | نووسینو ئامادەکردنی سمایلی مامڵێ | هونەر |
| ١٥- ئاوانو سزا . | کۆکردنەوەی : جلال سید حسن برزنجی | چیرۆك |
| ١٦- پەڵە هەورێ . | لەتیف بەرزنجی . | شیعر |

## أ : کتێبە چاپکراوەکان :

### ١٤ – توێشەبەرەی هونەری مامڵێ :

کتێبێکی چڕو بە پێزی هونەرییە دەربارەی ژیانو گۆرانییە بەجۆشو خرۆشەکانی «محمدی مامڵێ»ی هونەرمەندو دەنگ خۆش ، ئەم کتێبە کاك سمایلی مامڵێ نووسیویەتیو ئامادەی کردووە ، ئامادەکاری ئەم بەرهەمەی مامڵێ وێڕای «٢١» لاپەڕەی ژیانو بەسەرهاتو دەوری مامڵێی هونەرمەند لەبواری خزمەتکردنی گۆرانیو ئاوازی کوردی ، کە برای شاعیر «غەریب پشدەری»ش لە بەشێکیدا بە دارشتنەوەی نووسینەکە بەشداری تێدا کردووە ؛ دەکرێ بڵێین هەموو گۆرانییەکانی وەخۆ گرتووەو ، بۆ زوربەی هەرە زۆری گۆرانییەکانیش لە لاپەڕە «٣٢١» ەوە بەرەو دوا نۆتەکان تۆمارکراون ، وەکو لە لاپەرە «٣٢٠» دا هاتووە هەندێ لەو نۆتانە برای هونەرمەند «أنور قەرەداغی» نووسیونیو بەشەکەی دیکەیش کاك «أحمد ڕەزا» بەشداری تێدا کردوون . بەهەرحاڵ توێشەبەرەی هونەری مامڵێ چەپکە گوڵێکی تری ڕازاوەیە دەچێتە سەر خەرمانە بەپێزو دەوڵەمەندەکەی هونەری گۆرانییەکانی کوردیمانو ، ئەم کارە پیرۆزەی کاك «سمایل» یش مایەی ڕێزو پێزانینی هەموو هونەر

دۆستێکی کوردە .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٣٦٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی (٥ر٢٣ × ٥ر١٦سم)و ، لە چاپخانەی «أشبيلية» لە بەغدا چاپکراوە ، لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارە «٨١٩»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و ، نرخی دوو دینارەو ، کاك «ناظم دڵبەند» سەرپەرشتی‌ی لەچاپدانی کردووە .

ئەم کتێبە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ دا کەوتۆتە کتێبخانەکانەوەو ، «٣٠٠٠» دانەی لێ‌چاپکراوە .

## ١٥ – تاوانو سزا :

کۆمەڵە چیرۆکێکی ڕووداوی کوردی‌یە ، کاك «سەید جەلال سەید حەسەن بەرزنجی» کۆی‌کردونەتەوەو ئامادەی کردوون بۆ چاپ‌و ، مامۆستا کەریم مستەفا شارەزا-پێایداچۆتەوە . .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە جگە لە پێشەکی‌یەکی کورت کە لەژێر ناوی «ووشەیەك» دا نووسراوەتەوە ، ئەم چیرۆکانەی گرتۆتە خۆ :

«تاوانو سزا ، کاتێ باوك دەست لەخوێنی کوری هەڵدەگرێ ، ژن بە ژنەو تاوانی باوکێك، تاوانی مرۆڤ‌و سزای خودا.

لاپەرە «٧١» یش بریتی‌یە لە کورتەیەکی ژیانی نووسەرو ئەم دەورەی هەیەتی لە بواری خزمەتکردنی ئەدەب‌و ڕۆشنبیری کوردی‌دا .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بریتی‌یە لە «٧٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی (٢٢ × ١٦ سم) و ، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری‌و لاوان» لە هەولێر چاپکراوە ، لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارە «١٢٧١»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و ، نرخی «٤٥٠» فلسە ، کاك «سیروان بکر سامی» نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو ، سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە ، کاك «محسن محمد أمین» یش تابلۆکانی ناوەوەی درووست کردوون .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەیش هەر لە سەرەتای ساڵی «١٩٨٨»دا کەوتۆتە کتێبخانەکانەوەو ، «٢٠٠٠» دانەی لێ‌چاپکراوە .

## ١٦ – پەڵە هەورێ

نامیلکەیەکی شیعریە لەسەر ئەرکی ئەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان چاپکراوە . بریتی‌یە لە شیعرێکی درێژی کاکە شێخ لەتیف بەرزنجی کە بەبۆنەی کۆچی دوایی خوالێخۆشبو «شیخ اسماعيل شيخ عبد الكريم» دارەخورما نووسیویەتی .

ئەم نامیلکەیە بریتی‌یە لە «٤٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٥ × ١٨سم» ەو ، لە چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان لە هەولێر چاپکراوەو . بە خەتی دەست نووسراوەتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی وەکو بلاوکراوەیەکی ئەمینداریتی چاپکراوە بۆیە ژمارەو ساڵی سپاردنی بەکتێبخانەی نیشتمانی بەغدادا بەسەرەوە نی‌یە . هەروەها نرخیشی بۆ دانەنراوە ، نەخشەی بەرگەکەی کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند کێشاویەتی‌و ، «١٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە .

## ب : کتێبە یارمەتی‌دراوەکان

| ناوی کتێبەکە | دانەرەکەی | جۆری بابەتەکەی |
|---|---|---|
| ٢٨-کەسێتی سەرکەوتوو . | جەلال خەڵەف ژاڵەیی | دەروون ناسی |

## ٢٨ – کەسێتی سەرکەوتوو :

جارێکی دیکە مامۆستای نووسەر «جەلال خەڵەف ژاڵەیی» کتێبێکی تازەی لەبارەی دەروون ناسی‌یەوە پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کرد .

ئەم کتێبەی مامۆستا «جەلال» کە لە ژێر ناوی «کەسێتی سەرکەوتوو» دایە ، بە ووردی لەبارەی کەسێتی سەرکەوتوو دەدوێ لە ڕوانگەی دەروون ناسی‌یەوە ، هۆو دەرئەنجامەکانی ئەم مەسەلە گرینگە بە نموونەی سەرکەوتوو ڕوون دەکاتەوەو، باسیان لێوە دەکات.

نووسەر بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەی سوودی لە «٥٧» سەرچاوەی هەمەجۆر بەزمانی عەرەبی‌و کوردی وەرگرتووەو، «١٣» لاپەرەیشی بۆ فەرهەنگۆکێك تەرخانکردووە بە زمانی کوردی‌و عەرەبی بۆ ئەو ووشە گرانانەی کە لە نووسینەکەدا هاتوون.

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «١٦٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٤×٥ر١٦سم»و، لە چاپخانەی «الحوادث» لەبەغدا چاپکراوە، لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارە «٨٦٢»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و. نرخی دینارو نیوێکە، کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو، نووسەر هەر خۆی سەرپەرشتی‌ی لەچاپدانی کردووەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## هەولێر

دژوار

### پیشانگای فۆلکلۆری

لەرۆژی ١٢ – ١٩٨٨/٣/١٤دا، لە کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی صلاح‌الدین، دووەم پیشانگای فۆلکلۆری مامۆستا عومەر ئیبراهیم عەزیز سازکرا. ئەم پیشانگایە لەژێر رەشماڵێکی پێنج ئەستون لەسەر ئاوازی پڕ لە سۆزی حەیرانو لاوك بە سیکاردێك بەنی سوور پچڕێندرا، کچان بەجلی مۆدەو کوردەواری سەوزو سوورو بۆنی کشمیرو گلامۆر رەشبەڵەکی بۆکرا. ئەو ئافرەتانەی بەشداری مەشکە هەژاندنو دەستار هارینو نانی تیری کرد، .بە جلی کوردەواریو بۆنی قەنەفرو سۆتکەو دەست بە بازنو مۆری.. ئەوپیشانگا فۆلکلۆرییە خنجیلانەیان رازاندبۆوە.

کاك عومەر ئیبراهیمی فۆلکلۆر پەروەر یەکێکە لەو سوارچاکە زیرەکانەی مەیدانی ئێستای ئەدەبی فۆلکلۆر. کاك عومەر سەرەرای ئەوەی مامۆستای سەرەتایی‌یە، ئێستایش قوتابی بەشی دەروون ناسی‌یەو جموجۆلی فۆلکلۆریشی بەردەوامە.



لە دێرزەمانەوە میللەتەکەمان وەکو زۆربەی میللەتانی رۆژهەلاتی هەردەم خانەدانو مێوان راگرن، هەموو تەماشاکەرێك لەبەردەم رەشماڵدا بەحەزی خۆی ماستاو خواردنەوە.. یان چایە.. یا قاوە، خۆنابێ ئەویش لەیاد بکەین وەکو بەرەبەیانیانی لادێ ناسکەنانو هەرمیشکی کابانی ماڵەوە لەبەردەم رەشماڵدا بەسەر بینەران دابەش دەکرا.

ئەو بابەتە سەرەکیانەی پیشانگا بریتی بوو لە: سێ‌کوچکە، پەستەك، بەرماڵ، گۆرەوی، بەردەقانی، پشتەسەرە، سێ‌رسکانێ، شەغرە، جەنجەر، گاسن، سێ‌پێك، تەشی، گوریس، مافور، لغاو، پارزوون... هتد بەگشتی (١٤٥)کەرەسەی هەمەجۆری کۆنینە لەم پیشانگایە لەبەرچاوی بینەران دانرابوو، رێزمان بۆ ماندووبوونی ئەو خەمخۆرە فۆلکلۆرییە.

### دیداری فیکری

سەرلەبەیانی رۆژی ٩٨٨/٣/١٢ بە چاودێری بەرێز سیروان جاف سەرۆکی ئەنجوومەنی راپەراندنی ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستان بۆ ماوەی دوو رۆژ دیدارێکی فراوان دەربارەی وتەکانی سەرکردەی گەل صدام حسین سازکرا. لە سەرەتای ئەم دیدارە، فراوانە کە ژمارەیەکی زۆر لە لێپرسراوو ئەدیبو نووسەرانو رۆشنبیران ئامادە بوون ، بەرێز سیروان جاف ،تەیەکی خوێندەوە کەتێیدا دەبارەی مەبەستی سازکردنی‌ئەم دیدارە فراوانە دواکە بریتی‌یە لە دەرخستنی رۆڵی گەورەی سەرکردەی گەل صدام حسین لە گەشانەوەو پێش‌خستنی ناوچەی کوردستان. ئینجا بەرێز محمدامین محمد ئەمینداری گشتیی رۆشنبیریو لاوانو سەرۆکی لێژنەی بالا وتەیەکی خوێندەوە کە تیایدا بە شێوەیەکی فراوان دەربارەی هۆی بنەرەتی سازدانی کرد. ئینجا محمد بەدری سەرەکی یەکێتی ئەدیبو نووسەرانی کورد وتاری یەکێتی خوێندەوە.

بۆ ماوەی دوو رۆژ چەندان باسو لێکۆڵینەوەی فراوان پێشکەش کرا،

لە دانیشتنی یەکەمدا دوکتۆر خەسرۆ شاڵی سەرەکی زانکۆی صلاح‌الدین باسی ئەو دەورەی کرد کە سەرکردە صدام حسین لە پێشکەوتنی زانکۆدا بینیویەتی، هەروەها مامۆستا عبدالله عباس لە باسەکەیدا دەوری ڕووناکی سەرکردەی لە چەسپاندنی ئۆتۆنۆمی‌و نیگاو سەرنجی بەرامبەر بە کورد روون کردەوە.

لە دانیشتنی دووەمدا مامۆستا عبدالوهاب تاڵەبانی باسی سەرکردەی گەل صدام حسینی کرد. ئینجا مامۆستا شفیق جاف لە لێکۆڵینەوەکەدا باسی ئەو پێشکەوتنە بەرفراوانەی کرد کە لەژێر سێبەری سەرکردەوە لە بواری ڕۆشنبیری‌دا هاتۆتەکایەوە.

لە ۹۸۸/۳/۱۳ لە دانیشتنی یەکەمدا مامۆستا حسین ڕەشوانی باسێکی سەبارەت بەسەرکردەو باری ڕۆشنبیری کوردی ڕوون کردەوە. پاشان مامۆستا ئیلی امین باسێکی دەربارەی یاسای ئۆتۆنۆمی‌و ئاسۆی پێشکەوتنی پێشکەش کرد. هەروەها مامۆستا ساجد ئاوارە بە وتارێك بەشداری کرد دەربارەی گەشانەوەی باری ڕۆشنبیری. بەڵام ئێوارە تەرخان کرا بۆ هەردوو باسی مامۆستایان دوکتۆر عبدالستار تاهر شەریف‌و محسن بەرزنجی پاشان چەندان بڕیارو ڕاسپاردە لە دیدارەکەوە دەرچوو لە کۆتاییدا مامۆستا محمد بەدری بروسکەیەکی بە ناوی دیدارەکەو ئامادەبوان بۆ سەرکردەی خۆشەویست صدام حسین پێشکەش کرد.

ئەوەی شایانی باسە لە دانیشتنی سێیەم دوکتۆر بەدرخان سندی سەرۆك‌و دوکتۆر نافع ئاکرەیی بڕیاردەرو دانیشتنی چوارەم دوکتۆر خلیل اسماعیل سەرەك‌و بڕیاردەر مامۆستا خالد حسین بوو.

### دیداری شیعری کوردی

بە چاودێری بەڕێز بەشیر عبدالرحمن ئەتروشی ئەمینداری گشتی ئەوقاف، لەژێر دروشمی (لەسایەی عێراقی مەزندا شیعری نوێی کوردی گەشە دەکا) ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان دیداری یەکەمی شیعری نوێی کورد سازکرد.

لە بەیانی ۱۹۸۸/۳/۲۷بەڕێز مامۆستا بەشیر ئەتروشی وتارێکی خوێندەوە، ئینجا ماوە ماوە برایان ناظم دڵبەندو شەهاب عوسمان لەسەر شانۆ مامۆستایانی موحازیریان پێشکەش دەکرد.

• لە دانیشتنی یەکەمدا مامۆستا عبدالکریم فندی سەرەك‌و مامۆستا غفور صالح بڕیاردەرو مامۆستا ئومێد ئاشنا موحازر، مامۆستا ئەحمەد سالاری هونەرمەند موحازر. ناونیشانی باسەکەی مامۆستا سالار بەناونیشانی پیرەمێردی نەمرو کەلەپوور بوو

مامۆستا ئومێد ئاشنا لە. باسەکەیدا لەژێر ناونیشانی شێوە لە شیعری نوێی کوردی‌دا وتی (هەنگاوی یەکەم.. بەگشتی باسی پێویستی گەڕان‌و پشکنینی شاعیری نوێی‌کرد بەدواوی شێوەی نوێدا، هەتا بتوانێ لە ڕێگای ئەو شێوە نوێ‌و تەکنیکە هاوچەرخانەوە ببێتە خاوەنی دەنگی تایبەتی خۆی، نووسەر یاسی ئەو زمانە زیندووەی کرد کە شاعیری نوێ دەخاتە پێشەوەی کاروانەوە بە بەڵگەوە ڕوونی کردەوە کە زمان‌و تەعبیر کردنی کۆن ناتوانێت باس لە تاقیکردنەوەی نوێ بکات. هەنگاوی دووەم.. نووسەر لەم هەنگاوەدا چەند هەوڵێکی نوێ کردنەوەی لە شیعری کوردی‌دا پێشکەش کرد کە ساڵی ۱۹۱۸ - ۱۹۱۹ لەلایەن شاعیرو ڕۆشنبیری لەیاد کراو عبدالرحیم هەکاری‌یەوە لە گۆڤاری ژینی ئەستەموڵدا بڵاو کراوەتەوە، هەروەها هەوڵێکی شاعیر ڕەشید نەجیبی پێشکەش کرد کە ساڵی ۱۹۲۷ لە ڕۆژنامەی ژیان‌دا لە سلێمانی بڵاوی‌کردۆتەوە).

دوا بەدوای ئەمەو لە کۆتاییدا گوتی (مەودای سەربەستی‌و بەرفراوانی ئەوە ناگەیەنێت کە شاعیری نوێ لە شێعرە نوێیەکەیدا زیاتر ڕێگای لەبەردەمدا ئاسان بێت، بەڵکو ئەم تێپەڕین‌و هەنگاوە نوێیانە زیاتر پێویستیان بە سامانێکی ڕۆشنبیری نوێ‌و تاقیکردنەوەی درێژخایان هەیە).

• لە دانیشتنی ئێوارەدا مامۆستا ئەحمەد سالار سەرەك‌و عبدالله جندی بڕیاردەرو مامۆستا کمال غەمبار موحازیر، مامۆستا کەریم شارەزا موحازر، ئەوەی شایانی باسە مامۆستا غەمبار باسەکەی لەسەر وەچەی ئێستا بوو، باسەکەی مامۆستا شارەزا لەژێر ناونیشانی کاتێ وشە لە شیعری نوێدا دەبێ بە ڕەمز بوو تێیدا باسی گەلێ لایانی کرد بەگشتی وتی (ڕەمز وشەیەکە بۆ هێنا کردنی مانایێکی قووڵ، باشترین هۆیە بۆ خەست کردنەوەی وێنەو ڕووداو لە ژیانی ئادەمیزاددا، زۆر جار ئەوەی تاکە ڕەمزێك دەری دەبڕێ‌و مانای قووڵی لەدواوە دەوەستێ، داستانێك هەرنەوەندە چەمك‌و مانای بەهێز بەدەستەوە دەدات. ڕەمز کەلە دەربڕینی شیعری‌دا بەکارهات حیسابی وشەی بۆ دەکرێ‌و هەروەك وشە لە دایك دەبێ‌و گەشە دەکات‌و سەردەمێك دادێ لەبرەو بکەوێ‌و بمرێ ڕەمزیش بەو پێیە دروست دەبێ‌و گەشە دەکات‌و لەوانەیە ڕۆژێك دابێ بمرێ.. لەو شاعیرە کوردە هاوچەرخانەی کە سەر کەوتووانەو لە تەکنیکێکی نوێی هاوچەرخ ڕەمزیان لە شیعردا بەکار هێناوە ئەمانەن: گۆران بە جۆرێکی هاوچەرخانە ڕەمزی ئەفسانەی یۆنان‌و ڕۆمانی تێکەڵ بە ڕەمزو نموونەی ئەفسانەیی کوردی کردووەو عەلی فەتاحی دزەیی پتر چۆتە ناو دنیای ڕەمزی ئەفسانەی بێگانەو بەڵام لەدوایی‌دا شاعیرانی کوردی وەکو دیلان، کاکەی فەللاح، کامەران، بهار، بێخەو، گەڕانەوە بۆ دنیای ئەفسانەی کوردو ڕۆژهەڵات‌و

کەمتر ڕەمزی بێگانەیان بەکار هێنا. حەسیب قەرەداغی، پێنجوێنی، سەرکەوتوانە ڕەمزی تەصەووفی ئیسلامی و کەلەپووری جیهانیان بەکار هێناو صلاح شوان گەڕایەوە بۆ دنیای ئەفسانەو کەلەپووری ڕۆژهەڵات. مزووری سوودی لە کەلەپووی نەتەوایەتی کوردو ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی و جیهانی وەرگرت. پەرۆش دەسکاری ڕەمزی ئەفسانەیی دەکات و لەقالێکی نوێدا دایدەڕێژێتەوەو شاعیرە لاوەکانی وەکو قوبادی جەلیزادەو محسن قۆچان و حەمە جاف و مەهاباد قەرەداغی وشەی بەهێزو پیرۆزی وەکو قازی پێشەوا، چوار چرا، خانۆ، دمدم دەکەن بە ڕەمزی سیاسی و نەتەوایەتی کوردو لەهۆنراوەدا بەکاریان دێنن).

• دانیشتنی بەیانی ڕۆژی ٢٨ / ٣ مامۆستا کامل ژیر سەرەک و نزار محمد سعید بڕیاردەرو عبد الله عباس موحازر، محسن قۆچانی شاعیر موحازر، محمد خدر مولود موحازر کاك عبد الله لە باسەکەیدا کە لەژێر ناونیشانی شیعری کوردی سەردەم باری سەرنج و پیاچوونەوە بوو. موحازر باسەکەی بە پێشەکیەك و دوو میحوەر دابەش کرد میحوەری یەکەم دەربارەی دەوری ڕەخنە لە شیعری کوردیدا، خاوەن باس بە نموونەو بەڵگەوە دەیسەلمێنێ کە ئەگەر ڕەخنەو لێکۆڵینەوە پردی گەیاندنی چێژی شیعر بێت بە خوێنەری شیعر دۆست لە میحوەری دووەمدا باسی ناوبراو بە نەوەی سێیەم و هاتەکایەی ئەو شاعیرانەی بەرز فڕیون و خۆیان وا دەبینن لە هەموو نەوەکانی تریان تێپەڕاندوەو ڕوونی دەکاتەوە کە ڕەخنەگرتنی مەوزوعی لەم هەڵچوون و لەخۆبایی بوونە نابێت.

دوا بەدوای ئەمە سەیدا محسن قۆچان هاتە سەر خوێندنەوەی باسەکەی کە لەژێر ناونیشانی هوزان و خوپاراستن ب خاپا بوو گوتی (هوزان هونەرەکە یێ ب مرۆڤی ڤە بەستی بوو ملەتی کورد ملەتەکە هەر ئەندامەك ژی ب روح و جان هوزانڤان هەمی کوردەکی گوهەکێ موسیقی یێ پرشیان یێ هەی، لێ نوکە ئەڤ هونەرە یێ بەرتەنگ بوی و هوزان یا بویە هونەرێ دەستەکە کا بژارتە ژ جڤاکێ. ناگرێت هوزانا کەڤن ڤێ نەگەرێ پاڵدەن نویکرنێ دهوزانا کوردیدا لێ ئەڤ تشتە نەوەیەو نویکرن رویدانەکا ساخلەما نویکرنا وەرارا هوزانێیە...).

ئینجا نۆرەی باسەکەی کاك محمد خدر مەولود (هەمەدەنگی لە شیعری نوێی کوردیدا) هات. برای موحازر چەند جۆرە دەنگێکی لەنێو شیعری نوێی کوردیدا باس کرد. لەوانە تاقەدەنگ و هەمە دەنگ، هەمە دەنگیشی بەسەر ئەم سێ چەشنە دەنگ دابەش کرد. دەنگی شاعیر، دەنگی کەسی خەیاڵێکراو، دەنگی دەمامکدار. کاك محمد زیرەکانە بۆچوونی تازەو لێکدانەوەی تازەی بۆ دەنگی شاعیر دیار کرد جیا لەو بۆ



چوون و لێکدانەوەی ئێلیوت بۆ دەنگی شاعیرو پاشان زاراوەی دەنگی کەسی خەیاڵ لێکراوو دەنگی کەسی دەمامکداری شیکردەوەو جیاوازیشیانی پیشانداو نموونەی شیعرەکانیشی لە شیعری شاعیران، پەرۆش، نەوزاد، شوان، مزووری، هێنایەوەو ئیشارەتیشی بە شیعری چەند شاعیرێکی دیکەدا.

• لە دانیشتنی ئێوارەدا، مامۆستا کەریم شارەزا سەرەک و عبدالکریم دەشتی بڕیاردەر، برایان ئازاد عبدالواحدو بەهات حەسیب قەرەداغی موحازر.

لە بەیانی ڕۆژی ٣/٢٩ ئەم شاعیرە بەڕێزانە شیعریان خوێندەوە: پیربال مەحموود، خوشکە لەیلان، خالد حسین یعقوب، فەرەیدون عەبدول بەرزنجی، محمد عمر عثمان، عبدالخالق سەرسام. لە کۆتاییدا مامۆستا سعید یحی کۆتایی بەدیداری یەکەمی شیعری نوێی کوردی هێنا.

**لە یادی ووردیدا**

دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٣/٣١ لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران لە یادی خوالێخۆشبو محەمەد تۆفیق ووردیدا، کۆڕێکی فراوانی بۆ مامۆستا عومەر ئیبراهیم عەزیز سازدا. هەر بەم بۆنەیەوە مامۆستا عومەر پەیوەندی لەگەڵ چەندان مامۆستاو ئەدیب و هەڤالانی ووردی کرد.. لەئەنجامدا کۆڕەکە فراوانی بەخۆیەوە بینی، لە سەرەتادا مامۆستا زامدار بەخێرهاتنی خەڵکەکەی کردو کۆڕەکە بەم جۆرەی خوارەوە سازدرا:

+ مامۆستا عومەر ئیبراهیم عەزیز باسی ژیان و بەرهەمی ووردی ڕەحمەتی کردو هەروەها باسی چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم یادکردنەوەی بۆ ئامادەبوان ڕوون کردەوەو ڕۆڵی مامۆستا ووردی لە بوارەکانی خزمەت کردنیدا خستە





روو، لەوانە بواری کۆکردنەوەو بەچاپ گەیاندنی بەرهەمە فۆلکلۆریەکان.
هەروەها بواری رۆژنامەنووسی و شیعر، وەرگێران، چیرۆك، باس، نیشتمان پەروەری، سەرەرای رۆلی رۆشنبیری رامیاری.

+ کۆنترین و بە تەمەنترین هاوڕێی ووردی نەمر مامۆستا مستەفا نەریمان باسێکی خۆی و چەند بیرەوەرێکی لەگەل رەحمەتی لەبەردەم ئامادەبوانی خوێندەوە.

+ د. شوکریە رسول باسێکی لەسەر لایەنێکی بەرهەمەکانی ووردی پێشکەش کرد.

+ هەڤالی غەریبایەتی ووردی لەدووره وولات مامۆستا کەریم زەند لە سلێمانیەوە وەك مێوان بانگ کرابوو، بەم بۆنەیەوە چەند بیرەوەرێکی خۆی لەگەل ووردی لە زەمانی کۆماری مەهاباد وەرد دایەوە.

+ مامی دەنگ خۆش و لاوك بێژ حسین کێشکەیی بەلاوکێك بەشداری ئاهەنگی یادکردنەوەی ووردی کردو ئامادەبوانی سەرسام کرد.

+ مامۆستا کەریم شارەزا بەتێرو تەسەلی و وردکاری باسی ژیان و بنەماڵەی مامۆستا ووردی پێشکەش کرد.

+ برادەر تاریق جمباز لەجیاتی دەستەی سەرپەرشتکارانی بلاوکراوەی (زبارە) وتەیەکی خوێندەوە.

+برای دەنگ خۆش و گۆرانی بێژی لاو هاوتا ئەسعەد بەم بۆنەیەوە گۆرانیەکی چری.

- مامۆستا حەمەبۆر هاوڕێی ئێزگەی کوردی سەردەمی ووردی چەند سەربردەیەکی خۆی گێرایەوە.

- وتەی بەرنامەی لە کەلەپوورەوە نەخوێندرایەوە!!

- مامۆستا عبدالرزاق بیمار باسێکی تێرو تەسەلی لەسەر لایەنی شانۆی کوردی لەلای ووردی پێشکەش کرد.

+ بەشداریکردنێك بەحەیران لەلایەن برادەر ئەحمەد حەیران کەچی بە داخەوە هەروەك وتەکەی بەرنامەی لە کەلەپوورەوە پێشکەش نەکرا!!

+ مامۆستا مدحت بێخەوی شاعیر بە یادکردنەوەیەك بەشداری کرد.

+ کاکی شاعیر ئەحمەد تاقانە چەند بیرەوەرێکی پێ بە تایبەتی خۆی و رەحمەتی باس کرد.

ئەوەی شایانی باسە ئەم کۆرە خنجیلانە ماوەی سێ سەعاتی خایاند.

**باواجی**

لە رۆژی ٩٨٨/٢/٨ تیپی باواجی کۆیە پیشانگایەکی لە هۆلی قوتابخانەی یەکەمی کۆیە پێشکەش کرد. هونەرمەندان نەوزاد محمد علی، سەربەست عمر کریم، هەلمەت سمکۆ طە، ئەردەلان جلال بەشداری ئەم





پیشانگایەیان کرد. ئەوەی شایانی باسە هەر یەکەو لەو هونەرمەندانە لە بواری کارە هونەریەکەی خۆی وەکو خۆشنووسیو پەیکەرتاشیو نیگار کێشی سەرکەوتنێکی باشیان بەدەست هێنابوو، چونکە گۆرانکاریەکی تەواو بەسەر بەرهەمەکانیان داهاتبوو، بۆ یەکەم جاربوو کە هونەری پەیکەرتاشیو خەت بەم شێوەیە لەشاری کۆیە سەری هەڵدا ئەمەش مژدەی دوارۆژێکی پرشنگدارمانە، سوپاس بۆ کاك سامان طاهر معروف سکرتێری تیپی باواجی کۆیە کە ئەم هەواڵەی پی ڕاگەیاندین.

●

## سلێمانی

– ئازاد –

### «بەرێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەرو چەند کۆڕێکی رۆشنبیری»

بەرێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەر لە سلێمانی لە مانگی یانزدەو دوانزدەی ساڵی ١٩٨٧دا بە سازکردنی چەند کۆڕێکی رۆشنبیری هەڵسا کەوا لێرەدا لە مریانەوە دەدوێین:

• سەر لە ئێوارەی رۆژی ١٩٨٧/١١/١٢ لە هۆڵی رۆشنبیریی جەماوەر کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ برایانی شاعیر (جەمال غەمبار، بەرزان هەستیار، دڵشاد عومەر کاکی، سەلاح محەمەد) سازدرا.

سەرەتا کاك شەهاب عوسمان بە ناوی لیژنەی رۆشنبیریی بەرێوەبەرێتیی ناوبراوەوە بە خێرهاتنی ئامادەبووانی کردو، وتەیەکی خوێندەوەو لە دوو توێی وتەکەیدا ئەوەی ئاشکراکرد کە لیژنەیەك پێك هێنراوە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو بابەتە ئەدەبیو رۆشنبیریانەی بە نیازی کۆرسازدانەوە پێشکەشیان دەکرێت، بێگومان ئەمە هەنگاوێکی خراپ نییە ئەگەر ئەندامەکانی ئەو لیژنەیە لە ئاست بابەتەکاندا پسپۆر بنو دوور لە هەندێ مەسەلەی تاکە کەسیش باری سەرنجو رای خۆیان سەبارەت بابەتەکە بخەنەروو.

پاشان کاك دڵشاد عومەر کاکی دەستی بە خوێندنەوەی شیعرەکانی کرد کە بریتیبوون لە: (ئاورێك لە رابوردوو، رۆژی زەوی، لێك ترازان.

ئینجا کاك «بەرزان هەستیار» چوار شیعری خۆی خوێندەوە کە ناونیشانەکانیان ئەمانەبوون: (چەند ئاگاداریەك لە پێشوازیی هاتنتا، «ئاگر» یا نامەیەك بۆ هاورێکەم، تەقینەوە، گفتوگۆیەکی یاساغ لە سای شیعرێکدا).



برای شاعیر «جەمال غەمبار»یش بە شیعری (سەدەیەك بێ ئارام، سەراب) لەم کۆڕەدا بەشداری کردبوو کە تیایاندا هەوڵی تەوزیفکردنی ئەفسانەو چیرۆکی ئایینیو فۆلکلۆری کردبوو.

دوای ئەویش «سەلاح محەمەد»ی شاعیر شیعری: (بڕوابکە، ئەم دنیایە، سەفەرمەکە)ی خوێندەوە.

• لە رۆژی ١٩٨٧/١١/١٩دا لە لایەن هەمان بەرێوەبەرێتییەوە کۆڕێك بۆ کاك «رەفیق فایەق» سازدرا کە تیایدا دوو کورتە چیرۆکی خوێندەوە لە ژێر ئەم ناونیشانانەدا (١ – تاپۆ، ٢ – «٣×٤»).

پاش خوێندنەوەی چیرۆکەکان هەریەك لە بەرێزان (بەهات حەسیب قەرەداخی، دڵشاد مەریوانی) راوباری سەرنجی خۆیان سەبارەت چیرۆکەکان خستەروو.

• لە رۆژی هەینیی رێکەوتی ١٩٨٧/١٢/٤دا لە رووی رێزلێنانەوە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ شاعیران:



(محەمەد شێخ حسەین بەرزنجی، دیلان، کاکەی فەللاح، حەسیب قەرەداخی) سازدرا.

پاش ئەوەی کاك جەمال غەمباری شاعیر بە ناوی بەڕێوەبەرێتی‌یەوە بەخێرهاتنی لە ئامادەبووان‌کردو وتەیەکی لەمەڕ شیعرەوە خوێندەوە مامۆستا محەمەد شێخ حسەین بەرزنجی‌ی شاعیر کە بە (ع. ح. ب) ناسراوە چەند پارچە شیعرێکی نوێ‌ی خۆی خوێندەوە کە ئەمانەبوون: (١ – دەربارەی سەدەی بیست، ٢ – چەند چوارینێك، ٣ – هەڵبەستی شەوی ٩/١٠، ٤ – چوار مرۆڤ‌و چوار شووشە، ٥ – نامەیەك لە شاری جۆهانسبۆرگەوە، ٦ – نامەیەك بۆ ژنەکەم، ٧ – سکالأی دایکێك).

ئینجا مامۆستای شاعیر «محەمەد ساڵح دیلان» بەم شیعرانە بەشداری‌ی لە کۆڕەکەداکرد: (١ – ڕەگ، ٢ – ئازار شکێن).

هەروەها «کاکەی فەللاح»ی شاعیریش دوای مامۆستا «دیلان» ئەم شیعرانەی خوێندەوە: (١ – شاعیر بۆیە شیعر ئەڵێ، ٢ – دوو تەڵ سەرنج، ٣ – تۆ ئەو تۆیەیت، ٤ – بیگرێنەو خەمێ بدەرێ، ٥ – بۆشارەکەم).

چوارەم‌شاعیری ئەم ئێوارە کۆڕەیش مامۆستا «حەسیب قەرەداخی» بوو کە بە چەند پارچە شیعرێك بەشداری‌ی کردبوو لەوانە:–

(١ – مەی، ٢ – ڕێگەم‌بدە، ٣ – خەم‌و، ٤ – گلگامش‌و من، ٥ – منی تەواو، ٦ – شاعیرێك‌و کوڕێك، ٧ – ئاسۆ، ٨ – کچێك، ٩ – قولەڕەش).

پاش خوێندەوەی شیعرەکان پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ تۆژینەوەیەکی خوێندەوە کە سەبارەت جیهانی شیعری‌و شێوازی شاعیرانی ناوبراو نووسیبووی‌و بەوە کۆڕەکە کۆتایی‌هات.

• لە ڕۆژی ١٠/١٢/١٩٨٧داو بە بۆنەی تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر مردنی هونەرمەندی لاوی جوانەمەرگ «هیوا جاف»دا کۆڕێکی ماتەم سازدرا.

دوای ئەوەی هونەرمەند «خالید ڕەسوڵ» کە کۆڕەکەی بەڕێوەدەبرد سەبارەت ژیانی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو دوا ئامادەبووان ماوەی خولەکێك بۆ گیانی پاکی جوانەمەرگ بە پێوە ڕاوەستان.

بەرنامەی ئەم کۆڕە ماتەمینی‌یە بەم جۆرەبوو:–

١ – خوێندنەوەی وتەی بنەماڵەی خوالێخۆشبوو لە لایەن کاك «نزار عەزیز جاف»ی برایەوە.

٢ – وتەی نیقابەی هونەرمەندان لە لایەن هونەرمەند «یاسین بەرزنجی»یەوە

٣ – وتەی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە لایەن هونەرمەندی لاو «ئاکۆ عەزیز»ەوە.

٤ – وتەی تیپی سالار لە لایەن هونەرمەند «ئەحمەد سالار»ەوە.

٥ – وتەی تیپی پێشرەو لە لایەن هونەرمەندی لاو «یاسین قادر»ەوە.

٦ – وتەی تیپی شانۆی ئەزموونگەری لەلایەن هونەرمەندی لاوداناراەوف

٧ – وتەی بەڕێوەبەرێتی لە لایەن شاعیری لاو (ئەحمەد ڕەزا)وە.

٨ – وتەیەك لە لایەن کاك «ئومێد حسەین»ەوە.

٩ – باسێك لە لایەن هونەرمەندی لاو «شەفیق محەمەد»ەوە

کە تیایدا سەبارەت کارە شانۆیی‌یەکان‌و وتارە نووسراوە بڵاوکراوو بڵاو نەکراوەکانی هونەرمەندی خوالێخۆشبووەوە دواو لە گەڵیشیدا بە ئامێری ڤیدیۆ چەند دیمەنێکی شانۆیی‌یەکان پیشان دران کە خوالێخۆشبوو بەشداری‌ی تیایاندا کردبوو.

١٠ – وتەیەك لە لایەن هونەرمەندی لاو «نەهرۆ ساڵح»ەوە.

١١ – وتەیەك لە لایەن «ئازاد بەرزنجی»یەوە.

١٢ – وتەیەك لە لایەن کاك «بەکر حەسەن»ەوە.

١٣ – وتەیەك لە لایەن هونەرمەندی لاو «دانا عەلی سەعد»ەوە.

١٤ – وتەیەك لە لایەن کاك «کاوە جووتیار»ەوە.

١٥ – خوێندنەوەی وتاری بڵاونەکراوەی خوالێخۆشبوو کە لە ژێر ناونیشانی (دیواری چوارەم)دابوو لە لایەن هونەرمەندی لاو «دڵشاد ئەحمەد»ەوە.

– خوالێخۆشبوو لە ساڵی ١٩٦٣دا لە سلێمانی هاتە دنیاوەو هەر لەوێ قۆناغی سەرەتایی‌و ناوەندی‌ی تەواوکرد.

– لە ساڵی ١٩٨٠دا چووە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی‌و لە ساڵی١٩٨٥دا بڕوانامەی پەیمانگای ناوبراوی وەرگرت.

– لە ٨ / ١٢ / ١٩٨٥دا بە کارەساتێکی دڵتەزین کۆچی دوایی کرد.

●

# پۆستەی کاروان

ئەدرەس : هەولێر : ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت : ٢٠٨٨٢

**• سۆران حەریری •**
**ئامادەی کردووە**

وا گۆڤارەکەتان پێی ناوەتە ساڵی شەشەمو ، پەیتا پەیتا ژمارەی تازەتان دەخاتە بەردەستو ، لە هەر ژمارەیەکیشدا بابەتی هەمەچەشنەو بە سوودو بەکەڵکتان بۆ دەکاتە دیاری بەو هیوایەی کتێبخانەی کوردیی رازاوەترو دەوڵەمەندترو بوژاوەتر بێ ؛ بۆ ئەوەی ئێوەی خوشك و برای خوێنەر ، زیاتر لەگەڵ ووشەو نووسینی رەسەنی کوردیدا دۆستایەتی دروست بکەنو ، چێژ لەو بەرهەمانە وەربگرن کە لاپەرەکانی «کاروان»یان رازاندۆتەوە ، پڕ بە دڵیش ئارەزووی ئەوە دەکەین کە لێمان رازی بن و ، هەرگیز بیر لەوە نەکەنەوە کە ئێمە بە دەستی ئەنقەست رێگە لەبەردەم ئەو بەرهەمانەی ئێوەدا تەسك دەکەینەوەو ، دەیانخەینە پۆستەی کاروانەوە . بەڵکو بەهەموو دڵسۆزیو خۆشەویستییەکەوە بەو خوشك و برا بەرێزانەمان دەڵێین کە بەرهەمەکانیان وەبەر گۆشەی پۆستە دەکەون ؛ کاروان گۆڤاری ئەوانەو ، هەر پشتگیریی ئەوانو براو خوشکە نووسەرەکانی دیکەیشە کاروانی دەوڵەمەندو پشت ئەستوورو تەمەن درێژکردووە ، بەڵام گەر بەرهەمێك شێوە لاوازییەکی بەسیاوە دیاربێ ، وەیا لەگەڵ رێبازی گۆڤارەکەدا نەگونجێ و ، دوور بێ لە زۆر مەرجی زانستی کە لە بواری بڵاوکردنەوەدا پەیرەو دەکرێن ، ئەوە وابزانم مایەی گلەیی و دڵگیربوون نی یە .

ئێمە دووبارە بەهەموو خوێنەرێکی دڵسۆزو قەڵەم بە برشتی کوردی رادەگەیێنینەوەو دەڵێین : «کاروان» بەهەر «١٦٠» لاپەرەکەیەوە ، بە بەشە کوردیو عەرەبییەکەوە ، بۆ خزمەتکردنی ئەدەبو رۆشنبیریو مێژوو و کەلەپووری میللەتەکەمانە ، هەموو کاتێکیش پێشوازی لەو بەرهەمانە دەکەین کە دەگەنە گۆڤارەکەمانو ، بەوە رازی دەبن مامڵەت لەگەڵ ئێمەدا بکەن ، لەوەش دڵنیاین کە ئەو خوشك و برایانەی ئیمرۆ لەگۆشەی پۆستەدا وەڵامیان دەدەینەوە ، بۆ بەیانی بەتواناتر دەبن و ، گورتر دێنە مەیدانو ، بەرهەمی دەوڵەمەندتر پێشکەش بە رۆشنبیرانی نەتەوەکەیان دەکەن .

**ئێستاش فەرموون ئێوەو بەشێکی تری وەڵامی ئەو نامانەی بوونەتە میوانی «پۆستەی کاروان»ی ئەم ژمارەیەمان :**

**• بۆ ئەو برا ئازیزانەی ئەم چیرۆکانەیان بۆ ناردووین : «دوو رواچی‌یەکە ، رزگاربوون ، بەڵگە ناتەواوەکان ، دوو دڵداری ناکام ، حەریق» .**

لەناخی دڵمانەوە سوپاستان دەکەین بۆ ئەو دیارییانەتان کە پێشکەشی کاروانتان کردوون ، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەم چیرۆکانەتان هێشتا بە تەواوی پێ نەگەییونو ، لەکاتی نووسینیاندا زۆر لایەنی هونەریو تەکنیکی کە دەبنە بنەمایەکی سەرەکی بۆ سەرکەوتنو توندوتۆڵی هەر چیرۆکێك فەرامۆش کراون ، تەنانەت هەندێکیان لەرووی زمانو دارشتنیشەوە لاوازبوون ، بەهەرحاڵ دەبێ ببوورن ، هیواداریین لەمەودوا بەرهەمی باشترمان بۆ بنێرن . .

**• بۆ خوشکە «چ - یاسین» لەشاری سلێمانییەوە . .**

خوشکێ گیان ، شیعرێکت بۆ ناردووین بەناوی «هەنگاو بنێ» ، لەوەش دەچێ کە یەکەمین جارە بەشداری لە گۆڤارەکەماندا دەکەیت ،

بەلام دەبێ ببووری کە تەنیا ئەم چەند دێڕەی خوارەوەی شیاوی بلاوکردنەوەبوون ، خۆزگە شیعری چاکترت بۆ دەناردین‌و پێشەکیش سوپاست دەکەین .

**• هەنگاو بنێ •**

**ئەگەر هەرچی ڤینی رەشە ڕێگای ئاوی ڤیان بگرن**
**من دەبمە رووباری ڤین خۆر .**
**ئەگەر هەرچی هەوا هەیە**
**لە دڵداران قەدەغەی کەن**
**دەبمە ئۆکسجینی ژیان**
**ئەگەر هەرچی گلێنەیە**
**بە پارەو قوڕ سواغی بدەن**
**دەبمە بینایی بۆ هەمووان**

**• بۆ ئەو خوشکەی چیرۆکی «خاتوو کیسەڵ‌و ماڵی مام وورچی» بۆ ناردووین . .**

خوشکی ئازیز ، بەشداریکردنت لە دەوڵەمەند کردنی گۆڤاری کاروان مایەی شانازی پێوەکردنە ، بەتایبەتی کە بە چیرۆکێکی منداڵانەوە بەسەرت کردووینەتەوە ، بەڵام بەداخەوە بەچاکی لە وەگێڕانەکەی‌دا سەرنەکەوتوویت ، بۆیە دەبێ بمان‌بەخشی‌و ، دووبارە سوپاست دەکەین‌و هەبژیت . .

**• بۆ کاک «س . م . ح» لەگەڕەکی ئەزمڕی شاری سلێمانی‌یەوە . .**

کاکی برا سوپاست دەکەین بۆ ئەو هاوکاری‌یە زۆرو بەربلاوەی لەگەڵ گۆڤارەکەمانی‌دا دەکەیت ، بەلام وەکو بۆمان دەردەکەوێ لەنووسیندا پەلە دەکەی‌و ، دەستیش بۆ هەموو شێوەکانی نووسین درێژ دەکەی ، وەکو «شیعرو ، چیرۆک‌و ، فۆلکلۆرو ، نووسین‌و . . . . تاد» ئەڵبەتە ئەمەیش ئەنجامەکەی سەلبی دەبێ ، هیوادارین سوود لەم سەرنجانەمان وەربگری .
بۆ ئەم چیرۆکەیش کە لەژێر ناوی «تارمایی کۆچێك»ەوە ، بۆت ناردووین ، هێشتا ماوەیەتی بێ بە چیرۆکێکی سەرکەوتوو ، بۆیە دەبێ ببووری‌و ، دووبارە سوپاست دەکەین .

**• بۆ ئەم برا خۆشەویستانەمان کە بە شیعرو پەخشانە شیعر گۆڤارەکەمانیان بەسەر کردۆتەوە . .**

«ستار مەخمووری ، عبدالمجید شکری قاسم ، عدنان عثمان علي . اسماعیل قەسری ، احمد حمد عزیز ، أحمد محمد رسول ، جاسم عاڵلایی ، غەفوور شێواو ، محسن طه محمد ، شوان زامدار ، شوان جمال ، کامەران أبو زید محمدأمین ، کەریم مەمی خەلانی ، محسن شوانی ، شکر شەمامکی ، هاوری کەرکووکی ، ستار احمد عبدالرحمان . هۆگر بیتوێنی ، حمید حریری ، عبد الله عزیز مەلا ، ڕێبوار عبدالکریم مارف ، شیروان جمال سەرچناری ، ئامانج مستەفا ، کمال سلێمان ، ابراهیم أبابکر یاسین ، یوسف عبدالحمید أمین ، ستار ئاسنگەر ، عبدالقادر هەمزە حمد ، صباح شریف قەپلانی ، اسماعیل محمد سعید» .
برا ئازیزەکانم ، سوپاستان دەکەین بۆ ئەو دڵسۆزی‌و هاریکاری‌یەتان ، لێشتانی ناشارینەوەو دەڵێین ئێوە چەند هاوکاری لەگەڵ کارواندا بکەن هێندە زیاتر رەوت‌و کۆششی ئێمەو گۆڤارەکە بەرەو پێشەوەتر دەبەن ، هەموو کاتێکیش ئێمە شانازی بە دۆستایەتی‌و بەردەوامی‌ی بەشداری ئێوە دەکەین ، بەلام دەبێ ئێوەش لەوە بە ئاگابن کە شیعر تەنها قسە ریزکردن نی‌یە ، تەنها کاغەز رەش‌کردنەوە نی‌یە ، شیعر ئیلهامە ، شارەزایی‌یە ، رۆشنبیری‌یەکی قوڵ‌و فراوانە ، بۆیە دەبێ لێمان دڵگیر نەبن کە دەڵێین خۆزگە پێشەکی بەچاکی لە هونەری شیعرو شیعر نووسینەوەدا حاڵی دەبوون ، ئەوسا ئەم جیهانە بەرفراوانەتان هەڵ‌دەبژارد ، دەبێ بشبوورن کە شیعرەکانتان شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون‌و ، دووبارە سوپاستان دەکەین . .

**بۆ کاك «أ . م . رسول» لە هەولێرەوە . .**

کاکەگیان ئەو شیعرەی لەژێر ناونیشانی «خەزان»ەوە بۆت ناردووین ، هەروەها شیعری «شەهیدان» ، زیاتر لە قسەی ئاسایی دەکەن‌و ، مەرجی شیعری سەرکەوتوویان تێدا نی‌یە ، ببوورە کە شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون . .

• بۆ ئەو برا بەرێزانەی ئەم شیعرانەی خوارەوەیان بۆ ناردووین :

«دڵو شەو ، سێ بانگەواز بۆ لۆرکا ، هەڵوێستی شیعرێك ، سێ پارچە شیعر – تریفەی مانگ گڵۆپیانە ، شیعرێکی لەدایك نەبوو ، کیشوەرێکی خنجیلانە ، تروسکەیەك ، شارە خنجیلانەکەم‌و دوا نەگبەتی ، دەردەدار ، عەشقێکی پیرۆز» .

برا شیرینەکانم لە دڵەوە سوپاستان دەکەم بۆ دڵسۆزی‌و وەفاداریتان ، بەڵام دەبێ لێمان دڵگیر نەبن کە دەڵێین ببوورن شیعرەکانتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون ، خۆزگە هەوڵی زیاترتان دەدا ، بۆ ئەوەی بەرهەمی سەرکەوتووترتان بۆ بناردینایە .

**• بۆ کاك «ك . م . عبدالرحمن» لە شاری سلێمانی‌یەوە**

کاکی برا ، ئەو شیعرەی بەناوی «گریان»ەوەیە ، دیارە بۆ ڕۆژنامەی هاوکاریشت ناردووە ، ئەڵبەتە ئەم‌جۆرە ڕەفتارەیش لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا بە کارێکی پەسند لەقەڵەم نادرێ ، هیواداریین لە داهاتوودا تا لە بڵاونەکردنەوەی بەرهەمەکەت دڵنیا نەبی بۆ لایەکی دیکەی نەنێری .

**• بۆ خوشکە «م . أ . سەرگەڕی» لە شاری هەولێرەوە . .**

خوشکی هێژا ، ئەو شیعرەی بەناوی «پەڵەهەور»ەوە ، بۆت ناردووین لەڕووی هونەری شیعرەوە زۆر سادەو ساکارە ، جگە لەوەی کە لەزۆر شوێندا کێش‌و مۆسیقا لەدەست دەداو ، تام‌و چێژی شیعری تێدا نابینرێ ، هیواداریین دڵگران نەبی‌و ، شیعری سەرکەوتوومان بۆ بنێری . .

**• بۆ کاك «هێمن کەرکووکی» . . .**

برای باش ، خۆزگە جارێکی دیکە بەووردی بە هەردوو ژمارەی «١٤و ١٥»ی گۆڤارەکەماندا دەچوویتەوەو ، ئەو بانگەوازەت دەخوێندەوە کە بڵاومان کردووتەوە ، ئەوە دڵنیام کە هەرگیز گلەیی ئەوەمان لێ ناکەیت کە بۆ هەندێ نامە وەپشت گوێ دەخەین ، بەتایبەتی گەر ناوو ناونیشانی تەواویان . . بەسەرەوە نەبێ . . ئەمەیان بەلایەك ، بەلایەکی ترەوە ئەو شیعرەی بۆت ناردووین لاوازەو هێشتا بەتەواری پێی نەگرتووە ، بۆیە دەبێ ببووری کە بۆ بڵاوکردنەوە نەشیاو نەبووە میوانی لاپەرەکانی گۆڤارەکەمان . .

**بۆ کاك «هەمزە بێبەش» . . .**

کاکی برا ، پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ ئەو شیعرەی بەناوی «مەلی فڕیو»ەوە بۆت ناردووین ، بەڵام دەبێ ببووری کە تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو ، ئاگاداریشت دەکەینەوە کە ئەگەر لەمەودوا ناوو ناونیشانی خۆت نەنووسی ئەوە هەر زوو نامەکەت بەلاوە دەنێین . . ئەمەیش کۆپلەی شیعرەکەتە . .

**• مەلی فڕیو •**
**دیمەن زەردە**
**چاوی من‌و گشت هەژاران**
**لەڕێگەی شەو ،**
**شەوێکی پڕ لەناسۆرو ژان‌و دەردە**
**هێدی هێدی ڕێ‌دەپێوم**
**دەڕۆمەوە بەرەو ماڵێ ،**
**بەرەو خەیاڵ هۆنینەوە .**

• •

**بۆ خوشکە «ل . س» لەگەڕەکی تەیراوەی هەولێرەوە . .**

خوشکی ئازیز ، ئەو چیرۆکەی بەناوی «سۆبە»وە بۆت ناردووین ، لەڕووی هونەری داڕشتنی چیرۆکەوە لاوازەو ، ماویەتی بێ بە چیرۆك ، بەهەرحاڵ ببوورە لە بڵاونەکردنەوەی ، هیواداریین دوای ئەوەی بەچاکی گەرم دەبیتەوە ئەمجارەیان چیرۆکێکی ڤێنکمان بۆ بنێری‌و ، دووبارە هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازین .

**• بۆ ئەم برا بەڕێزانەی خوارەوە :**
**«عثمان حسین جمعە ، سعید خضر ، ئاوات حسن ، عثمان ئەشکەنجەیی» .**

براینە ، ئەو بەرهەمانەی بۆتان ناردووین بە ئاشکرا لاوازی‌و ناکامڵییان پێوە دیارەو ، هێشتا زۆریان ماوە ببن بە بابەتی چاك‌و بڵاوبکرێنەوە ، بەهەرحاڵ ڕۆژگارێکی دوورو درێژتان لەپێشە ، گەر هەوڵ‌و کۆششی زیاتر بدەن ، دەتوانن لە داهاتوودا بێنە مەیدانی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانتان‌و سوود بە ئەدەب‌و ڕۆشنبیریی کوردی

بگەیەنن‌و ، ئێمەیش سوپاستان دەکەین .

**• بۆ ئەو نووسەرەی ئەم شیعرەی بۆ ناردووین :**
**«پشووی دەروون لە شەوێك‌دا» .**

پێشەکی سوپاس بۆ ئەو نووسەرە ئازیزە کە نازانین کورە یا کچە ، لەهەمان‌کاتدا پێی‌ ڕادەگەیەنین کە شیعرەکەی شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، ئەمە جگە لەوەی یەکێ لەو مەرجانەی پەیڕەو نەکردووە کە بۆ بڵاوکردنەوە دانراوە ئەویش نووسینی ناوو ناونیشانی تەواوە ! بەڵکو تەنها «هەڵوان»ێکی بەسەرەوەیەو بەس . هیوادارین لەمەودوا ئاگاداری ئەم لایەنەش بێت .

**• بۆ کاکە ئاشتی عادل فائق لە کەرکووکەوە . .**

سوپاست دەکەین بۆ ئەو بابەتەی بەزمانی عەرەبی بۆت ناردووین ، بەڵام دەبێ بمان بووری کە لەگەڵ ڕێبازی گۆڤارەکەماندا نەدەگونجا ، بۆیە شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، هیوادارین بەرهەمی باشترمان بۆ بنێری . .

**• بۆ کاك «ق . أ . رسول» لەشاری سلێمانی‌یەوە .**

برای باش ، باوەڕت‌بێ ئێمە لە دڵەوە حەز دەکەین هەموو بەرهەمێکی باش‌و سەرکەوتوو بەسەر لاپەڕەکانی کاروانەوە بدرەوشێنەوە ، بەڵام داخان ناچێ کە ئەو شیعرەی بەڕێزتان بۆی ناردووین شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوو ، بۆیە دەبێ بیبووری . .

**• بۆ کاك «ع . ق . طه» لە هەولێرەوە . .**

کاکەگیان ، ئەو هۆنراوەی کە بە ناوی «هۆنراوەیەکی بڵاونەکراوەی — عەلی عاشق»ەوە بۆت ناردووین ، بەچاکی نەخراوەتە سەر ڕێنووسی نوێی زمانی کوردی ، هەربۆیەش هەندێ هەڵەی تی‌کەوتووە ، جگە لەوەی کە بەم شێوە سادەو ساکاری‌یەی ئێستای‌و ، بەبێ لێکۆڵینەوەو ساغ‌کردنەوەیەکی تێرو تەسەل شیاوی بڵاوکردنەوە نی‌یە . بمان‌بەخشەو چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین .

**• بۆ خوشکە «ن . م . صالح» لە گەڕەکی «شیخ محي الدين» لە شاری سلێمانی‌یەوە .**

سوپاسی ئەم خوشکە ئازیزەمان دەکەین کە دوو پارچە شیعری بۆ ناردووین ؛ بەڵام بەداخەوە هەردوو شیعرەکەی پێشتر لە ڕۆژنامەیەکی کوردی‌دا بڵاوکردوونەتەوە ، بۆیە شیاوی ئەوە نەبوون جارێکی دیکە بڵاویان بکەینەوە ، خۆزگە شیعری تری بۆ دەناردین ، دووبارە سوپاسی دەکەین . .

**• کەکە «م . م . ئەڵوەن» لە شاری هەولێرەوە . .**

ئەو شیعرەی بەناوی «ساتەکانی سەمای ئەوین»ەوە بۆت ناردووین هێشتا بەچاکی پێ نەگەییوەو ، نەبۆتە شیعرێکی تەواو کە شیاوی بڵاوکردنەوە بێت . بۆیە دەبێ بمان‌بووری کە نەشیا بو بڵاوکردنەوە لە گۆڤارەکەماندا .

**• کاك «ع . حسێن حسێن» لە قەزای ڕانیەوە ، شیعرێکی بەناوی «گڕی ئەوین»ەوە بۆ ناردووین .**

ئێمەیش بەم برا ئازیزەمان دەڵێین بمان‌بەخشە کە بۆمان نەکرا سەرتاپای شیعرەکە بڵاوبکەینەوە ، چونکە لەزۆر شوێندا لاوازی‌و بێ‌هێزی پێوە دیارە ، بۆیە تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەمان لێ هەڵبژارد ، هیواداین شیعری چاکترمان بۆ بنێری .

**• گڕی ئەوین •**
**ئەی پەرستگای عیشق‌و ئەوین**
**بۆ بێ‌دەنگی !؟!**
**بێ‌دەنگی‌ی تۆ ،**
**دەنگی گڕی ئەهریمەنە ،**
**قەڵای سەختی ئەویندارییم**
**دەڕوخێنێ . .**
**بۆ بێ‌دەنگی . . . ؟ !**

* * *

